# نهێنییەکانی شەڕی دووەمی جیهانی

## لە ژیاننامەی بەناوبانگترین سەرکردەی ئەڵمانیدا

سوپاسالار گۆنسەر بلومنتریت

وەرگێڕانی: یاسین هێژا

# نهێنیەکانی
# شەڕی دووەمی جیهانی

## لە ژیاننامەی بەناوبانگترین سەرکردەی ئەڵمانیدا
## مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد سەرکردەی مرۆڤایەتی

دانانی
سوپاسالار کۆنسەر بلومنتریت
سەرۆکی دەستەی ئەرکانی شەڕی ڕۆنشتد

و/ یاسین هێژا

- ناوی کتێب : نهێنیەکانی شەڕی دووەمی جیهانی
- ناوی نووسەر : سوپاسالار کۆنسەر بلومنتریت
- وەرگێڕانی ـ یاسین مێژا
- بەرگ : ئاگرین باڵەکی
- ژمارەی سپاردن (١٣٨٧ ) ساڵی ٢٠٠٧
- نرخ: دینار
- چاپ : چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەلات
- ناوەندی بلاوکردنەوە : هەولێر کتێبخانەی ئاوێر



Email: h.daneshfar@yahoo.com
Mob: 0750 449 3561
هەولێر ـ شەقامی ئاراس ـ کۆلانی سینەما سیروان

**سیاسەت هەموو جۆرە خیانەتێك وەبەردەهێنێت، بەڵام هەرگیز خیانەتكاران پایەدار ناكات**

"رۆنشتد"

سەرکردە سەربازیەکان زیاتر لەوەی بە خەیاڵماندا دێت شایستەی لاواندنەوەن، جیهان هەمووی لە پێشبڕکێ دایە بۆئەوەی حوکم لەسەر کارەکانیان بدەن، بێ ئەوەی گوێ لە قسەی ئەوانیش بگرن، رۆژنامەکانیش زۆر بەکەمی باسیان دەکەن، رەنگە لە هەزاران کەس کە حوکمیان دەکەن، کەسێك نەبێ سادەترین مانای سەرکردایەتی بزانێت، هەتاکو هی بچووکترین یەکەش.

فریدریکی گەورە

پاشای رووسیا

## بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

### پێشەکی وەرگێڕی عەرەبی

ئەو کتێبە لەساڵی ١٩٥٢ بەزمانی ئەڵمانی چاپ و بڵاوکرایەوە، هەر بە خێراییش بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکان وەرگێڕدرا، ئەمەش لەلایەکەوە لەبەر گرنگی زانیاریەکانی بوو، لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر بەناوبانگی دانەرەکە و ئەوەی لەجیاتیشی نووسیوەتەوە بوو.

ئێمەش ئەو کتێبەمان لەزمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی بەئاگاداربوون و زانینی بۆچوون و دیدی ئەڵمانەکان، لەگرنگترین رووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانیدا، هەروەها دوای ئەوەی لە دید و بۆچوونی هاوپەیمانانیش ئاگاداربووین. بەبەراوردکردنی دیدو بۆچوونی هەردوو لایەن دەتوانین بەئاشکرا دەرەنجامی راستییەکانی شەڕی دووەمی جیهانی روون بکەینەوە.

هەروەها ویستمان لە وەرگێڕانەکە، لە شێوازی نوێی لێکۆڵینەوەی مێژووی جەنگ بگەین کەخۆی لەژیاننامەی سەرکردە بەرچاو و دیارەکان دەبینێتەوە، دانەری ئەو کتێبە باس لەوە دەکات کە گرنگترین شت مێشکی سەربازەکان و رۆشنبیرانی سڤیلی جەنجاڵ کردبێ نهێنییەکانی جەنگی دووەمی جیهانییە. هەروەها بەڕاشکاوی و بەروونی (وەك شایەدحاڵێك) وەڵامی ئەو پرسیارو گرفتانەی هەڵگیرسانی جەنگ و لەکاتی جەنگیشدا سەریانهەڵدابوو، دەداتەوە، کە رۆشنبیران

لەشیکردنەوەیان دۆشدامابوون و نەگەیشتبوونە هیچ ئەنجامێك. راستی نیازی ئاشتی و شەڕی هیتلەر چی بوو؟ چۆن شەڕ هەڵگیرسا؟ راستینەی سوپای ئەڵمانیا لەسەردەمی هیتلەر چی بوو؟ هێزی پیادەی هیتلەر لەسەرەتای شەڕ چۆن چۆنی دەجەنگا؟ راستی پەیوەندی ئەڵمانیا-رووسیا لەپێش هێرشی ئەڵمانیا بۆسەر رووسیا چۆن بوو؟ بۆچی لەکاتی سەرقاڵبوونی ئەڵمانیا بەشەڕی پۆڵەندا، هاوپەیمانان شەڕیان لە دژی رانەگەیاند؟ کاریگەری بانگەشەکانی ئەڵمانیا لەپێش و لەکاتی جەنگدا چۆن بوو؟ سوپای ئەڵمانیا چۆن سوودیان لەئەزموونی شەڕی پۆڵەندا وەرگرت بۆ راستکردنەوەی هەڵەکانیان؟ راستینەی هەوڵەکانی ئاشتی هیتلەر لەکاتی جەنگدا چ بوو؟ بۆچی ئەڵمانییەکان لێگەڕان بەریتانییەکان لە (دانکرك) بەسەلامەتی بکشێنەوە؟ چۆن شەڕی هەورە تریشقە پراکتیك کرا؟ بەرەو پێش چوونی ئەڵمانییەکان لە فەڕەنسا چۆن بوو؟ هۆکارەکانی رمانی فەڕەنسا چی بوون؟ بۆچی ئەڵمانییەکان لەو کاتەی لەلووتکەی سەرکەوتنا بوون هێرشیان نەبردە سەر بەریتانیا لەناو خاکی خۆیان؟ راستینەی بارودۆخی رووسیا پێش هێرشی ئەڵمانیا چۆن بوو؟ راستی دانانی هێزی ئەڵمانی لەبەرەی رۆژئاوا پێش پرۆسەی دابەزاندن (انزال) چۆن بوو؟ دیکتاتۆر چۆن کۆنترۆڵی کردبووە سەر هێزو سەرکردەکان؟ کاریگەری کەمی سووتەمەنی لەسەر ئاکامی شەڕ چی بوو؟، راستینەی لێهاتوویی ئاژانسی ئیستخباراتی ئەڵمانیا چۆن بوو؟ ئەڵمانیا لەدوا ساتەکانی شەڕدا چۆن بەرگری دەکرد؟ راستینەی رووبەڕووبوونەوەی ئەڵمانەکان لە (ئەردین) چی بوو؟ سیفاتە کەسێتییەکانی هیتلەر چی بوون؟ کاریگەری لایەنگیری (رەگەزپەرستی)

لەبەرەو پێشچوونی سەرکردەکانی ئەڵمانی چۆن بوو؟ راستینەی ڕۆنشتد،سەرکردەی مرۆڤایەتی چی بوو؟ .....

وەڵامی ئەو هەموو پرسیارانە لەم کتێبەدا دەخوێنیتەوە، (ئەوەی باسمان کرد بەشێکە لەوەی دەیخوێنیتەوە). ئەوەشیان شایەدحاڵێك بۆت دەگێڕێتەوە کە دەزانێ چی دەڵێ و قسەکانیشی پێش گوتنیان بەباشی لێکدەداتەوە، هەروەها لەگۆترەو کوێرانە قسە ناکات. تاوەکو خۆشیی خوێندنەوەی ئەم کتێبەت لەدەست نەدەین، ئەوەندە پێویست ناکات زیادەدادڕی بکەین دەربارەی ناوەڕۆکی ئەو کتێبەی کە بەزووترین کات دەیخوێنیتەوە، با هەمووی بۆ خوێنەر بەجێبهێڵین، ئەوەی کردمان هەموو چاکەکەی لە پەروەردگارەوەیە، بۆیە سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکەین.

لیوا روکن

مەحموود شیت خەتاب

## ـــــــ پێشەکی چاپی دووەم

چاپی یەکەمی ئەو کتێبە بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر لەبازاڕاکان نەما، چونکە ئەوە یەکەمین کتێب بوو دەربارەی شەڕی دووەمی جیهانی، کە بەدیدو بۆچوونی ئەڵمانیەکان خۆیان نووسراوەتەوە، لەڕێگەی ژیانی مەزنترین سەرکردەی ئەڵمانی دا کەئەویش (مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد)ە. بڵاوکردنەوەی کتێبەکە لەساڵی ١٩٦٠ بوو، واتە لە لووتکەی لادانی عەبدولکەریم قاسم بوو لە ڕێبازەکەی، قاسم خۆی بەتاکە سەرکردە دادەنا، خەڵکیش راستینەی ئەویان لەسەرکردایەتی دەناسی، بۆیە قاسم وا بانگەشەی دەکرد کە کتێبەکە هەرچەند لایەنی باشی سەرکردەی دڵسۆزی تێدایە، بەڵام لەکەسایەتی ئەو دەدات و گومان دەخاتە سەر سەرکردایەتییەکەی کە خۆی بانگەشەی بۆدەکرد. ڕۆنشتد حزبی نەبوو، خۆی یەکلاکردبۆوە بۆکاروباری سەربازی، کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو، راستییەکانی دەگوت، دید و بۆچوونی خۆی بەڕاشکاوی بۆ هەموو لایەك رادەگەیاند، هەتاکو لای هیتلەریش. ڕۆنشتد سیفاتی مرۆڤایەتی بەرزی هەبوو کە زەحمەت لەسەرکردە سەربازیەکانی تری ئەڵمان و رووس و بەریتانی و ئەمەریکایی هەبووبێت. ڕەنگە هەر ئەو سیفاتانەش بووبێتە هۆی ئەوەی حەز بە وەرگێڕانی ئەو کتێبە بکەم. کاتێك رووسەکان لەستالینگراد و ناوچەکانی دیکەی بەرەی رووسیادا هەندێك سەرکردەی ئەڵمانیایان بەدیل گرت، بەشێك لەو سەرکردانە کۆمەڵەی (ئەڵمانیای ئازاد) یان لە رووسیا بێگهێنا و پڕوپاگەندەیان لەدژی ئەڵمانیا بۆ رووسەکان دەکرد. هەرچەندە ڕۆنشتد نە لەگەڵ هیتلەر و نە لەگەڵ

ڕژێمەکەشی هێندە کۆك نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئیدانەی خیانەتی ئەو سەرکردانەی کرد لەخاك و نیشتمانی دایکیان، بەدیدو بۆچوونی ڕۆنشتد کارەکانی ئەو خیانەتکارانە تەنها ئەوە نەبوو کەنهێنی سەربازی ئاشکرا دەکەن، بەڵکو لەوەش زیاتر خیانەتێك بوو دەبووە هۆی گیان لەدەستدانی زۆرێك لە سەربازە ئەڵمانیەکان لەبەرەی ڕۆژهەڵات. بۆیە جارێك کە ڕۆنشتد لەبارەگای سەرکردایەتی ڕۆژئاوا بوو، گوێی لە پڕوپاگەندەی کۆمەڵەی (ئەڵمانیای ئازاد) بوو، یەکسەر گوتی: (سیاسەت هەموو جۆرە خیانەتێك وەبەردەهێنێت، بەڵام هەرگیز خیانەتکاران پایەدار ناکات) ئەو رستەیە کەمانایەکی قووڵ و بەرزی هەیە، سەرخۆشی کردم و هانیدام ئەو کتێبە وەربگێڕمە سەر زمانی عەرەبی و بیخەمە بەردەستی خوێنەران. لە وەرگێڕانی ئەو کتێبەدا عەمید روکن مونیر فەهمی ئەلجەڕاح و مامۆستا عەبولڕەحمان مەلاح بە سوپاسەوە هاوکاریان کردم، بەمەش وەرگێڕانەکەم لەبێ خەوشی نزیك بووەوە. ئەگەر هاوکاریەکانی ئەوان نەبووایە ئەو کتێبە ئاوا و بەو شێوازە وردەو بەدیقەت نەدەکەوتە بازاڕەوە، سوپاسی بێ پایانم بۆ پەروەردگار کە یارمەتی دام لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە.

لیوا روکن

مەحموود شیت خەتاب

## پێشەکی

**بەپێنووسی مارشاڵ فۆن رۆنشتد**

لەو سێ ساڵەی کە لە ئینگلتەرا زیندانی بووم زۆر کەس هانیان دەدام چیرۆکی ژیانم بنووسمەوە هەمیشە ئەوەم رەتدەکردەوە،چونکە دەترسام خەڵك بەهەڵە واتێبگات کە من دەمەوێ خۆم بێتاوان پیشان بدەم یاخود رووداوەکان لەبەرژەوەندی خۆم شیبکەمەوە. هەروەها من نامەوێ بەرگێکی دیکە بخەمە بازاڕەوە، چونکە ئەوەندە شوێنە نەماوە بۆ کتێبێکی دیکە. لێرەشدا پێویستە ئەوەش بڵێم کەمن هەرگیز هیچ شتێکی ژیانی خۆم نەنووسیوەتەوە، هەروەها هیچ بەڵگەنامە و شتی وام کۆنەکردۆتەوە. ئیستاش بۆ یەکەمجار تکاو داوای کۆمپانیای (ئۆدهەم) بۆ چاپ کردن رازیبووم بەلەچاپدانی ئەو کتێبە کە دانەرەکەی ئەفسەری روکنی حەرکات لە بارەگای من بوو بۆماوەی چەند ساڵێك کەرابوورد، دواتریش بووە سەرۆکی دەستەی ئەرکانی لای من و هەمیشە وەك و سەرباز و هاوڕێیەك لەنزیکمەوە بوو، من هاوڕام لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە لە نێو ئەم کتێبەدا هاتووە، بەڵام بێگومان باسی سیفاتی کەسایەتی خۆم بۆ ئەو لێگەڕاوە تاوەکو چۆنی بوێ ئاوا بکات. لێرەدا حەز دەکەم ئەوەبڵێم کە لەکاتی زیندانیمدا لە ئینگلتەرا لەلایەن بەریتانی و ئەمەریکییەکان مامەڵەیەکی گونجاوم لەگەڵ کراوە. هەروەها زۆر لە ئینگلتەرایی و ئەمەریکی و نەتەوەکانی دیکە رێزی منیان گرتووە و سەرپەرشتییان کردوومە لەوکات، کە ناتوانم لێرەدا پاداشتیان نەدەمەوە و سوپاسیان نەکەم. دواڕۆژ وا پێویست دەکات لەسەر نەتەوەکان

ئاراستەیەکی هاوبەش بۆ یەکگرتنی ئامانجەکان هەڵبژێرن. خۆزگە خوای گەورە پاڵپشتی مرۆڤایەتی دەکات لە هەڵبژاردنی کارە دروستەکان. بەڕاستی ئێمە هەمووومان تاوان و گوناهمان ئەنجام داوە، کەوا پێویست دەکات، بەڵکو دەبێت لەبیر خۆمانی ببەینەوە. لەبەر ئەو هۆیە ئەوەی لەو کتێبەدایە یەکانگیرە لەگەڵ ئارەزووەکانی من و دانەریش. ئەو کتێبە بە هیچ شێوەیەك شوورەیی و نەنگی بۆ هیچ نەتەوە و کەسێکی تایبەتی تێدانییە، پێویستە شارەزایی و خیبرەی ژیان فێرمان بکات کەوا قەزاو قەدەر لە هەوڵی مرۆڤ بەهێزترە.

فۆن رۆنشتد

## پێشەکی دانەر

**بەپێنووسی لیوا کونسەر بلومینتریت**

زۆر خۆشحاڵ بووم کاتێ مارشاڵ فۆن رۆنشتد رێگای دام دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆی وەکو مرۆڤێك و سەربازێکی ئەڵمانیا بنووسم، هەروەها ئەو کارانەی کە کردوویەتی وەك سەرکردەیەکی هەرەمەزنی ئەڵمانیایی. لەگەڵ رۆنشتد وەکو دوو هاورێی خۆشەویست بەیەکەوە ژیاین و بەگیانی سەربازی و راستگۆیی لەخۆشی و ناخۆشی، لەرۆژانی ئاسایی و توندوتیژیی بەیەکەوە بووین. جاری یەکەم لەساڵی ١٩٢٦ بوو کە مارشاڵ فۆن رۆنشتدم ناسی، ئەوکات فەرماندەی کەتیبەی پیادەی ١٨ ی هەڵوەشاوە بوو، لەشاری بادربۆرن (Baderborn )، بەڵام لەساڵی ١٩٣٢-١٩٣٣ کە پەیوەندیم کرد بە دەستەی ئەرکان، کەبارەگاکەی لە بەرلین بوو، ناسیاوەتیم لەگەڵی بەهێزتربوو، بەڵام لەوەش زیاتر، ئەوکاتە بەتەواوەتی ناسیم کە لەشەری دووەمی جیهانی بەیەکەوە بووین و لەوکاتەش کە هەردووکمان دیل بووین لەدوای جەنگەکە.

هەر لەو کاتەی لەساڵی ١٩٣٩ جەنگ دەستی بێگرد تاکو تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) ی ساڵی ١٩٤٠ پلەی ئەفسەری یەکەمی روکنی حەرەکاتم هەبوو لە بارەگای مارشاڵ فۆن، ئەوکاتەش پرۆسەی شەری پۆلۆنیاو شەری بەرەی رۆژئاواش لە گۆرێدا بوو، لە کۆتایی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٢ بوومە سەرۆکی دەستەی ئەرکانی بارەگاکەی، هەر لەو پلە و پایەمدا مامەوە تا سەرەتاکانی ئەیلوولی (سێپتێمبەر) ی ساڵی ١٩٤٤،

دوا جاریش لەژێر سەرکردایەتی ئەو بوومە فەرماندەی یەکێك لەو تەشکیلاتانەی بەرەی رۆژئاوا، پاشانیش بەشداری چارەنووسیم کرد لەکاتی دیلیەتی لە ئینگلتەرا. ئەو پیاو بوو، وەك پیاوانی دیکە نەبوو، پیاوێکی مەزن بوو خاوەن رەوشتێکی بەرز بوو. ئەو کتێبە ژیاننامەی مارشاڵ فۆن و، بە کورتی لایەنی مرۆڤایەتی ژیانی مارشاڵ فۆن پیشاندەدات، لەگەڵ ئەو پرۆسە سەربازیانەی کە لە شەڕی دووەمی جیهانی ئەنجامی داون.

بەگشتی مارشاڵ هەموو شتێکی لە کردەوەکانی رابردووی لەیاد ماوە، کە گۆڕەپانەکەی و ئەوەی لە ئەستۆی ئەو دابووە بێتاوانی دەسەلمێنێت، بەڵام چاوپۆشیش لەوە دەکات کە شەخصی خۆی رووبەڕووی زوڵم و شەڕانگێڕی بووبووەوە، ئەو واتە(مارشاڵ فۆن) هیچ کەسێك تاوانبار ناکات، چونکە لە دواڕۆژ دەڕوانێ، نەك لە رابردوو. بۆیە کتێبەکەم یەکانگیرە لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانی ئەو و خۆشم. هیوادارم ئەم کتێبە رێگای ئاشتی رووناك بکاتەوە بۆ دواڕۆژ.

**کۆنسەر بلومنتریت**

**لیوای پیادە**

## بەشی یەکەم

### خێزانەکەی و ڕۆژانی یەکەمی

زانیاریەکانی ئەم بەشە، لە ڕائید (پێشەوای یەکەمی خانەنشین) ئۆدوفۆن ڕۆنشتد برای مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد وەرگیراوە، کە ئێستا تەمەنی ٧٤ ساڵە و لە ئەڵمانیا نیشتەجێیە و ساڵانێکی زۆرە خانەنشین کراوە، ئەو برایە بەشداری کردووە لەگەڵ تاکە کوڕی مارشاڵ ڕۆنشتد (دکتۆر و مێژوونووس خوالێخۆشبوو فۆن ڕۆنشتد) کە لە ساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردووە، لە نووسینەوەی کورتەیەکی ژیانی مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد. ڕەنگە زۆر کەم ببیندرێ مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد باسی مێژووی کۆنی خێزانەکەیان بکات، هەتاوەکو لە بازنەی هاوڕێ هەڵبژاردەکانیش. چونکە لە سروشتەوە رقی لە قسەکردنە دەربارەی خۆی، ئەوانەی پەیوەندیشیان لەگەڵی هەیە دەزانن ئەو هەرگیز ئاماژە بەخۆی ناکات، تەنها بە ڕەخنە لەخۆگرتن نەبێت. بۆیە ئەستەمە لەو کتێبەدا بە وردی وەسفی نەریتی خێزانەکەی بکەین، کە بۆ نزیکەی ٨٥٠ ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، لە کوێ و کەی یەکەم فۆن ڕۆنشتد ژیاوە ؟ چی بەسەر هاتووە ؟ هەموو ئەوانە بۆ ئەمڕۆ نەزاندراوە. بۆ یەکەمجار ناوی خێزانی ڕۆنشتدی یەکەم لە دیکۆمێنێکی دەستنووسدا هاتووە کە (برینکان) ی سەرۆکی تەشریفاتی مەترانی ناوچەی (هالبرشتات) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەلپ لە ڕۆخی باکووری ڕۆژئاوای چیای (هارز) کە ئەوکات بەشێك بووە لە دەوڵەتی کۆنی ئەڵمانیدا، داینا‌وە. ئەو (برینکان)ە، ناوی لە تۆمارە فەرمیەکانی ساڵی ١١٠٩ز هاتووە، بەشێکی ئەو بنەماڵەیە لە بەهێزکردنی کۆڵگەکانی نەتەوەی ئەڵمانی لە هەرێمی (براندنبێرگ) ی ڕۆژهەلاتی ئەلپ

بەشـداریان کـردووە، هـەروەها لـە سـاڵی ١٣٣١ لقێکـی ئـەو خێزانـە سیسـتەمێکی دەرەبەگایـەتیان لـە نزیـك (سـتندال) ی رۆژئـاوای ئـەلپ دامەزرانـدووە، کـە تـا سـاڵی ١٩٤٥نـاوی بنەماڵـەی رۆنشـتدی بنچـینەیی (اصلی) لە هەرێمی هارس دۆزرایەوە، ناوی ئەو بنەماڵەیـە لـە پاشمـاوەی قەڵای کۆنی نزیك (هالمشتاد) بە جێگیری مایەوە، کە لـە کـاتی ئێسـتادا رووسەکان خاڵێکی کۆنترۆڵیان لەوێ هەیە.

ئـەوەی پێویسـتە لێـرەدا بیڵـێین ئەوەیـە کـە نێرینـەکانی بـەرەبابی رۆنشتد هەمیشە و بە درێـژایی سـەدەکانی رابـردوو پیـاوی سـوپا بوونـە. ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەروەها لە سەرەتاکانی چەرخی نوێـدا تاڕادەیەکی زۆر لەلایەنی رۆحی و فکریـەوە رۆژئـاوایی بوونـە، هەرچـەندە سنوورێکی سیاسی لە نێوان حکومەتەکانیانـدا هـەبووە، بـەڵام ئاڕاسـتەی "ئەوروپایەکی یەکگرتوو" بۆ هەمیشە لەبەرچاوان بووە بەشـێوەیەك کـە شـایەنی گرنگـی پێدانـە. دوا جـاریش لـە کـاتی بەدەرکـەوتنی وڵاتـانی نەتـەوەیی لـە ئـەوروپا، دووبـارە، داب و نـەریت و کەلـەپووری رۆمـانی و پاشمـاوەی سـەدەکانی ناوەڕاسـت بـەرەو نـەمان چـوون. بـەرەبابی "رۆنشتد"یش لەمە بەدەر نەبوو، بەڵکو لەگەڵ زۆربەی بنەماڵـە ئەڵمانیـە کۆنـەکان لەمـەدا بەشـدار بـوو. لـەماوەی نزیکبوونـەوەی نێـوان وڵاتـانی ئەوروپایی لە سەردەمی ئیمپڕاتۆر شارلی پێنجـەم، دەبیـنین لـەو کاتـەدا پیاوانی ئەو بەرەبابـە چوونە نـاو سـوپای رایخـی ئـەڵمانی، هـەروەها لـە سلکی سوپای زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوایی بەشداریان کـردووە. بـۆ نموونـە، مارشاڵ هانی فۆن رۆنشتد لـە ژێـر سـەرکردایەتی (ولیـەم ئـۆرانج) لەگـەڵ هۆڵەندییەکان دژی ئیسپانیەکان جەنگاوە، هەروەها کاتێ سوپای رووسیا

لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا دروست بوو، شتێکی ئاسایی بوو کە زۆربەی پیاوانی ئەو بەرەبابە بخزێنە ناوی.

هەروەها جارێکی دیکە عەقید (جواخین فۆن رۆنشتد) لە ساڵی ١٧٤٦ دەچێتە خزمەتی (هیسییەکان) و لە ئوسکتلەندا دەچێتە پاڵ بنەماڵەی (ستیوارت) کە خەباتیان دەکرد بۆئەوەی دەست بەسەر سوپای حکوومەتی ئینگلیزیدا بگرن. هەروەها بەرەبابی رۆنشتد لە گشت شەڕەکانی بڕووسیا شانبەشانی سوپای بڕووسیا بەشداریان کردووە، تەنها لە شەڕی سەربەخۆیی ئەڵمانیا نەبێت کە لە ساڵی ١٨١٣–١٨١٥ هەڵگیرسا.

لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لەو بەرەبابەدا هیچ نێرینەیەك نەبووە کەپێگەیشتبێ و بەشداری لە شەڕی ١٨١٣–١٨١٥ شەڕی سەربەخۆیی ئەڵمانیا کردبێت.

بەم شێوەیە دەبینین نەوەکانی ئەم بەرەبابە کە ریشەکەیان بۆ ساڵی ١١٠٩ دەگەڕێتەوە بە زۆری پیشەی سەربازیان لە سوپای وڵاتانی رۆژئاوا کردۆتە پیشەی خۆیان. بۆیە دواجاریش دەبینین چۆن مارشاڵ فۆن رۆنشتد دەستی گرت بەسەر داب و نەریتی سەربازی بەرەبابەکەیان.

هەموو کەسێك سیفاتەکانی لە منداڵی بۆ بە میرات دەمێنێتەوە، ئەوەی بیەوێ لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی هەر کەسێك بکات، دەبێت لە رۆژگاری منداڵی و ئەو ژینگەیەی لێی ژیاوە بکۆڵێتەوە. (کرید فۆن رۆنشتد) لە ١٢ی کانوونی دووەم (دیسێمبەر) ی ساڵی ١٨٧٥ لە (ئەسکیرس لیبن) ی رۆژئاوای (کویدلنبرگ) لە دایك بووە، لە نێوان چوار برادا ئەو نۆبەرە بووە، ئەو کاتە باوکی (ملازم) بووە لە کەتیبەی سوار

چاکی پاشای بڕووسیا. بەڵام دایکی (نی فیشەر) کە کچی عەمدەی هەرێمەکە بووە لە نزیك (ماکدبرك) لەو کاتەی کە دایکی ڕۆنشتدی کوڕە گەورەی بوو تەمەنی بچووك بوو، بۆیە هانای وەبەر بەخێوکەرێکی ئینگلیزی برد بۆئەوەی هاوکاری بکات لە بەخێوکردنی منداڵەکەیدا، بەمەش ڕۆنشتد هەر لە خۆوە و بەبێ ئەوەی هەست پێبکات زانیاری لەسەر زمانی ئینگلیزی پەیداکرد، هەروەها زۆر داب و نەریتی ئینگلیزەکانیشی وەرگرت. بەرەبابی فیشەر کە دایکی فۆن ڕۆنشتد وەچەکەی دەچێتەوە سەر ئەوان، لە (هیکنۆتەکان)ە، کە لە فەڕەنساوە بۆ ئەڵمانیا ڕایان کرد (بەهۆی چەوساندنەوەی ئایینی. ڕۆنشتد زۆربەی سیفەتەکانی لە دایکی وەرگرت وەك ئەوەی زۆربەی جار منداڵ سیفەتەکانی دایکی هەڵدەگرێت. لەو سیفەتانەش کە لە دایکی وەریگرت، ئازایەتی و بوێریەکی ڕاستگۆیانە بوو کە لە خوێنی هیکنۆتەکانی باپیرانی دایکییەوە هەڵقوڵابوو.

براکەی ئاوای لەسەر نووسیبوو: "ڕۆنشتد زیرەکیەکەی لە دایکی و گیانی سەربازیەکەشی لە باوکی وەرگرتبوو، هەروەکو باوە و ئاساییە لە پەروەردەکردنی منداڵی نۆبەرەدا، ئەوەی بتوانرێ لە زیرەکی و بلیمەتی و زرنگی پێی دەدرێ، بەمجۆرە گەیشتە ئاستێکی بەرز لە ڕەسم و مۆسیقا، بەڵام دەربارەی توانستی لە تەقلیدکردن، ئەوا لە رامان لە قسەی خەڵکانی دیکە سوودی وەرگرت.

"ڕۆنشتد ڕەوشتە ژیربێژیەکەی تا دواساتی ژیانی پاراست، ئەو کاتانەی کە لە بارێکی باش بێت و بە ڕەوشتە بەرزەکانی لەگەڵ خۆشەویستانی دەبێت کە ئارەزووی تێکەڵ بوونیان دەکات، تەنها بە زمانی ئەڵمانی باو قسەی نەدەکرد، بەڵکو بە زمانی هەموو گەلانی دیکە

قسەی لەگەڵ دەکردن، نە ئەڵمانیەکان بە خۆیان و نە بێگانەکانیش نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی بێگەنینیان بکەن، بە تایبەت لەو کاتانەی کە رۆنشتد دەیەویست بە بێگەنینیان بهێنێت بە شێواز و لۆژیکە تایبەتییەکەی.

"رۆنشتد خۆی زۆر بەکەمی پێدەکەنی، بەڵام بێ لێکدانەوە بە خێرایی نوکتەی خۆشی دەگێڕایەوە، تا ئەوکاتەی لە کۆلێژی سەربازیش بوو (وەکو براکەی دەیگێڕێتەوە) لاسایی هەڵسوکەوت و جووڵەی سەرکردەکانی دەکردەوە، لە کۆتاییش ئەو توانستەی "لاسایی کردنەوە" لەسەر جوڵە و هەڵسوکەوتی هندنبرغ و هیتلەریشی جێبەجێکرد و لاسایی کردنەوە. (ئەو کاتەی باوکی رۆنشتد بۆ کەتیبەی سوارچاکی سێزدە لە شاری مینز گواسترایەوە، چووە قوتابخانەی دواناوەندی ئەو شارەوە، دوای دەرچوونیشی لەوێ پەیوەندی بەزانکۆوە کرد.

" هەروەها لەمەلەوانگەی سەربازی لەسەر زێی (راین) نزیك مینز، رۆژێك جێ نشینی پاشا، شازادە فریدریك لەوێ بوو، کە زۆری پێنەچوو بوو، ئیمپراتۆر فریدیریکی زاوای مەلیکە فیکتۆریا، ئەوکاتە فریدریك لە مینز بوو بە مەبەستی پشکنینی بەشەکانی سەربازیەوە، لەحەوزەکە یاری لەگەڵ ئێمەی منداڵ دەکرد، بێ ئەوەی ئێمە ئەو کەسە بناسین، لەوکاتەدا ئەو تەمەنی لە ئێمە گەورەتر بوو.

"لەو کاتەدا تەنیا پردی بۆنتۆن هەبوو لەسەر زێی راین، کە پێویستی دەکرد جارجارە بەرزبکرێتەوە تاکو بەلەم و پاپۆڕەکان بتوانن بە ژێریدا بڕۆن، ئەمەش هەستی ئێمەی بزواند و خەیاڵی دوارۆژمان بۆ هات،

براكەم واى بە بير داهات كە بووەتە (مارشاڵ لە سوپا) و سەركردايەتى سوپايەك دەكات كە بەرەو باكوور بۆ پێشەوە دەڕوات، منيش (براى رۆنشتد) وام بە بير داهات كە بوومەت (ئەدميرال) لە دەرياوانى و كەشتيگەلێكى سەربازى بەڕێوە دەبەم، لە رۆخى رووباريش براى سێيەممان (ئايبەرهارد) بە كڵاوە فراوانەكەى خۆى وەكو فالگرەوەيەك خۆى دەنواند.

"بەڕێز (هاربنكتۆن) موڵكێكى لە نزيك مينز كڕى، دۆگلاسى كوڕيشى لە خوێندندا لەگەڵ فۆن رۆنشتد بوو بوونە هاوڕێى يەكتر، چونكە دەيانتوانى بەئينگليزى قسە لەگەڵ يەكتر بكەن.

"رۆژێك لە رۆژان دۆگلاس ويستى شەڕ بە يەكێكى قوتابخانەكەيان بفرۆشێ چونكە حەزى بە هاوڕێيەتى ئەو نەدەكرد، بۆيە بڕياريدا لە رۆژى لە دايكبوونى ناحەزەكەى بە ياريەك كە لە شێوەى مەدفەع بوو تۆپبارانى مێزەكەى بكات، بۆيە دۆگلاس و رۆنشتدى برام داوايان لێكردم منيش بەشداريان بكەم لەم كارەدا، بەڵام رەشەبايەكى توند لەناكاو هەڵيكرد و ئاستەنگەكەى تێكدا و بە ناچارى ئەوانەى داوەت كرابوون چوونە ژوورەوە، بەم شێوەيە پيلانەكەمان سەرينەگرت.

(هەندێ منداڵى بچووكيش ويستيان سوود لە بارووت وەربگرن بۆئەوەى پردێكى بچووكى سەر يەكێك لە زێيەكانى راين بتەقێتەوە، بەڵام ئەمەشيان فەشەلى هێنا بەهۆى نقووم بوونى ئەو بەلەمەى كە پيلانگێڕان بڕيار بوو سوودى لێوەربگرن بۆ جێبەجێ كردنى ئەو پيلانە.

ئەم يادگاريانە.... ئەو يادەوەريانەى منداڵيى رۆنشتد بەڵگەيە لەسەر ئەوەى دوور لە كۆت و بە ئازادى ژياوە، هەر لەو ماوەيەشدا رۆنشتد

بڕیاریدا ببێتە سەرباز وەك ملكەچ كردنێك بۆ نەریتە كۆنەكان كە وەكو نموونەیەكی بەرز لە مێشكی جێگیربوو بوو. هەر لە مینز باوكی مارشاڵ بۆ فرانكفۆرت گواسترایەوە وەك یاریدەدەری پیادەی ۲۲ كە ساڵی ۱۸۸٦ بارەگاكەی لە سەربازگەی فرانكفۆرت بوو "لە وڵاتی میسر لە جیاتی یاریدەدەر، ئەركانی شەڕ بەكاردێت- تێبینی وەرگێڕی عەرەبی" ، هەروەها لە ساڵی ۱۸۸۸ فۆن رۆنشتد و براكەی پەیوەندیان بە فێرگەی قوتابیە سەربازییە نوێكان كرد لە (ئۆرانین شتاین) . ئەو منالە كە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە ۱۳ ساڵی بەرگەی مەشقێكی سەربازی دژواری گرت، كە لەوكاتەی سوپای بڕووسیا ئەم جۆرە مەشقە دژوارەی لەسەر قوتابیانی فێرگەكە جێبەجێ دەكرد، هەر لەو رەوشەدا بوو كە رۆنشتدی بچووك سەرەتا هەستی بەوە كرد كە زۆر پەرۆشی كەس و كارەكەیەتی. لەو ماوەیەدا و بەتایبەتیش لەو فێرگە ئەسپارتیەدا وا باو نەبوو كە براكان بە نێوی شەخصی بانگی یەكتر بكەن، بەڵكو وا باوبوو بە نێوی خێزانەكان بانگی یەكتر بكەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو برا (كوڕەكانی رۆنشتدی باوك) بەم نەریتە پەیوەست نەبوون و هەر بە نێوی كەسێتی خۆیان بانگی یەكتریان دەكرد.

لە ساڵی ۱۸۸۹ رۆمانی (كلیشت) نێوبراو بە (هێرمان شلاخت) لەسەر شانۆی فێرگەی سەربازی نمایش كرا، لەو نمایشەدا فۆن رۆنشتد رۆڵی مارشاڵ (فاروس) ی رۆمانی بینی، لەكاتی زۆرانبازی بە شمشێر دژی نوێنەری شازادەی ئەڵمانی كە شمشێرێكی راستەقینەی یابانی لە جۆری (سامۆرای)پێبوو، شمشێرێك بە كڵاو (خوزە) ی كاغەزیی رۆنشتد كەوت و سەری بە شێوەیەكی خراپ زامدار كرد. لە ساڵی ۱۸۹۰ فۆن رۆنشتد بۆ كۆلێژی سەربازی قوتابیە دێرینەكان لە (لیختەر فیلد) گواسترایەوە و

لەوێ مەشقێکی زۆر دژوارتری بینی، هەر لەوێ لەگەڵ هاوڕێکانی بەشداری لە ڕێوڕەسمی گۆڕینی ئێشکگر(پاسەوان) ی کرد. هەروەها کاتێ قەیسەر داوای هێزی یەدەکی کرد بۆ خزمەتی سەربازی، قوتابیانی کۆلێژی سەربازی لەگەڵ هێزی یەدەك بەشداریان لە مەشقی سەربازی (مناوەرەکردن) کرد، کاتێکیش مارشاڵ فۆن (مۆلتکە) ی بەتەمەن لە ساڵی ١٨٩١ کۆچی دوایی کرد، قوتابیانی کۆلێژی سەربازی لە هەردوو لای شەقامەکە بەڕێکی وەستان و تابووتەکە بە نێوانیاندا تێپەڕی، ساڵێك پێشتریش واتە ساڵی ١٨٩٠ نمایشێکیان لەبەردەم بینایەی دەستەی ئەرکانی گشتی کردبوو بە بۆنەی ٩٠ ساڵەی لە دایك بوونی مارشاڵ (مۆلتکە) .

دەربارەی راستینەی منداڵێتی رۆنشتد، ئەوا براکەی کە لە کۆلێژی سەربازی لە گەڵیدا بووە، ئاوا باسی دەکات: "چاودێریکردن لە کۆلێژ بە شێوەیەکی باش نەبوو، هەروەها پێداویستیەکانی یاساش لەلایەن هەندێ مامۆستاوە فەشەلی هێنابوو، رۆنشتد بەشداری قوتابیانی دیکەی دەکرد لە یاریکردن لەپۆڵ (ڕۆژێك لە رۆژان مامۆستایەك لە دەرگای پۆل کەوت، رۆنشتدیش بەناوی خۆی بانگی کرد و پێی گوت : (ئێستا دێیتە پۆل یان لە کۆڵمان دەبیتەوە؟!! ئینجا مامۆستاکە کە دکتۆر (رایخ) بوو ناوی رۆنشتدی وەك سزایەك لە تۆماری تاوانباران نووسی و ئەم تێبینیەشی بەرامبەر ناوەکەی نووسی: (رۆنشتد چەقاوەسوو وسەخت و توندوتیژە) کاتێکیش ئەو تۆمارە درایە چاودێری سەربازی کە پلەکەی پێشەوا بوو، ئەو تێبینییەی بە پیاهەڵدانی رۆنشتد حیساب کرد و مۆڵەتێکی تایبەتی پێدا تاوەکو لە بەرلین بەسەری بەرێت. وەك باو بوو پشووی هەفتانە پاش نوێژی یەکشەممە لە کەنیسە دەست پێدەکات، لەیەکێك لەو

پشووانە، ڕۆنشتد هەوڵیدا زووتر پشووەکەی وەربگرێ، بۆیە وای نیشاندا کە دەیەوێ یاوەری داپیرەی بکات لە سواری ئەسپ بوون لە دارستاندا، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە داپیرەی لە نەخۆشخانە کەوتبوو، ئەم جۆرە نوکتانە لە نێو هاوەڵانی ڕۆنشتددا زۆر بڵاوبوون.

ساڵی ١٨٩٢ ڕۆنشتد لە تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بوو و پلەی نایب زابتی جەنگی پیادەی پێبەخشرا، لەو سەردەمەدا بڕیاری هەڵبژاردنی جۆری خزمەت (پیادە- سوارچاکی- مەدفەعی) بە ئارەزووی ئەفسەرە نوێیە خۆبەخشەکانی دەرچووی کۆلێژی سەربازی بوو. ڕۆنشتد ئارەزووی لەوە بوو پەیوەندی بە بەشی سوارچاکی (خەیالە) بکات. چونکە باوکیشی ئەفسەری خەیالە بوو لە تیپی (هۆسار) ،هەروەها سیفەتی عەقڵی ڕۆنشتد پێکهاتبوو لە خێرایی خەیاڵ و ئەندێشە و خۆڕاگری و هەروەها توانای هەبوو بە ئاسانی و بە خێرایی لە ئەرکێکەوە بۆ ئەرکێکی دیکە بچێت. ئەمانە هەمووی شیاوی ئەوەی دەسەلماند بۆئەوەی پەیوەندی بە سنفی خەیاڵەوە بکات، بەڵام بەهۆی کەمی داهاتی خێزانیان کە لە چوار کوڕ بێگهاتووە، نەتوانێت بچێتە ئەم بەشە بەهۆی پێویست بوونی توانایەکی زۆری ماددی لەم بەشەدا. بۆیە ڕۆنشتد ویستی بچێتە سنفی (مەدفەعیە) بەڵام ئەم ئارەزووەشی نەهاتە دی بەهۆی داواکاری زۆر ئەفسەرە دەرچووەکان و ئارەزووی زۆریان بۆ ئەم سنفە. لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا نایب زابت فۆن ڕۆنشتد پەیوەندی کرد بە کەتیبەی ٨٣ ی پاشایی بڕووسیا لە شاری کاسل، لەوێش وەك هەر (زابت سەفێك) یاخود وەك هەر سەربازێك بۆ ماوەی ٦ مانگ خزمەتی کرد، ئەمەش نەریتێکی ئەڵمانی بوو بۆئەوەی لە پەیوەندی بە تینی ژیانی سەربازی بگات کە دواتر سەرکردایەتیان دەکات. ساڵی ١٨٩٢ پەیوەندی کرد بە کۆلێژی

سەربازی لە (هانۆڤەر) و لە تاقیکردنەوەکان سەرکەوتنی بە دەست هێنا، لە حوزەیرانی ساڵ ١٨٩٣ بووە ئەفسەر بە پلەی ملازمی دووەم.

بەکورتی باسی ژیانی رۆنشتد لە ماوەی ١٨٩٣-١٩١٤دەکەین: سەربازگەی کاسل بەهۆی بوونی سنفی جودا جودا دەرفەتێکی کەم وێنەی بە رۆنشتد دا بۆئەوەی ئاگادار و شارەزای رێکخستن و شێوازی خزمەتی سەربازی و کارە سەخت و دژوارە رێکوبێگەکانی ببێت، دوای چەند ساڵێك ملازمی دووەم فۆن رۆنشتد گواستراوە شاری (ئەرۆلسن) بۆئەوەی پلەی جێگری کەتیبەی ٨٣ وەربگرێت (ئەرۆلسن) پایتەختی میرنشینی (ولدیك) بوو، کە یەکێك بوو لەو میرنشینانەی کە حکوومەتی بڕووسیا ئیدارەی دەکرد و کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد. بۆیە هیچ کارێك بۆ شازادە نەمابۆوە بیکات، دیوەخانەکەی تەنها بەناوبوو، یاخود وێنەیەکی بچووککراوەی دیوەخانی راستەقینە بوو، لەبەر ئەم هۆیە شازادە کاتێکی زۆری هەبوو، زۆربەی ئەوکاتانەشی وەکو میوانێك لە چێشتخانەی ئەفسەرەکان بەڕێوە دەبرد و پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ ملازمی دووەم فۆن رۆنشتددا هەبوو. بەڵام شێوازی ژیان لەم شارەدا و رادەی لێکچوونی یاساش بە یاسای خێڵەکی، دەتوانین تێبگەین، ئەگەر بزانیت دانیشتووانە باشەکەیان بە خۆبەخش لە رۆژی باراندا ئەفسەرەکانیان لە پشتی خۆیان هەڵدەگرت تاوەکو پێڵاوە پێستە درێژە بریقەدارەکانیان تەڕ نەبن و بە پاکژی بمێنێتەوە، بۆئەوەی شیاو بێت بۆ ئاهەنگی سەمای دیوەخانی شازادە. جارێکیان وا روویدا رۆنشتد لەسەر پشتی پیاوێك کە هەڵیگرتبوو کەوتە خوارەوە و جلك و پێڵاوەکانی هەمووی بە قوڕ بوو، شازادەش بە بەفری نێو شووشەی شامپانیا و دەستەسڕی سەر مێزەکان جلەکانی لە قوڕ بۆ پاککردەوە، لەو کاتەشدا

لـه (ئەرۆلسـن) هـیچ ئۆتۆمبێلێـك یـان عارەبانـه كـه ولاغێـك رایبكێشـێت نەبوو! ! له یەكێك لەو ئاهەنگانـه فـۆن رۆنشـتد چاوی كـەوت بـه خـاتوو (ویلـهلمینا) ی شـازاده كـه لـه دیوەخـانی (كۆشـك) ی شـازاده دەژیـا و دواتریش بووه شاژنی هۆڵەندا، رۆنشـتد زۆر پێـی سەرسـام بـوو، رۆنشـتد دوای گەڕانەوەی بۆ كاسل له ساڵی ١٩٠٢ لەگەڵ (لـویز فـۆن كـۆتن) كچـی پێشەوای یەكەمی خانەنشین كه لەوێ دەژیـا پرۆسـەی هاوسـەری ئـەنجام دەدات، له ساڵی ١٩٠٣ كوڕێكیان دەبێت نەشونما دەكـات تـاوەكو ببێتـه مێژوونووس نەوەك ئەفسەر، به پێچەوانەی گشت نەریتەكانی خێزانەكەی، چونكه دوای ئەوەی چووه زانكۆ جودا جواداكـان و تاقیكردنـەوەكانی بـه سەركەوتوویی بڕی و بڕوانامەی دكتۆرای بـه دەسـت هێنـا، لـه كارەكـەی وەك لێكۆڵەرەوە و مێژوونووس خۆی ماندوو كرد تاوەكو شـەڕی دووەمـی جیهـانی هەڵگیرسـاو، هـەر لـه سـاڵی ١٩٤٣ ەوە لـه گۆڕەپـانی جەنگـدا یـاوەری بـاوكی كـرد. هـەروەها لـه زینـدانی ئینگلتـەراش لەگـەڵ بـاوكی زیندانی كرابـوو، پاشـان لەسـاڵی ١٩٤٨ لـه هانۆڤـەر كۆچـی دوایـی كـرد، لەسەری ساڵی ١٩٤٧دەسـەڵاتدارانی بـەریتانی بـه پشـتگیری مۆنتكـۆمری مۆڵەتی به رۆنشتد دا بەمەبەستی ئەوەی چـاوی بـه كوڕەكـەی بكـەوێت و به فڕۆكه له ئینگلتەراوە رەوانەی ئـەڵمانیایان كـردەوە، كـه دواتـر پـاش ماوەیەكی كەم كوڕەكەی كۆچی دوایی كرد.

له ساڵی ١٩٠٣ ئەو كاتـەی رۆنشتد جێگری كەتیبـەی پیـادەی ٨٣ بـوو له تاقیكردنەوەی شیاندن دەرچوو بۆئـەوەی بەشـداری لـه خـولێكی سـێ ساڵە له كۆلێژی ئـەركانی بـەلین بكـات. لـەو خولـەدا خۆشـترین وانـه لای رۆنشتد وانەی تـەیار كردن (تـەعبیـه) بـوو. پـاش ئـەوەی مـاوەی خولەكـه كۆتایی پێهات رۆنشتد لە(دەستەی ئەركانی گشتی مـەزن) دامـەزرا. پـاش

ئــەوەی مــاوەی ســـالّ و نیوێــك وەكــو تاقیكردنــەوە لــەوێ مایــەوە گواسترایەوە بۆ "دەستەی ئەركانی گشتی بەپلـەی پێشـەوا"، بەگوێرەی یاسـای بـاو لـە سـوپادا پێویسـت بـوو بگەڕێتـەوە بـۆ یەكـەكان، بۆیـە گەڕایەوە و بووە فەرماندەی سریە لـە كەتیبـەی ١٧ ی پیـادە لـە شـاری (كۆلمار) بالآلزاس.

ڕۆنشتد لە خزمەتكردن بەردەوام بوو بە گوێرەی بنـەماكانی سـوپا كـە بە دیقەت و بە وردی دانراوە و سوپای ئەڵمانیا هەر لە ساڵی ١٨٧١ تـاكو ١٩١٤ جێبەجێی كردووە.

## بەشی دووەم

### کۆتایی سوپای کۆن

بێگومان جەنگی یەکەمی جیهانی ١٩١٤–١٩١٨ بابەتێکە تا ڕادەیەکی زۆر بە چێژە و بەتامە بۆ مێژوونووس و پیاوی پیشەوەری جەنگ، بەلاّم لەکاتی ئێستادا خوێنەری ئاسایی زۆر چێژی لێوەرناگرێ، بۆیە لێرەدا تەنها بە کورتی رووداوە سەرەکییەکان باس دەکەین کە پەیوەندی بە کارەکانی فۆن رۆنشتدەوە هەیە.

لە ماوەی ئەو جەنگەدا فۆن رۆنشتد لەکاتی هەلاّیسانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا پلەکەی پێشەوا (رەئیس) بوو، سەر بە دەستەی ئەرکانی تیپی یەدەکی ٢٢ بوو، کە لە بەرەی رۆژئاوا ئەرکەکانی جێبەجێ دەکرد. ئەو پلەیەش یەکسانە بە پلەی (ئەفسەری روکنی یەکەمی بەشی حەرەکات) لە سوپای بەریتانیا. ئەم تیپە رۆڵێکی گرنگی لە شەڕی (مارن) گێڕا. ئەمەش بە لەنێوبردنی ئەو هەوڵەی کە سوپای فەڕەنسا لە پاریس ئەنجامیدا بۆ ئابلووقەدانی باڵی راستی سوپای ئەڵمانی، ئەو تیپەبوو کە توانی لە ئەیلوولی ساڵی ١٩١٤ بچێتە نزیکترین شوێن لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا بە شێوەیەك دەیانتوانی بورجی ئیڤڵ ببینن. رۆنشتد لەو رۆژگارەدا زۆر چوست و چالاك بوو، بە گوێرەی زانیاری گشتی شایەدحاڵەکان ئەو داینەمۆی تیپەکە بوو، هەروەها سەرچاوەی وردبینی و ئارامی بوو لە سەرکردایەتییەکەی، ئەم کارانەش ناتوانرێ بەنرخ هەڵبسەنگێندرێ، بەتایبەتیش دوای ئەوەی فەرماندەی تیپەکە بە سەختی بریندار بوو.

هەروەها کاتێك شەڕی خەندەکەکان لە ڕۆژئاوا هەڵگیرسا ڕۆنشتد لەلایەن حکوومەتەوە لە (ئەنتویرب) دامەزرا. هەروەها لە بەهاری ساڵی ١٩١٥ جارێکی دیکە بە پلەی ئەفسەری روکنی تیپ دامەزرایەوە، دواتر لەبەرەی ڕۆژهەڵات لە هێرشکردنە سەر نیرۆ بەشداری کرد، دوای جموجۆڵەکانیش لە وێ، فۆن ڕۆنشتد ڕەوانەی لای حکومەتی گشتی پۆڵەندی کرا کە ئەو کات جەنراڵ فۆن بسلەر حاکمی گشتی ئەوێ بوو، هەروەها لە ساڵی ١٩١٦ وازی لە پلەکەی هێنا لەبەرەی ڕۆژهەڵات و بە سەرۆکی دەستەی روکنی فەیلەق لە کربات لە هەنگاریا دامەزرا. ئەو فەرماندەیەی کە ئەو کاتە سەرۆکایەتی فەیلەقی ناوبراوی دەکرد خۆشەویست نەبوو، بۆیە ئەوکاتەی ڕۆنشتد بۆ یەکەمجار خۆی بەدەستەی روکن ناساند، هەستی بە ساردییەك دەکرد لەلایەن ئەفسەرە روکنەکانی دیکە، ئێوارەیەکیان یەکێك لە ئەفسەرەکان بە بێگەنینەوە بە ڕۆنشتدی گوت (بەڕاستی تۆ پیاوێکی باشی) ڕۆنشتدیش وەڵامی دایەوە و گوتی (بۆچی ؟ ئایا بە پێچەوانەی ئەوە بیرت کردبۆوە ؟) ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: وایە فەرماندە زۆر بە تۆی هەڵدەگوت، ئێمەش دەترساین ئەوەی ئەو بەم شێوەیە مەدحی بکات وەکو ئەو بێت و ڕەزا قورس بێت. ڕۆنشتد لەو پلە و پایەدا دەرفەتی بۆ ڕەخسا تاکو سوپای کۆنی نەمسا و مەجەر (هەنگاریا) لەسەر حەقیقەتی خۆیان بناسێت، هەروەها بەهرە و زیرەکیەکەشی بە شێوەیەکی بەرچاو دەرکەوت، ئەو بەهرەیەی تاکو ئێستا سەرکردەکانی ئەڵمانی لێی بێبەشن. ئەو بەهرەیەش بەرهەمی وەڵامدەرە گیانیەکانی بوو لەگەڵ ئەوانەی لەژێر دەستی ئەو کاریان دەکرد، هەروەها ئاکامی حیکمەتەکەی بوو لە سەرکردایەتی کردنی ئەو بەشەی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەودا بوو، هەر

کاتێك دەربارەی جەنگی دووەمی جیهانی بدوێم بە بەردەوامی ئاماژە بەو بەهرەیە دەکەم.

لە پاییزی ساڵی ١٩١٧ بە سەرۆکی دەستەی روکنی فەیلەقی ٥٣ لە بەرەی رۆژهەلاّت دامەزرا. ئەو کاتە ئەو فەیلەقە سەرکەوتنی چاکی بەدەست هێنا بوو، لەبەرەوپێشدابوو تاکو دەریاچەی (بیبس) لەو ماوەیەی کە مابۆوەش لە جەنگەکە، سەرۆکی یەکەمی روکن رۆنشتد بە پلەی سەرۆکی دەستەی روکنی فەیلەقی ١٥ لە بەرەی رۆژئاوا کاری کرد، تا کۆتایی هاتنی جەنگیش هەر لەو پلە و پایەدا مایەوە.

رۆنشتد دید و بۆچوونی کەسێتی بەنرخی خۆی هەبوو دەربارەی بەڕێوەبردنی جەنگی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا. یەك لەو دید و بۆچوونانەش ئەوەبوو کە هۆکاری دۆڕاندنی شەڕی (مارن) ی ساڵی ١٩١٤ ی دەگەڕاندەوە بۆ هۆی لاوازکردنی باڵی لای راستی سوپای ئەڵمانی بەپێچەوانەی پلانی (شلیفن) ی رووبەڕووبوونەوەی یەکەم، هەروەها دەستەی روکنی سەرکردایەتی سوپای ئەڵمانیا بە ئەرکەکانی خۆی لە سەرکردایەتی کردنی بە خۆڕاگری بەجێنەگەیاند، ئەمەش بەهۆی ئەوەبوو بارەگاکەیان زۆر دوور بوو لە پشتەوەی بەرەی شەڕ، هەروەك هۆکارێکی دیکەش هەبوو کە ئەویش کەللە رەقی سەرکردایەتی باڵی راست (فۆن کلۆکە) بوو کە بووە هۆی ئەوەی ئەوباڵە بە گشتی لە هەلۆێستێکی ناخۆش و دژوار دابێت و رزگارکردنی ئەستەم بێت. پەیماننامەی (ڤرسایل) ی ساڵی (١٩١٩) کۆتایی بە نەریت و تەقالیدی سوپای جەرمانی بڕووسیای بەناوبانگ هێنا. ئەو تەقالیدانەی کە لەسەر ئەساسی خزمەتی سەربازی گشتی و پەیوەندار بە سوێندی دڵسۆزی بۆ خاکی باوك و باپیران و پاشایەتی رەها بنیاتنرابوو، ئەو سوپایە سوپای

پاشایەتی بوو، پاشانیش بووە سوپای ئیمپراتۆری، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پەیوەندیەکی ئاسایی لە نێوان ئەفسەرەکان و شەخصی پاشای فەرمانڕەوا دروست بێت، ساڵی ١٨٧١ تاکو ساڵی ١٩١٤، واتە ماوەی ٣٤ساڵ ئەڵمانیا و سوپاکەی بە ئاشتی و دوور لە شەڕ بەیەکەوە ژیان، روون و ئاشکرایە ئەفسەرەکانی سوپا هەمووی لەیەك بێگهاتەی سوپای ناوەخۆ توانەوە، هەروەها لەسەر بیر و بۆچوونی کۆك و تەبا مەشقیان پێدرا، بەهەرحاڵ ئەمەش سلبیاتی خۆی هەبوو، لە هەمان کاتیشدا ئیجابیاتی مەزنی خۆشی هەبوو. رەگ و ریشەی ئەم یەکێتیەش لە بیر و بۆچوون بۆ نەریتە کۆن و ریشە داکوتراوە کۆنەکانی ساڵانی ١٨٧٠-١٨٧١ دەگەڕێتەوە، ئەو کات (بڕووسیا و بافاریا و رۆتنبێرگ و سەکسۆنیا و بادن و هیس) هەموویان دەوڵەتۆکەی سەر بە ئەڵمانیا بوون و سەربەخۆی و کیانی خۆیان هەبوو کە "پاشا" حوکمی دەکردن بەر لە ساڵی (١٨٧٠) هەروەها سوپاکانیان لەسەر نەریت و بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆیان مەشقیان دەکرد. بەچاو پێداخشاندنەوەیەك بەگەشەکردنی ئەڵمانیا لە بوارەکانی مێژوویی و سیاسی،دەبینین بڕووسیا هەنگاو بە هەنگاو بەرەوپێش چووە، بەڵام ئەم ڕۆح و سیفاتە تایبەتیانەش دەوڵەتەکانی ئەڵمانیا کە لە ساڵی ١٨٧١ هەبوون تا ساڵی ١٩١٤ مایەوەو پارێزگاری لێکرا، سوپای ئەڵمانی لە ساڵی ١٨٧١ تا ساڵی ١٩١٤ رەنگدانەوەیەکی رژێمی ئەڵمانی ئیمپراتۆری بسمارکی بوو. ئەڵمانیا و سوپاکەی بانگەوازی یەکێتی (فیدراڵی) یان دەکرد بۆئەوەی ئەو دەوڵەتۆکانەی ئەڵمانیا لەژێر سایەی یەکێتیەکی هاوبەش کۆبکاتەوە، لەگەڵ پارێزگاری کردنی ئەو دەوڵەتۆکە ئەندامانە لە سیفاتەکانی خۆیان. بەڵام لە واقیعدا ئەو کۆکردنەوەی دەوڵەتۆکانە لە وڵاتێکی یەکگرتوو بۆ

کۆکردنەوە و خڕکردنەوەی هێزەکان بوو بۆ جێبەجێکردنی پلانی نەخشە بۆ دارێژراو. هەموو ئەو دەوڵەتۆکە جیاجیایانە بەتایبەتیش بافاریا خاوەنی مافی تایبەتی خۆیان بوون و دەسەڵاتی سەربەخۆیان هەبوو لە کاروباری ئیداریدا، لەوەش زیاتر سوپای پاشایەتی بافاری نەکەوتە ژێر فرمانی سەرکردایەتی قەیسەری ئەڵمانی تەنها لە تەعبیەی گشتیدا نەبێ، بەڵکو وەك سوپایەکی جیاواز لە چوارچێوەی سوپای یەکگرتوو مایەوە. هەرچۆنێك بێت و هەرچەندیش نەریتی سوپاکانی ئەڵمانیا جیاواز بووبێت، بەڵام لە نێوان ئەفسەرانی جودا جودای سوپادا گونجانێك هەبوو بەرامبەر خواستی پاشایەتی و پلانی گشتی. ئەو نەریتە تایبەتیەی سوپا جودا جوداکانی ئەڵمانیا، کۆنە بە کۆنی نەریتەکانی سوپای وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکە، بەڵام سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم، ئەو کاتەی فەڕەنسا ئەو نموونەیە بوو کە هەموو گەلانی دیکە لاساییان دەکردەوە، بۆ نموونە سوپای فەڕەنسایی بە سەرکردایەتی لویسی چواردەهەم وڵاتانی ئەڵمانی لاساییان دەکردەوە، زاراوە هونەریە سەربازیەکانیش بە شێوەیەکی بەرفراوان لە زمانی فەڕەنسی وەرگیرابوون، گرنگە ئەو راستیانە بنرخێندرێن و پیشان بدرێن. چونکە رۆنشتد لە خێزانێك لە دایك بووبوو کە بۆ چەندین سەدە لە ژینگەیەك ژیابوون کە پەیوەندی بە حوکمی پاشایەتی رەها و بێ کۆت و بەند هەبوو. بۆیە ئاسایی بوو رۆنشتد بەرهەڵستی و بەربەرەکانی سۆسیالیستی نیشتیمانی (نازیەت) بکات، لەبەرئەوەی ئەو جیهان و دید و بۆچوونانە زۆر زۆر لەو دوور بوون!! پەیماننامەی (ڤرسایل) ی ساڵی ۱۹۱۹ کۆتایی بە رایخی کۆنی ئەڵمانی هێناو، پێویست بوو لەسەر پاشا وازبێنێ و دەستبەرداری عەرشەکەی بێت، هەروەها لەسەر ئەڵمانیا

پێویست بوو دوای ئەو ماوە دوور و درێژەی رژێمی پاشایەتی رژێمێکی کۆماری بۆ خۆی بێگ بهێنێت. لە ئاکامی ئەمەش ئەو بنەمایانەی کە سوپا لە سەری وەستابوو لەباریەك چوون و بەرەو نەمان چوون، بۆیە ئەفسەرێکی زۆر خۆیان خانەنشین کرد، دوای ئەوەی رۆژگار رووی وەرگێڕا لەوەی ئەوان وەك شیعار و نموونەیەك بۆ خۆیانیان دانابوو. بۆیە (ڤرسایل) نەك هەر کۆمارێکی نوێی دامەزراند، بەڵکو هێزێکی چەکداری ئەڵمانیشی دروست کرد. ئەو گەلەی کە لە دڵی ئەورووپا دەژیا و لە ٦٨ ملیۆن کەس پێکهاتبوو مافی ئەوەی پێدرا کە سوپایەکی بێگهاتوو لە نزیکەی چوار هەزار ئەفسەر و ٩٦ هەزار سەرباز و پلەداری بچووکی هەبێت، ئەمە بێجگە لەوەی بێبەشیش کرا لە هەموو جۆرە چەکێکی قورس بە تۆپهاوێژی قورسیشەوە، هەروەها بوونی هەژدە کەتیبەی سوارچاکی لە میلاکی سوپاکە بایەخی شەڕکردنی کەمکرایەوە، چونکە ئەو بەشەی سوپا لە ساڵی ١٩١٩ زۆر لە گرنگیەکەی لە دەستدا بەهۆی گەشەکردنی هونەری سەربازی نوێ لەوکات، دەشێ دروستکردنی چەند یەکەیەکی ناتەواو کەمتر خراپ بێت سەبارەت بەو سوپا بچووکە نوێیە، لە هەڵوەشانەوەی خزمەتی سەربازی بە زۆر (ئیجباری) کە سوپای ئەڵمانیا بۆ زیاتر لە ١٠٠ ساڵ خۆی پێوە راگرتبوو. (ڤرسایل) بنەمای سوپایەکی تۆکمەی دانا، پێویست بوو ئەو ئەفسەرەی خزمەت دەکات بەڵێن بدات بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ خزمەت بکات، هەروەها ئەو سەرباز و پلەدارانەی دیکە بەڵێن بدەن بۆ ماوەی ١٢ ساڵ خزمەت بکەن، ئەو رێسایەش لای ئەڵمانەکان سەیر و نامۆ بوو، بۆیە ئەو سوپا بچووکە پێویستی بە چەند ساڵێك هەبوو بۆئەوەی ئەڵمانەکان شتێك ببینن. ئەڵمانیەکان بۆچوونی جیا جیایان هەبوو سەبارەت بە راڤەکردنی کرۆك و

ناواخنی ئەو سوپایە، بەشێوەیەك ئەوەی لەوپەڕی ڕاست بووایە دەیگوت ئەوە سوپای سوورە، ئەوەشی ئەوپەڕی چەپ بووایە دەیگوت ئەو سوپایە بۆ ئەوە دامەزراوە تاکو بەرپەرچی بزووتنەوەکانی گەل بداتەوە. بۆیە لە سالآنی یەکەمدا کاروبارەکان بۆ هێزی چەکداری ئەلمانی ئاسان نەبوو، بەلآم سەرکردەی مەزن (ریت هارت) لە ورتنبێرگ شوێن پەنجەی دیاربوو لە ئامادەکردن و ڕێخۆشکردنی ئەو سوپایە لە کات و ساتێکی ناخۆش و دژواری دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لەگەلّ ئەوەش (فۆن سیکت) لەوەش زیاتر شایەنی پێدا هەلگوتنە، چونکە ئەو توانی هێزە لاواز و نوێیەی کۆماری بە بێ دەنگی بەهێز بکات، بە شێوەیەك سوپای ئەلمانی مەشق بێگرد دەتوانین بلێین بۆ ئەوکات مەشقێکی نموونەیی بوو، ئەو ئالۆزی و ناڕێکیەی ناوەخۆ کە دوای سالّی ١٩١٩ لە ئەلمانیا بلآوببوویەوە، لەگەلّ ئەو ململانێ حزبی و بیر و بۆچوونە جیاوازەکان بوونە هۆی ئەوەی (فۆن سیکت) سوپا لە سیاسەت دوور بخاتەوە، وای کرد هیچ لایەنێکی سیاسی نەتوانێ لە سوپاوە بگلێت. ئەفسەرە ئەلمانیەکان بەناوبانگ بوون بەوەی کە پیاوی سیاسەت نەبوون، هەر لە کۆنەوە و بە درێژایی چەندین نەوە و لە مندالّیەوە وا فێرکرابوون کە لە گشت لایەنەکانی سیاسەت خۆیان بە دوور بگرن، ئەمەش هۆکاری سەرەکیە بۆئەوەی کاریگەر نەبن لە چەکەرەکردنی ئاراستە سیاسیە نوێکان. دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی ئەلمانیەکان لە زۆر بۆنەدا ئیدانەی سوپای کۆنیان کرد، چونکە هیچ کاریگەریەکیان نەبوو لەسەر ئاڕاستە سیاسیەکان. بەلآم بۆ دواجار پێویست کرا لەسەر ئەفسەرەکان گرنگی بە ژیانی سیاسی لە ولآت بدەن بە ئیعتیباری ئەوەی کە ئەوان وەك هاولآتیەك و ڕێبەر و سەرکردەی سەربازە گەنجەکانن، ئەم

کارەش وای پێویست کرد کە حکوومەت سەرپەرشتی گشتی فێربوونی ئەو ئەفسەرانە بکات لە رامان و تێروانینی سیاسی، چونکە خۆشیان ئەداتێکی ئەو حکومەتەن، بەلام بە بێ ئەوەی خۆیان نقوومی کاری ئیجابی بکەن لە حزبە سیاسیەکان لە دەرەوەی خزمەت، لەبەرئەوەی ئەگەر لە نزیکەوە و بە ئیجابی خۆیان بخزێننە ناو حزبە سیاسیەکان ئەوا ئاکامێکی زیانبەخش دەبێت و، سوپاش بەهۆی ئەمەوە لەت لەت دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سوپا بێ کاریگەر بێت و دەولەت نەتوانێت پشتی پێ ببەستێت و ببێتە دەزگایەکی لاوازی هەلوەشاوە. رۆنشتدیش رووچووبووە ئەو بیر و بۆچوونە کۆنانەی کە کۆتاییان پێهاتبوو و رۆژگاریان بەسەرچوو بوو، بۆیە لە زگماکەوە بۆچوونی جیای هەبوو لەگەل گشت شتێکی سیاسی، بەلام سیکت لەو کاتدا هەولیدا بۆئەوەی سوپا لە سیاسەتدا دووربکاتەوە و، کارێکی زۆری کرد بۆئەوەی وا لە هێزی چەکداری ئەلمانیا بکات لەسەرووی حزبەکانەوە بن. بەلام پێویستیشە لە کۆماری ئەلمانیا چەند کەسێك لە سوپا هەبێت لە لووتکە بن و گرنگی بە کاروباری سیاسی بدەن، چونکە چارە نیە و دەبێت بازنەیەکی پەیوەندی لە نێوان سوپای بچووك و حکوومەتی رایخ و پەرلەمانەکەی هەبێت. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چەند ئەفسەرێك لە وەزارەتی هێزە چەکدارەکانی ئەلمانیا بوونیان هەبێ و، خۆیان بە سیاسەت و حزبەوە خەریك بکەن، بەلام ئەوانەش چەند کەسێك بوون و، ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕی.. بەگشتی سوپا و ئەفسەرەکانی دوور لە سیاسەت مانەوە هەتاوەکو لە ماوەی کۆماریش لە نێوان سالانی ١٩١٩-١٩٣٣ . ئەم شێوازەش خراپ نەبوو، چونکە بووە هۆی ئەوەی کۆمار و سوپایەکی هەبێت بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێت.

هەر لەساڵی ١٩١٩ تاکو ساڵی ١٩٣٣ هێزی چەکداری ئەڵمانیا لە زۆربەی کاتەکان تاکە هێزی پاڵپشتی حکوومەتی رایخ بوون، لەو ماوەیەدا ئەو ئەفسەرانەی کە مەیلی کۆن و بیر و بۆچوونی حوکمی تاکڕەوانەی رەهایان هەبوو بە لایەنگری کۆماری مانەوە، ئەمەشیان زیاد لە جارێك سەلماند لەوکاتانەی کە جیاوازی ناوەخۆ روویدەدا، رۆنشتد هەرگیز بۆماوەی دوور و درێژ لەو پلەوپایەیەك کە بیخاتە نێو کاروباری سیاسی نەمایەوە، هەر لە ساڵی ١٩١٩ تاکو ساڵی ١٩٣٣ چ لەدەستەی ئەرکانی گشتی و چ لەیەکە سەربازیەکان پلەی سەربازی رووسی هەبوو کارەکانی رۆنشتد لەو ماوەیەدا لای خوێنەری ئەم کتێبە جێگای گرنگیپێدان نیە، تەنها ویستم بە ساکاری رەوشتی رۆنشتد و لایەنە فکریە گشتییەکانی روون بکەمەوە، نەك پۆلینی مێژووی رووداوەکان بکەم. ئەوەندە بەسە کە بزانی رۆنشتد لە نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٣٣ لە گشت یاخود زۆربەی پلە و پایەکانی دەستەی روکنی گشتی کاری کردووە. بە زۆریش پلەکانی سەرۆکایەتی دەستە گشتییەکانی کردووە نموونەی ئەمانەش تیپی سوارەی سێ لە ناوچەی سەربازی دوو (تیپی پیادەی دوو) و فەیلەقی دوو، هەروەها پلەی سەرکردایەتی یەکە کاریگەرەکانی وەرگرتووە (فەرماندەی یەکە) فەرماندەی کەتیبەی پیادەی ١٨ بووە کە ئەوکات بەشێك بووە لە تیپی سوارەی دووەم. دواتریش بووەتە فەرماندەی تیپی سوارەی دووەم. ئەو تیپەش لە ناوچەی سەربازی سێ (تیپی پیادەی سێ) لە بەرلینی پایتەختی رایخ بووە، پاشان، واتە لە رۆژگاری هیتلەردا بووە فەرماندەی فەیلەقی یەك لە بەرلین (ئەو فەیلەقە لە تیپی پیادەی چوار و تیپی سوارەی دووەم) پێکهاتبوو. لە ساڵی ١٩٣٢ حکوومەتی فۆن (باین) و فۆن(شخلەر) باری نائاسایی راگەیاند، رۆنشتدیش بەنابەدڵی و

بەناچاری بۆ ماوەی چەند رۆژێك دەستی خستە نێو كاروباری ئیداری، بەهۆی پلەكەی كە رۆنشتد لەو كاتەدا لە بەرلین هەیبوو، رۆنشتد ئەم ئەركەش بە رێك و بێگی ئەنجامدەدات و بە زیرەكی و حیكمەتی خۆی كۆنترۆڵی بارودۆخەكەی كرد، هەرچەندە بوارەكە نامۆبوو بە رۆنشتد، شانبەشانی ئەو ماوەیەی لە ساڵی ١٩١٩- تاكو ساڵی ١٩٣٣ بزاڤی نوێ گەشەی دەكرد، ئەو بزاڤەش سۆسیالیستی نیشتیمانی هیتلەر بوو (نازیەت) وا پێویست دەكات ئاماژە بە راستییەك بكەین كە رۆنشتد نەك لە خزمەت كردنی ئەو سوپایە گونجا بوو و رازیش بوو، بەڵكو مەیلێكی تایبەتیشی هەبوو بەرامبەر ئەو سوپایە كە لەلایەن ژمارە و چەك و تفاقەوە متەوازع بوو. ئەو سوپایە لە چەند یەكەیەكی هەڵپاچراو پێكهاتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش باشیەكەی لەوەدابوو كە كەسەكانی ئەو سوپایە بۆ ماوەی دوور و درێژ خۆبەخشانە بڕیاری خزمەتی سەربازیان دابوو، هێشتا ئەو سوپایە لە سەرەتای دامەزراندنی بوو یەكگرتوویی پێوە بەدیار كەوت. هەروەها گونجانێكی باش لە نێوان ئەو ژمارە كەمەی ئەفسەرەكاندا هەبوو كە دوای ساڵی ١٩١٨ لە نێو باشترین ئەفسەرەكان هەڵبژێردرابوون. هەروەها ورەیەكی بەرز باڵی بەسەر یەكەكانی سوپادا كێشابوو. بەمجۆرە رۆنشتد ئاواتەكانی هاتە دی، چونكە ئەم شێوازە لەگەڵ بیر و باوەڕەكەی دەگونجا كە تەنها وەك سەربازێك بمێنێتەوە و سیاسەتیش بۆ خاوەنەكانی جێبهێڵێت.

## بەشی سێیەم

### سوپای نوێ

گرنگە بەر لەوەی بە لێکۆڵینەوە باسی ئەو سوپا نوێیە بکەین کە خەریك بــوو دادەمــەزرا، چــاو بــە هەنــدێك گرفــت دابخشــێنین کــە لەئــەنجامی گەشەســەندنی سۆســیالیزمی نیشــتمانی و هــاتنی هیتلــەر بۆســەر حــوکم دەرکەوت.

هیتلــەر خــودی خــۆی کاســۆلیکیەکی نەمســاوی بــوو، کورتــە بــالا بــوو، نەناسراو بوو، بۆیەکەم جار لە ساڵی ١٩١٢ لە ڤێنناوە هاتــە میونــخ بــەبێ ئەوەی ئەم هاتنەی هیچ دەنگێکی لێبکەوێتەوە، لە میونخ ژیانێکی سادە و ســاکار دەژیــا، کــاتێکیش جــەنگی یەکــەمی جیهــانی لــە ســاڵی ١٩١٤ هەڵگیرسا هیتلــەری نەمساوی بــە خۆبــەخش چــووە نێــو سوپای باڤــاری پاشــایەتی (ئــەڵمانی) ، نــەوەك بــۆ نــاو ســوپای نەمســا یــاخود ســوپای مەجەری ئیمپراتۆری کۆن.

لە کەتیبەی یەدەکی پیادەی نۆزدەی باڤاری بووە سەرباز، بــە درێـژایی جەنگەکەش وەکو سەربازێك لە هێڵەکانی پێشەوەی جەنگ خزمەتی کرد.

وەك هەندێ لــە هــاورێ دێرینــەکانی دەگێڕنــەوە کــە هیتلــەر ســەربازێکی ساکار بوو بــەڵام ئــازا بــوو لــە هــەموو دەوریەیــەك خــۆی بــەخش دەکــرد، هەروەها زۆر حەزی لە سەربازی بوو، هەرچەندە پیشــەی پێشــووی خــۆی تەلارسازی هونەری بوو. شتێکی سەرسوڕهێنەرە بەو هەموو ئازایەتییــەی کە لەماوەی چوار ساڵی جەنگ نەیتوانی پلەی (زابــت ســەف) بــە دەســت بێنێت.

دواجار بە پلەی سەربازی یەکەم (جندی اول) لەسەر میلاکی دەستەی بارەگای کەتیبەی یەدەکی شانزە دامەزرا، لەگەڵ ئەوەش بەهیچ جۆرێ پلەی زابت سەڤ وەرنەگرت، بەڵام میدالیای خاچی ئاسنینی لە جۆری یەکەم و دووەم و شریتی برینداری پێبەخشرا. شتێکی خۆشە ئەوە بزانین کە هاورێ سەربازەکانی کە لە جەنگدا لە تەکیا بوون زۆر چیرۆکی خۆشی دەربارەی دەگێڕنەوە، کە زۆرجار بەرگی شەیتانی سیاسەتی لەبەرکردووە و، هاورێکانیشی قەشمەریان بێگردووە، چونکە نەیانتوانیوە هیچ شتێك لە بیر و بۆچوونە سیاسیەکانی هەڵێنجنن کە بە دیدی ئەوان بۆچوونێکی شێتانە و سەراسیمە بوو، یاخود بەهۆی ئەوەوە بوو کە خۆیان حەزیان لە سیاسەت نەکردووە. رەنگە هەر بەهۆی ئەو جۆرە قسەکردنە بێت دەربارەی سیاسەت وای لە سەرکردەکەی کردبێت بۆ پلەی گەورەتر نەیپالێوێت و نەیکاتە (زابت سەف) هەرچەندە رێزێکی زۆری لە ئازایەتی و مەردایەتی هیتلەر دەنا بەتایبەتیش لەکاتی رووبەڕوو بوونەوەی مەترسیدا.

بۆ دووەم جار لە ساڵانی ١٩١٨-١٩١٩ لە میونخ هیتلەر وەکو سەربازێکی خانەنشین لە سوپا ناوی دێت بەبێ ئەوەی ناسراو بێت یاخود پلە و پایەکی هەبێت، ئەمەش لەسەردەمی حوکمی دیکتاتۆری (ئەیسنەر) ی شیوعی بوو. کە ماوەیەکی کەم بە زەبری هێز لەسەر بەرنامەی بەلشەفیەکان حوکمی کرد. ئێرەش خاڵی دەستبێگی هیتلەر بوو بۆ هاتنە ناو سیاسەت. کە لەو مێژووەوە بەهەموو هەست و ئارەزووەکانی دژایەتی شیوعیەت و بەلشەفیەکانی کرد لە دڵەوە. مەبەست لەم کتێبە ئەوە نییە باسی چۆنیەتی گەشەسەندنی سۆسیالیزمی نیشتیمانی (نازیەت) بکەین. بەڵام لەهەمان کاتیشدا پێویست دەکات بە کورتی باسی کرۆکی ئەو

پاڵنەرە بکەین کە ئەڵمانیای گرتبۆوە و وایکردبوو رۆنشتد و هاوڕێکانی رووبەڕووی زۆر ناخۆشی و باری قورس ببنەوە. هیتلەر لە میونخ توانی حزبێکی سیاسی بچووك بە دەست بێنێت و نەتەوایەتی و سۆسیالیست بێگەوە گرێبدا، ئەوەش بە لەدەستدانی هەندێك ئیمتیازی کۆمەڵایەتی کە لایەنگرانی نەتەوایەتی پێی ناسرابوون و،هەوڵدان بۆ دەستەمۆکردنی توێژی کارگەران بۆئەوەی لەتەك دەوڵەتدا بن. لە بارودۆخ و رەوشی ئەو سەردەمدا زۆر هۆکاری گرنگ هەبوون بۆ سەرکەوتنی ئەو بنەمایانە. چونکە ئەڵمانییەکان بە ئارەزوو و خۆشی خۆیان جیهانێکی پڕ خەیاڵ و ئەندێشەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو، بەجۆرێك نقوومی ژێر وەهمی بانگەشەی حوکمی رەهای ئیمپراتۆریەتی پێشوو بوو بوون بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریەکیان لەسەر بنەمای سیاسەتی راست هەبێ. پاش ئەوەی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی ژێر کەوت، ناچاربوو حوکمی رەها "کە ساڵەهای ساڵ بوو پەیڕەو دەکرا" بگۆڕێت بە حوکمی کۆماری دیموکراتی، کە لەو سەردەم شتێکی نادیار و تێنەگەیشتووبوو. هەروەها بەهۆی دابەشبوونی رایخ بۆ چەند حزبی دژ بەیەك و بوونی چەند لایەنێکی ناوخۆیی ئامانج جودا جودا بووە هۆی ئەوەی رایخ بکەوێتە بەردەم پارچە پارچە بوون، بەهۆی ئەو هۆکارە ناوەخۆیی و دەرەکیانە. هەروەها لەگەڵ توند بوون و فشاری رۆژ لە دوای رۆژ ئەزمەی پیشەسازی و سەرهەڵدانی گرفتی هەڵئاوسانی دارایی و دارمانی باری ئابووری ئەڵمانیا لە ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٣، هەموو ئەوانە بوونە هۆی روودانی سەرهەڵدان لە گشت لایەکی ئەڵمانیا، کە لەلایەن کەسانی رادیکاڵەوە ئاسانکاریان بۆ دەکراو ویزە ویزی گوللەی رەشاشیش رووخساری ئەڵمانیای ناشرین کردبوو، لەگەڵ ئەوانەی باسمانکرد گەلی ئەڵمانیاش بە

پەیماننامەی ڤرسایل ساڵی ١٩١٩ فریویـان خواردبـوو، چـونکە پـەیمانیان پێ دابوون بە هەندێك مەرجی دیاریکراو بە گوێرەی چواردە بەندە بـەنێو بانگەکـەی (ویلسـن) ی سـەرۆکی ئەمـەریکا برێکـی بـاش سەربەسـتی و ئازادیان بۆ دەستەبەر بکـەن و، حکوومـەتی رایخـیش بانگەشـەی بۆ ئـەو ئازادیە دەکرد کـە پـەیمانیان بـە خەڵکەکـە دابـوو، بـەڵام بـە شـێوەیەکی کتـوپڕ دەرکـەوت کـە ویلسـن لـە جێبـەجێکردنی نیازەکـەی لـە پـەیمانی ڤرسایل سەرکەوتوو نەبوو، لە ئەنجامی ئەمەش لە زۆر شـوێن تـاڵی و بـێ ئومێدی بـاڵی بەسـەر پـەیمانی ڤرسـایل کێشـا. وەك زۆر بـاش زانراویشـە سەرۆکی رایخ خودی خۆی تووشی بێ ئومێدی و شۆکێکی ئێجگار گـەورە بوو. بەمجۆرە بۆ کۆماری ئەڵمانیای نـوێ زۆر زەحمـەت بـوو بتوانێـت بـە هێزێکی گەورە رووبەڕووی ئەو هەڵوێسـتە ببێتـەوە. ئەمـەش هۆکـار بـوو بۆئـەوەی ملیۆنـان کەسـی شـیوعی و کەسـانی دیکـەی نەتـەوەیی بـەرەو رادیکالیـەت بچـن، بـەڵام هەڵسـوکەوتی هـەر کەسـێك لەوانـە بـە گـوێرەی شێوازی تایبەتی خۆی بوو.

هیتلەریش لەناو ئەو تەوژم و بۆچوونە کۆمەڵایەتیە نوێیانە بـوو ساڵ بـە ساڵ لەناو خزمەت بەجدی کاری دەکرد تا شوێن پێـی خـۆی قـایم بکـات، لەگەڵ ئەوەی لە چەند هەڵبژاردنێکیش شکستی خواردبـوو. دەتـوانین بـە شـێوازێکی گشـتی بڵـێین: هیتلـەر بـە بـەردەوامی لـە سـەرکەوتنێك بـۆ سەرکەوتنێکی دیکە هەنگاوی دەنا، سەرەتاش سۆسـیالیزمی نیشـتیمانی لە میونخ بڵاوبۆوە دواتـریش بـۆ بـاکوور درێـژبۆوە و نـورمبرغ و بـاکووری بافاریاش کۆنترۆڵ کـرا. بـە سـەرکەوتنیش بـۆ سـەر چـیای (سـیورنجیان) جێی پێی خۆی لە (سورنجیا) کردەوە، پاشان توانرا بە زەحمـەتی و بـە هێواشی دەست بەسەر باکوور و رۆژئاوا و رۆژهەڵات بگیرێت.

ئەڵمانیای باکوور کە بە تێگەیشتنی دروست و واقیعی و تایبەتمەندی خۆیەوە بەناوبانگە بۆ ماوەیەکی درێژ بە هەڵوێستێکی سلبی و نا دڵنیایی بەم ئاڕاستەیەوە مایەوە. هەرچۆنێك بێت هیتلەری نەمساوی بە غەریزەی خۆی باش لەوە گەیشتبوو کە بۆ دەست بەسەرداگرتنی تەواوی ئەڵمانیا پێویست دەکات بڕووسیا بۆ لای خۆی رابکێشێت. لەو کاتیش (بەرلین) بە (سەر) و (میونخ) یش بە (دڵ) وەسف دەکران. هیتلەر بەردەوام بوو لە قایم کردنی زیاتری جێ پێی خۆی لە پێناو ئەو دۆزەی کە کاری بۆ دەکرد.

جارێك بە خۆشی و چەند جارێکی تریش بە شەڕ و ناخۆشی. تاکو ساڵی ١٩٣٣، هەروەها سەرنجی چینی کرێکارانیشی بۆ لای خۆی راکێشا، کە گرنگی ئەمەش لەوانی تر کەمتر نەبوو، وا دیارە لە یادکردنیش پەردەی خۆی داپۆشی لەوەی کە هیتلەر لەو کاتەدا چۆن پیاهەڵدانی بە جۆش و خرۆشی بۆ دەکرا.

رەنگە ئەگەر ئەڵمانیا کەمێك ئازادی بڕەخساندایە بۆ گەلەکەی ئەوا دەستەڵاتێکی دیموکراتی سەریهەڵبدایە و سۆسیالیزمی نیشتیمانیش هەرگیزا و هەرگیز دەرنەکەوتبایە و هیتلەریش هەر بە نەناسراوی بمایەتەوە هەتاکو ئەگەر لە پێش یان لە دوای ٣٠ ساڵیش لە دایك بووایە. پێویست دەکات لەسەرمان بە جوانی چاو بخشێنین بە تەواوی تەوەرەی لێکۆڵینەوەمان.

کەسێك نییە بەرگری لە دیاردە خراپ و نازانستییەکانی رژێمی هیتلەر بکات، بەڵام کارێکی هەڵەشە گەر وا بزانین رژێمی ناوبراو هیچ لایەنێکی باشیشی نەبووە.

زۆرینـــەی زۆری کرێکـــار و ژمارەیـــەکی زۆری جوتیـــاران و قوتابیـــان و هونەرمەنـــدان بڕوایـــەکی تـــەواویان بـــە هیتلـــەر هێنـــابوو، لـــە راستیشـــدا ئەڵمانیەکان لە بواری کۆمەڵایەتی بەرهەمێکی زۆریان دەست کـەوت، ئـەو دەستکەوتەی ئەمڕۆکە جیهانی ئەمڕۆ بە دوایدا وێڵە و دەیەوێت بیگـاتیٚ، بەمجۆرە دەبینین ئەو رژێمە تەنها خراپە و شەڕ نەبوو.

هەروەها لە ساڵی ۱۹۳۳ کاتیٚ سەرۆك (هندنبێرگ) ی پایە بەرز و رابردوو گەش پاڵپشتی لە هیتلەر کرد، جەماوەری ئەڵمانی خۆشی و شادی خۆیان دەربڕی، ئەوکات بڕوایەکی وا لە ئەڵمانیا بڵاوبووبووەوە کە هەموو شتێك بە باشترین شێوە لـەو بارودۆخـەدا بـەرەو تـەواوبوون دەچێت. گـەر لـەو سەردەمەدا کۆماری ئەڵمانیا لەلایەن سۆسیالیزمی نیشتیمانییەوە هەستی بە مەترسی بکردایە، ئەوا وا پێویستی دەکـرد بـە گـوێرەی دەسـتوور لـە کاتێکی گونجاو تەدبیری وەربگرتبایە بۆ لەناو بردنـی، چـونکە بەشـی ٤٨ ی دەستووری رایخ ئەوەی رەخساندبوو و پێداویستی پێویستیش بۆ ئەمە لەبەر دەستدا بوو، ئەو پێداویستیانەش بریتی بوون لە بـوونی سـوپایەکی جێی باوەڕ و هێزی پۆلیسی بە توانا. بەڵام لەوکاتدا مـەفهومی بنەمایـەك بڵاوبووبووەوە وای لە دیموکراسیەت دەخواست ئـازادی بـدرێت بـە گشـت حـــزب و لایـــەنێك. بـــەم جـــۆرە بـــوار بـــەم بزوتنەوەیـــە درا بـــەبیٚ بەرهەڵستیکردن گەشە بکات و بـەردەوام بێـت. لـە سـاڵی ۱۹۳۳کـات زۆر درەنگ بوو بۆ بەرەنگاربوونەوە و بەرهەڵستی کردنی، هیچ گومانیش نەما لەوەی زۆرینەی زۆری ئەڵمانـەکان بـڕوای تـەواویان بـە بنـەماکانی حزبـی هیتلەر هێنا. ئەو قۆناغەش وای پێویست دەکرد لەسەر حکوومەتی رایـخ، هەرچۆنێك بێت واز لە بەکارهێنانی سوپا و پۆلیس بهێنێـت، گـەر بیـەویٚ رووبـەڕووی بەرگرییـەکی بـەهێز نەبێتـەوە لەلایـەن گەلـەوە. باشـترین

ڕوونکردنەوە بتوانین بیدەین سەبارەت بەو ئاڕاستەیەی کە ئەوکات بەربڵاوبوو ئەوەیە کە هیچ هەوڵێك نەدرا بۆ پاراستنی کۆماری ئەڵمانیا، چونکە لەو کاتەدا لە توانای سوپایەکی بچووکی ١٠٠ هەزار کەس دانەبوو ڕووبەڕووی بزووتنەوەیەکی وا بەربڵاوی گەلێك ببێتەوە کە خۆی لە ٦٨ ملیۆن کەس دەدا. ئەگەر بهاتایەش حزبی هیتلەر ڕووبەڕووی سوپا بووبووایەوە کە لەلایەن سیاسیەکانەوە سەرپەرشتی کرا، لەوانەیە لەلایەن خەڵکەوە هێرش بکرایەتە سەریان و سەرکردەکان تاوانباربکرانایە بە تاوانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئیرادە و ویستی گەل. ئەگەر حکوومەت نەیتوانی بووایە بڕیار بدات و بە کردەنی تەدەخول بکات و هێزی پۆلیس و سوپا بەکاربێنێت، ئەوا بە بێ گومان سوپاش لە خۆوە و بەبێ فرمانێکی حکوومی بەرگری لەو کیانە نەدەکرد. لە ساڵی ١٩٣٠-١٩٣٢ ئەو هەست و بڕوایە بەربڵاوبوو کە خەریکە کودەتایەکی سەربازی لەلایەن سوپاوە ئەنجام بدرێت، چونکە سروشتی ئەوکات وای دەردەخست کە سوپا کارێکی چاك ئەنجام دەدات، بەڵام حکوومەت هیچ هەستی نەدەکرد کە مەترسی لەسەر هەیە.

بەم شێوەیە هیتلەر سەرکەوتووبوو لە گەیشتن بە حوکم پاش خەباتێکی سیاسی پڕوکێنەر، لەواقیعیش سەرکەوتنێك بوو بۆ پیاوێك کە لە ساڵی ١٩١٩ لە سفرەوە دەستی پێکردبوو.

لیوا ڕوکنی پیادە فۆن ڕۆنشتد لە ساڵی ١٩٣٢ لە بەرلین بە فەرماندەی گشتی هێزەکانی سوپای یەك دامەزرا کە تیپەکانی پیادەی یەك و دوو و سێ و چوار و هەردوو تیپی خەیالەی (سوارە) یەك و دووی دەگرتەوە، ڕۆنشتد تاکو ساڵ ١٩٣٩ لەو پلەوپایەدا مایەوە، واتە بۆماوەی زیاتر لە ٦ ساڵ. هەرچەندە وەکو پێش ئەوکات واباوبوو هیچ کەس بۆ ماوەی زیاتر

لە دوو ساڵ لە پلەیەدا نەدەمایەوە. ئەمەش ئەوە بە دیار دەخات کە تارادەیەکی زۆر سەرکردەکان ڕێزیان لە ڕۆنشتد ناوە. بەڵام ئەو پلەیە ئەرکێکی تایبەتیشی خستبووە سەر شانی ڕۆنشتد، چونکە بەرلین پایتەختی رایخ شوێنی چاوبێکەوتن و بەیەکگەیشتنی کەسایەتی سیاسی و زانستی و پیشەسازی و هونەر بوو، هەروەها باڵوێز و نێردراوە سیاسیەکانیش لەوێ نیشتەجێ دەبوون. فەرماندەی گشتی سوپاش ئەوکات فەریق (بارۆن فۆن فرتیش) بوو کە ئەفسەرێکی دیاربوو، ژنیشی نەهێنا بوو. سەرۆکی ئەرکانی سوپا ژەنڕاڵ (بێك) ی بە توانا بوو، بەڵام بە حوکمی ئەو پلە و پایەی کە هەیبوو نەیدەتوانی بەرپرسیارەتی فەرماندەی گشتی هەڵبگرێت، لەگەڵ ئەوەش تەنها بۆ ئەرکە سەربازییەکانی دەژیا و هەروەك چۆن خانەنشین کرابێ و هاوسەری لەدەست دابێ وابوو، هەموو ئەوانەش وای لە ژەنڕاڵ (بێك) کرد هیچ کاریگەری و هەیمەنەی لەسەر دەزگا سەربازیەکان نەبێ، لەبەر ئەم هۆیە پێویست بوو لەسەر فۆن ڕۆنشتد لە ماوەی ئەم ٦ ساڵەدا پێشوازی لەماڵەکەی خۆی بکات لە کەسانی دبلۆماسی و نێردراو و باڵوێزی سیاسی و سەربازی، بۆیە لە زۆر وڵات ناسراو، ناوی دەهات. لە ساڵی ١٩٣٢-١٩٣٨ ڕۆنشتد زۆرجار داوای خانەنشینی دەکرد، بەڵام ئەو ئارەزووەی هەمیشە ڕەت دەکرایەوە، دواجار لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٨ داواکارییەکەی کە ماوەیەکی زۆری خایاند قبووڵ کرا پلەکەی بەرزکرایەوە بۆ فەریق و خانەنشین کرا. بەمجۆرە گەڕایەوە ژیانی تایبەتی خۆی لە (کاسڵ) بەو هیوایەی ئەو تەمەنەی کە ماویەتی لە شوقە یەك نهۆمیە بە کرێیەکەی بژیت، بەڵام ئەو ئارەزووەشی بۆ نەچووە سەر، لێرەدا پێم گونجاوە وەسفی بارودۆخی سەربازی لە ساڵی ١٩٣٣-١٩٣٨ بکەم، لەو ساڵانەدا

خەریکی بنیاتنانەوەی سوپا بوو، رۆنشتد بەو سیفەتەی ئەفسەرێکی بە ئەزموون بوو یەکێك بوو لەو سەرکردانەی کە ئاگاداریان دا لەوەی سوپای نوێ بە شێوازی سیحری لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا دابمەزرێ.

گومانی تێدانیە کە دەتوانرا لە ماوەی چوار ساڵدا ژمارەی سوپا لە ١٠٠ هەزارەوە بکرێتە ٦٠٠ هەزار کەس، بەلاَم تەنها بە رواڵەت و بە ژمارە دەبوو. دیاریکردنی کۆمەڵێك ئەفسەری بە توانا و بە هێز، یەك بیر و باوەڕ و دروستکردنی سوپایەکی پێشکەوتوو لە هەموو لایەنێکەوە، نەدەتوانرا لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا بێتە دی. بۆیە ئەرکی هەر ئەفسەرێك بوو هەرچەند هەستی بە نامورتاحی بکردبایە لە خێرایی دروست کردنی سوپا، بە گوێرەی توانا هەوڵبدات و کاربکات بۆ بنیاتنانی ئەو سوپایە، پێویست بوو لەسەر فەرماندەی گشتی فۆن رۆنشتد فەرماندەی فەیلەقی یەك کە لە ناوچەیەکی بەرفراوان بلاَوبوو ساڵ بە ساڵ یەکە سەربازیەکانی بپشکنێ. بە دەرکەوتنی ئەو سوپا نوێیەش کە لە هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا پەیدابوو، چوار تیپی پیادە و دوو تیپی ئەسپ سواری کە فەیلەقی رۆنشتدیان بێگدەهێنا. گەشەیان کرد و بوونە چەند فەیلەقێك. بەمەش بە خێرایی ئەرکەکانی فەرماندەی گشتی زیادی کرد. جگە لە ئەرکە دیارەکانی، گەڕان و مانەوە و مەشقیشی بە سەربازان دەکرد. ئەمەش مێژووی رووداوە سەرەکیەکانە،

١- ساڵی ١٩٣٥ : گەڕانەوەی خزمەتی سەربازی زۆرەملێ بۆ ماوەی یەك ساڵ.

٢- ساڵی ١٩٣٦ : دووبارە کۆنترۆڵکردنی ناوچەی راین و درێژکردنەوەی خزمەتی سەربازی زۆرەملێ لە یەکەکانی سوپا لە ساڵێکەوە بۆ دوو ساڵ.

٣- ساڵی ١٩٣٨، هاتنی ئەمسا بۆناو رایخ.

٤- ساڵی ١٩٣٨ جولانەوە بۆ خاك (سودیت) .

٥- ساڵی ١٩٣٩ مەحمیەی بۆهیمیا کرایەوە و (ممل) یش خرایە سەر رایخ، کە ئەڵمانیا ساڵی ١٩١٩ وازی لێهێنابوو.

ئەم رووداوانەش، پێشتر چەندین ئاگاداری لەلایەن ئەفسەرە پایە بەرزەکان، بەتایبەتیش (بێگ) بڵاو دەکرایەوە. ئەمەش بە رێکی بەرهەمی پێگەیشتووی دەدا بە دیاردە دڵفرێنەکانی ئەڵمانیا بێ ئەوەی ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە. بەمەش هیتلەر راست بوو، سەرکردە سەربازیەکان هەڵەبوون، چونکە هیچ شتێك لە ئاگاداریەکانیان نەهاتەدی. فەرمانداری گشتی و سەرۆکی ئەرکانی سوپا و سەرکردە کۆنەکان لە هەڵوێستێکی دژواردابوون. چونکە رۆژ دوای رۆژ رەشبینتر دەبوون. بەمجۆرە دڵەڕاوکێ لە نێوان سەرکردە سەربازی و سەرکردە نازیەکان زیادی کرد، ئەو دڵەڕاوکێیەی کە پێشتریش تۆوەکەی بوونی هەبوو لە نێوان هەردوو لایەن. سوپای نوێ ژمارەیەکی بەرچاو ئەفسەری گەنجی تیا بوو کە سۆزێکی زۆریان بۆ بیر و بۆچوونەکانی هیتلەر هەبوو. بەمجۆرە ململانێیەکی بەردەوام لە نێوان کۆن و نوێ دروست بوو. ئەو ململانێیەی کە سوپا زاڵ نەدەبوو بەسەریا ئەگەر بە مەشق و کۆنترۆڵی نەریتەکان و رێکخستن نەبووایە، بەڵام زیادبوونی خێرای ژمارەی ئەفسەرەکان لە چوار هەزارەوە بۆ چەندین هەزار، بووە هۆکاری هاتنە ناوەوەی ژمارەیەکی گەورە لە ئەفسەری کەم توانای یەدەك، لەوانەی کە هاتبوونە ناو سوپا تەنها بۆ پڕکردنەوەی کەمی ژمارە، ژمارەیەکیش بە درێژایی ماوەی پێشووتر خانەنشین کرابوون و ژیانی ئاسایی خۆیان دەژیان، ئاکامی

ئەوەش بووە هۆی ئەوەی سوپا بە تەواوی جیاوازبێت لەگەڵ ئەوەی ساڵی ١٩٣٥. لە ساڵی ١٩٣٣ تاکو ساڵی ١٩٣٨ هیچ شتێك رووینەدا ببێتە هۆی سەرهەڵدانی جەنگ، هەر جموجۆڵێك کە بووە هۆی دەست بە سەرداگرتنی چەند شوێنێك زۆربەیان تەنها جموجۆڵ بوون و هیچ خوێنی تیادا نەڕژا. لە راستیشدا ئەو بزوتنەوانە لەلایەن دانیشتوانەوە پێشوازی گەرمی لێکرا، چونکە رەوتە نهێنییەکان لە شوێنە دەست بەسەرداگیراوەکان هەمیشە کاریگەری مەزنی هەبوو، لەبەر ئەم هۆیە خەڵك ئەم پرۆسانەی ناوزەند کرد بە: جەنگی گوڵ، بەهۆی ئەوەی سوپای ئەڵمانیا بە گوڵ و مۆسیقا پێشوازیان لێدەکرا. جگە لە داگیرکردنی ناوچەی (جەگ) لە بوهیمیا نەبێت. گومانیش ناکەین کە هیتلەر وا بیری دەکردەوە کە دەست بەسەردا گرتنەکانی دیکەش هەمان ئەنجامی دەبێت.

رۆنشتد تەنها لە دەست بەسەرداگرتنی ناوچەی (سودیت) لە پایزی ساڵی ١٩٣٨ بەشداری کرد، کەوا سوپای دووی ئەڵمانیای لە بەرەی سەرەکی (جەگ) بەکارهێنا کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد، واتە دژی قەڵابەندی لە (ترۆبۆ و جاکرندۆرف)

سەرۆکی ئەرکانی سوپا لە نێوان ساڵانی ١٩٣٢-١٩٣٣ کە ژەنراڵ فۆن هامرشتین بوو، لە پلەکەی وازیهێنا، بەهۆی ئەم وازهێنانەش فۆن رۆنشتد داوای لە فۆن هندنبێرگ کرد کە خانەنشینی بکات، بەڵام لە خزمەت مایەوە بەهۆی قبوڵکردنی تکای سەرۆکی شکۆداری رایخی بەناوبانگ، کە هندنبێرگ پێی گوت: پێویستە لەو کاتەدا بەتەنیا جێم نەهێڵی. زیاد لەمەش رۆنشتد پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ ژەنراڵ فۆن شیخلەر هەبوو، لەو کاتەی کە شیخلەر بۆ ماوەیەکی کورت پلەی سەرۆکایەتی وەزارەتی

رایخی وەرگرت، داوای لە رۆنشتد کرد لەو کاتەدا واز لە خزمەت کردن نەهێنێت، چونکە نیشتیمان پێویستی بە تەواوی کەسانی بەتوانا هەیە. هەوڵدانی (رۆهم) لە ساڵی ١٩٣٤ بۆ کودەتا کردن، تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ هێزی سەربازی ناوەخۆ. بەڵام ئامانجەکانی وەکو چەندین ئامانجی دیکەی نادیار و پەنهان بوو. رۆهم ویستی رەوتی نوێی دیکە بخاتە نێو حزب بە یارمەتی رێکخراوی (کراس کورتە ئەسمەرەکان) بۆیە وەکو بەرهەڵستکارێکی بەهێز دژی پیاوانی سوپا راوەستا. بەتایبەتیش دژی سەرکردە سەربازیە کۆنەکان کە رۆنشتدیش یەکێك بوو لەوان. نیازی رۆهم لە رێکخستنی ئەم سوپایەدا کە بێلایەن بوو لە خواست و بۆچوونە کودەتاییەکان، ئەمەش بە فراوانکردنی سوپای S. A (کراس کورتە ئەسمەرەکان)، تاوەکو وا دەردەکەوت کە سوپایەکی دیکەیە و کێبڕکێی سوپای راستەقینە دەکات. زۆرجار ناکۆکی و ناخۆشی و شەڕکردن لە نێوان کەسانی ئەو رێکخستنە نوێیە و کەسانی سەر بە سوپا روویدەدا، چونکە سوپا هەستی دەکرد کە بە بوونی ئەو رێکخراوەیە ئابڕووی دەچێت. چونکە سوپا خۆی وادادەنا کە تاکە هێزە بۆ سیاسەتکردن و میراتگری سەرەکیە بۆ هەڵگرتنی مەشخەڵی سەربازی لە نێو گەلی ئەڵمانیا، هیتلەریش زۆری هەوڵدا بەتکا کردن ئەم دڵەڕاوکێ و ئاژاوەیە کەم بکاتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لەم کارەیدا. کاتێك هیتلەر ویستی رۆهم بەهێز دابمرکێنێتەوە بۆی دەرکەوت سوپا لایەنگری لێدەکات. هەروەها کاتێك بەڵگەنامەکانی رێکخراوی S.A دەستی بەسەر داگیرا، لیستێك کە ناوی ئەفسەرە کۆنەکانی تیابوو، وا بڕیار بوو ئەگەر بزووتنەوەکە سەرکەوتوو بوو لە کودەتاکەیان، ئەوا ئەو ئەفسەرانە دوورخەنەوە لە سوپا.

ئاواتی ڕۆهم ئەوەبوو کە ئەفسەرە لاوەکان لایەنگری بکەن، گومانیشی تیادا نییە کە ژمارەیەکی کەم بڕوایان بەو فەلسەفەیەی حزب هەبوو، بەڵام زۆربەی زۆری ئەو ئەفسەرە نوێیانە بڕوایان بە ئاڕاستەکانی سوپای تەقلیدی هەبوو. ساڵی ١٩٣٤ تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ بە هێزی پەیوەست بوونی ناوەخۆیی سوپا، ئەو پەیوەستییەی کە دوای ئەو مێژووەش بە پتەوی مایەوە. هەرچەندە دیاردەی دەرەکی لەو ماوە نوێیە دەرکەوت بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەلماندرا کە نەریت و مەشق و ڕێکخستن و ئاڕاستە، واتە دروستکردنی سەرباز لە باشترین شێوازیدایە و هەر بەهێز و پتەوی ماوەتەوە، پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین کە سەرۆکی ئەوکاتی رایخ (هندنبێرگ)ی پیربوو کە ئەڵمانیەکان پێش ساڵی ١٩٣٣ بە گوێرەی دەستووری ئەڵمانی دووجار هەڵیانبژاردبوو. لەو سەردەمدا هندنبێرگ هەرچەندە پیر و بەتەمەن بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەش بوو بووە ڕەمزی زۆرێك لە خەڵکەکە.

بۆیە جێی سەرسوڕمان نەبوو کە پیاوانی سوپا بە فەرماندەی سەربازی ڕاستەقینەی خۆیانی بزانن. کاتێکیش هندنبێرگ کۆچی دوایی کرد، لەلایەن زۆر کەسەوە وا دانرا کە دوایەمین ڕەمزی سەربازی لەبەرچاوان ون بوو. لەو کاتەدا هیتلەر بووە فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیای یەکگرتوو، هێزە چەکدارەکانیش سوێندیان خوارد وەلایان بۆ هیتلەر هەبێت. دڵەڕاوکێ لە پەیوەندی نێوان سەرکردەکانی سوپا و پیاوانی حزب لە ئاکامی جیاوازی بیر و بۆچوونەکان بوو، هەروەها سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی هیتلەر لە دەرەوە، بووە هۆی ئەوەی سەرکردە سەربازیەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە هەڵوێستێکی تەنگ و

ناخۆشدابن، چونکە ئەو سەرکەوتنە رووکەشانە وای نیشاندا کە هیتلەر هەمیشە لە بڕیارەکانی لە راستی نزیکە و، سەرکردە و دەستەی ئەرکانیش هەمیشە لە بڕیاردانەکانیان هەڵەن، هەروەها جەماوەریش ئەو سەرکەوتنە خێرایانەی دەبینی بەڵام لە ئاکامەکەی نەدەگەیشت. بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتەی ناوەخۆی سوپا لە سالآنی (١٩٣٥-١٩٣٩) جیاواز بوو لەو پێکهاتە ناوخۆییەی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانی کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی پێکهات. توانای سوپای ئەڵمانیا بەهۆی گەشەی خێرایەوە تا رادەیەکی زۆر کەم بووبووەوە و، ئەفسەرەکان وەکو یەکەیەکی هاوچەشن نەمابوونەوە، وەك ئەوکاتەی کە سوپای ئەڵمانیا ژمارەی کەم بوو. ماوەی نێوان سالآنی ١٩٣٣-١٩٣٩ ماوەیەکی کودەتایی بوو هەروەها لە ناوەخۆش دڵەڕاوکێ هەبوو لە گشت بوارەکانی سیاسی و ئابووری و جەماوەری. سوپاش بەرەو پیری بنەماکانی نازیەت ملی دەنا، ئەمەش جێی سەرسوڕمان نیە، چونکە سوپاش بەشێکە لە گەل، لە ساڵی ١٩٣٨ یاداشتی لیوا (بێگ) سەرۆکی ئەرکانی سوپا هاتە کایەوە، چونکە فەرماندەی گشتی سوپا فەریق (فۆن براوچش) و لیوا (بێگ) سەرۆك ئەرکانی سوپا سیاسەتی هیتلەریان بە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە قەبوڵ کرد، چونکە دەترسان ئەو سیاسەتەی هیتلەر بەرەو شەڕیان ببات دژی هاوپەیمانە بە هێزەکان، ئەو دەرفەتەشیان بۆ نەڕەخسا تاوەکو رەخنە لەو سیاسەتە بگرن، لەبەرئەوەی ئەوان پیاوی سوپان و وەك پیاوانی سوپای وڵاتانی دیکەش دەبێ بڕیار و وە فەرمانەکانی سیاسیەکان لە گشت بارودۆخێك جێبەجێ بکەن و هەروەها لەبەرئەوەی سیاسیەکانن کە جڵەوی سەرکردایەتیان بەدەستە. بەڵام ئەوان لە دڵەوە هەستیان دەکرد کە مافی ئەوانە و ئەرکی سەرشانیانە لە

بۆچوونەکانیان ئاگاداری هیتلەر بکەنەوە، لەهەمان کاتیشدا دوو دڵ و بە گومان بوون لە راستی هەندێك ئاراستەی سەربازی، چونکە لە ماوەی ٣ ساڵ (١٩٣٥-١٩٣٨) سوپا فراوان کراوە، بە شێوەیەك ژمارەی زۆر لە پێشوو زیاتر بوو، بە جۆرێك کە لە توانای هیچ سوپایەك دانیە بەو خێراییە ژمارەی زۆر بێت بەبێ ئەوەی تۆکمەیی و توانای پێکهاتەی ناوەخۆیی لە دەست بدات. هەروەها وەکو پێویست چەکدارکردنی ماددی راست و دروست نەبوو، کەرەستەی یەدەکیش بۆ شەڕێکی مەزن بەس نەبوو، هەموو ئەوانە وایکرد بێگ لە ساڵی ١٩٣٨ بەو عەقڵیەتە فراوانەی کە هەیبوو یاداشتەکەی پێشکەش بکات. لیوا بێگ ئەم یاداشتەی ئامادەکرد و پێشکەشی فەرماندەری گشتی سوپای کرد. فەرماندەری گشتی سوپاش بانگهێشتنی سەرکردە سەربازیە کۆنەکانی کرد کە بە ناوبانگترینیان فۆن رۆنشتد بوو بۆ کۆبوونەوە لە کۆنفراسێکی گشتی، لە کۆنفراسەکە لیوا بێگ یاداشتەکەی خوێندەوە، هیچ سەرکردەیەك لە ناوەڕۆکی یاداشتەکە نارەزایی نیشان نەدا، بۆیە براوچش پێشکەشی شەخسی هیتلەری کرد. هیتلەریش لە خراپترین لایەنەکانیەوە سەیری دەکرد، بۆیە وایزانی کە ئەمە سەلماندنێکی دیکەیە لەسەر دوو دڵی سەرکردەکان و دەستەی ئەرکانیان، لەبەرئەوە هیتلەر بە توندی ئەم یاداشتەی رەتکردەوە و لیوا (بێگ) ی سەرۆکی ئەرکانی خانەنشین کرد.

ئەم جۆرە رووداوانەش بووە هۆکاری ئەوەی پەیوەندی نێوان سەرۆکی وڵات (هیتلەر) و سەرکردە سەربازیە کۆنەکان ساردی تێبکەوێت، ئەو پەیوەندیە ساردەی نێوانیشیان تاکو پێش دەست پێکردنی جەنگیش هەر بەردەوام روو خراپی بوو. وا دیاردەکەوێت هیتلەر هەمیشە خاوەن و

گەورەی هەڵوێستەکان نەبوو وەك ئەوەی خۆی بۆ جیهان دەردەخست. چونکە لە زۆر بارودۆخ بە وریاییەوە گوێی لە ئامۆژگاری کەسانێك دەگرت کە زۆریان لەخۆ کردبوو دەربارەی کاروبارێك کە پسپۆڕی خۆیان نەبوو. زۆرجاریش بیر و بۆچوونی خۆی گۆڕیوە لە ئەنجامی ڕێشوێنی ئەو جۆرە کەسانە، هیتلەر مکوڕیش نەبوو کە تەنها خۆی یەکلایی کەرەوەی هەڵوێستەکان بێت تەنها لەبەردەم خەڵك نەبێت، ڕەنگە هیتلەر بە تایبەتیش لەو کێشەیەدا نێچیرێك بێت لەبەردەم کاریگەریەکانی ئەو کەسانەی کە ئامادەبوون ئەو جۆرە ئامۆژگاریانە بکەن، بۆیە لە یاداشتەکەی (بێگ) دەرفەتێکی باشیان بۆ ڕەخسا تاکو تۆوی گومان و بێ بڕوایی هیتلەر بە سوپا زیاد بکەن. ئێمە دەزانین لیوا ڕۆنشتد بۆماوەی ٦ساڵ کە سەرکردەی سوپایەك بوو لە بەرلین، دوای ئەو ڕووداوە تکای کرد خانەنشینی بکەن. چەندین هەوڵیدا بۆ ئەم مەبەستە بەلام سەرکەوتوو نەبوو، تا دواجار داواکەی قەبووڵ کرا و، پلەکەی بەرزکراوە بۆ فەریق و نازناوی شانازی (فەرماندەی کەتیبەی پیادەی هەژدە) ی پێدرا کە پێشتر لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦ ئامری ئەو کەتیبەیە بوو بە پلەی عەقید، ئینجا خانەنشین کرا. دوای ئەوە و لەوکاتی جەنگیش هەرگیز بەرگی لیوا یاخود مشیری لەبەر نەکرد، بەڵکو هەمیشە بەرگی ئامر کەتیبەی پیادەی لەبەر دەکرد کە لەسەر شانی پلەی مشیر هەبوو لەگەڵ ژمارەی کەتیبەی ١٨. زۆرجار وا ڕووی دەدا ئەفسەرە گەنجەکان هەڵەیان دەکرد، وایاندەزانی عەقیدە، نەیاندەزانی ئەوەی لە بەردەمیانە ئەوە مشیر فۆن ڕۆنشتدە، مشیر فۆن ڕۆنشتد بە کەیف خۆشی و بێگەنینەوە ڕووبەڕووی ئەم دۆخانە دەبۆوە پاش ماوەیەکی کەم لە بەسەربردنی ماوەی خانەنشینیەکەی لە کاسل دووبارە لە ساڵی

١٩٣٩ بانگهێشتی خزمەتی سەربازی کرایەوە، ئەوەش لەوکاتە بوو کە باری نائاسایی ڕاگەیەنرا، ئەم جارە پلەی فەرماندەی گشتی سوپای باشووری پێدرا لە پرۆسەی پۆڵەندا.

## بەشی چوارەم

### جەنگی دووەمی جیهانی

باسی ئەوەمان کرد کە لێپرسراوان لە فەرماندەیی سوپای ئەڵمانی و لە سەرووشیانەوە مشیر براوچش و لیوا (بێگ) ی داناو دووربین، یاداشتێکی وریاکردنەوەیان لە ساڵی ١٩٣٨ دەرکرد، کە پاڵپشت کرابوو بە هۆکاری سەربازی و سیاسی، لایەنی سەربازی ئەوەبوو کە ئاگاداری درا لەسەر ئاکامی خێرایی چەکدارکردنی سوپای ئەڵمانی لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا. بە پێچەوانەی کە باوبوو لە شێوازی مەشق و فێرکردنی ورد و دروست لە سوپای ئەڵمانیای کۆن. بەمەش سوپای ئەڵمانیا بە شێوەیەك فراوان بوو کە لە توانای خۆی زیاتر بوو، هەموو ئەمەش لەسەر حسابی هێز و توانای هێزەکانی بوو. بەڵام لە بواری سیاسیەوە، ئەو سەرکردانە تێگەیشت کە جیهان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرامبەر ئەو سیاسەتەی ئەڵمانیا دەستەوەستان نابێت و دواجاریش دەبێتە هۆی هەڵایسانی جەنگ، لەگەڵ ئەوەش ژمارەیەکی کەمی سەرکردە سەربازیەکان بڕوایان بەو سیاسەی هیتلەر هەبوو، هەروەها ئەفسەرە گەنجەکانیش لە دڵەوە پێشوازیان لەو فراوانبوونەی سوپا کرد بە بێ ئەوەی بیر لە ئاکامی ئەو فراوانبوونە لەکاتی جەنگدا بکەنەوە، بڕوایان بەو سیاسەتە هێنا. لەوانەیە شتێکی سەیر بێت کەسانێك لە نێو ئەفسەران هەبن دڵخۆش نەبن بە فراوانبوونی سوپا، لەگەڵ ئەوەش نەوەی کۆن لەوانەش رۆنشتد بەمە دڵخۆش نەبوون، بۆیە ئەم نەوە نوێیە لە هەڵوێستێکی دژواردا بوون لە ژێر سایەی ئەو حکوومەتە نوێیە کودەتاچیە کە لە لایەنگری ٦٠ ٪ ی پێگەیشتووان و جەماوەری بەدەست هێنابوو، هیتلەریش لە لایەن

خۆیەوە و لە دواوەشی گەنجەکان نەوەی کۆنیان بە کۆسپ دەزانی و بە دژی کارکردن و رێبازی کۆن ناوزەدیان کردن، هەروەها رۆژگاریش هاوکاری کردن لە نیشاندانی یاداشتی وریابوونەوە لەلایەن سەرکردەکانەوە کە پشت بە راستی نابەستێ، هیتلەریش وەکو بەڵگەیەك سەرکەوتنە زۆرەکانی باس دەکرد. وەکو داگیرکردنی سودیت کە ئەڵمانییەکانی لێ دەژیان بەبێ بەرگری، لەوەش گرنگتر کۆنگرەی میونخ بوو کە هیچ یەك لە بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا ناڕەزاییان پیشان نەدا لەو کۆنگرەیە، رۆیشتن بەرەو چیکسلۆڤاکیا لە بەهاری ١٩٣٩ کۆتایی ئەم رووداوانە بوو.رەنگە ئەوە بە مێشکمان دابێت : کە بۆچی سوپا هیچی نەکرد بۆ رزگاربوون لە دەستی هیتلەر؟ بەڵام چۆن دەتوانرا لە دەست هیتلەر رزگار بێت کە سوپا سوێندی دڵسۆزی بۆ پیاوێك خوارد بوو کە لەلایەن ٧٥٪ خەڵکەکە پاڵپشتی لێدەکرا؟ ئەو پیاوەی لەگەڵ ئەو هەموو پاڵپشتەی کە لێی دەکرا بەسەر هێزی ئاسمانی ئەڵمانیش زاڵ بوو کە خۆی لە نەبوونەوە دروستی کردبوو، هەروەها هەردوو رێکخراوی (A.S) و (S S) لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون.

سەرکردە سەربازیەکانی ئەوکات چۆن دەیانتوانی کورەتا لەسەر هیتلەر بکەن، لە کاتێکدا کە هیتلەر دەستەڵاتی بەسەر گشت هێزە جەماوەری و حکوومیەکان داهەبوو، کە هیتلەر لە کاتێکدا ئەو کارانەی کردبوونی و سەرکەوتنی تیادا بەدەست هێنابوو بە بیری ئەڵمانیەکانیان دەهێنایەوە بەبێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك بڕژێ.

چۆن سەرکردە سەربازیەکان دەیانتوانی لەدەست هیتلەر خۆیان رزگار بکەن کە گشت فەرمانگە سیاسیە دەرەکیەکانی جیهان دەیاننناسی و بە تاکە ئاڕاستەیان دادەنا بۆ ئەو هەموو دەستکەوتانەی کە ئەڵمانیا لەو

سەردەمدا بە دەستی هێنابوو، لە مێژووشدا جاروبارێك نەبێ رووینەداوە سەركردەكانی سوپا حكوومەت لەسەر كار لابدات، تەنها لەبەرئەوەی بڕوایان بەو سیاسەتە نەبووە كە حكوومەتەكە پیادەی كردووە، بەتایبەتیش سەركردەكانی سوپای بڕووسیای ئەڵمانی كە ماوەیەكی زۆر دوور و درێژ بەوە بەناوبانگ بوون كە ملكەچی تەواوی بڕیارەكانیان دەكرد بە بێ دوو دڵی و بە بێ دەمەقاڵێ. ئاكامی ئەمەش دروسیت بوونی ناكۆكی لێكەوتەوە لە نێوان پەیوەست بوون بە ئەركە سەربازیەكان و دڵسۆزیان بۆ دەوڵەت لەلایەك و، وازهێنانیش لە رژێمی حوكم لەلایەكی دیكەوە.

ئەڵمانیەكان بە شێوەیەكی رەها و قووڵ بڕوایان بە هیتلەر هێنابوو، لە ولاتێكدا كە رژێمێكی دیكتاتۆری كۆنترۆڵی كردبوو، بە پێی پلانێكی ورد گەلەكەی بە شێوەیەكی تایبەت ئاڕاستە كرابوو، بە شێوەیەك گەر سەركردە سەربازیەكان لەو سەردەمدا لە رژێم هەڵگەڕابانەوە، ئەوا لەلایەن گەلەوە بە كۆنەپەرست و دژی پێشكەوتن ناوزەد دەكران. لەسەر رۆنشتد پێویست بوو لە دوو ئاڕاستەی دژ بەیەكدا ئاڕاستەیەكی راست و دروست هەڵبژێرێت كە شیرینترینیان تاڵ بوو : ملكەچ كردن بۆ رژێمی باو لە ئەڵمانیا لەگەڵ هەموو كەم و كورتییەكانی یاخود هەوڵدان بۆ رووخاندنی ئەو رژێمە بە پێچەوانەی نەریتی باوی رێكخستن بە هێز و توند و تۆڵ.

لەوانەیە وا دابنرێ كە ملكەچ كردنی سەركردە سەربازیەكانی ئەڵمانیا بۆ رژێمی هیتلەر بە هەڵە دابنرێت هەروەك زۆرێك لە خەڵك بڕوای وایە، بەلام پێویستە بیر لەو سەختی و دژواریەی ئەو سەردەم بكرێتەوە بەرامبەر دەرچووان لە یاسا و دژ بە رژێمی حوكمی هیتلەر. لە بەشەكانی داهاتوو

له لێکۆڵینەوەکەمان لە ئاراستەکان و کارەکانی رۆنشتد هەوڵ نادەین هونەری جەنگ بە درێژی لێکبدەینەوە، بەڵکو تەنها رووداوە سەربازیە سەرەکیەکان بەتەواوی باس دەکەین، ئەوەی بشیەوێ رووداوی زیاتر بخوێنێتەوە دەربارەی ستراتیژ و تەعبیە، ئەوا بابەت زۆرن، لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی زۆر بەسوود لەلایەن مێژوونووسە سەربازیە بەناوبانگەکان نووسراوە و چاپ و بڵاوکراوەتەوە. رۆنشتد نە لەکاتی جەنگ و نە لە دوای جەنگ پلە و پایەکی سەرەکی لە هێزەکانی ئەڵمانی نەبوو، لە دەستەی روکنی هیتلەر نەبوو، لە روکنی هێزە چەکدارەکانیش نەبوو، هەروەها لە دەستەی روکنی بارەگای سوپاش نەبوو، بەڵکو لە پلە و پایەی سێیەم بوو، واتە فەرماندەی گشتی جەحفەلی سوپا بوو بۆ جارێك و فەرماندەی گشتی خۆرئاوا بوو جارێکی دیکە. هەموو فرمانەکانیشی لە دەستەلاتی سەرووی خۆی وەردەگرت.

ئەو بیر و بۆچوونانە چی بوون کە لە مێشکی رۆنشتد دەخولانەوە ؟

ئەم بابەتە لەم کتێبەدا باس دەکەین. لە بەخت باشیەوە رۆنشتد هەستێکی ستراتیژی دروستی هەبوو، هەرگیز خۆی بە شتی وردی سەربازی خەریك نەدەکرد، نموونەش بۆ ئەمە نەخشەی سەربازی بە پێوەری ١/١٠٠٠٠٠٠ پێ باشتربوو لە نەخشەیەك کە پێوەرەکەی ١/٣٠٠٠٠٠ بێت، هەروەها کەمتریش ئارەزووی لە نەخشەیەك بوو کە پێوەرەکەی ١/١٠٠٠٠٠ بوو، گرنگە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە پلانی ستراتیژی مەزنی رۆنشتد بە ئەنقەست لەم کتێبەدا بە زمانێکی سادە و ساکار روون کراوەتەوە. چونکە ئەم کتێبەم تەنها بۆ خوێنەرە سادەکان نووسیوە نەك بۆ ئەوانەی شارەزا و پسپۆرن لە بواری سەربازی. لە پایزی ١٩٣٩ فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا هیچ شتێکیان دەربارەی نهێنیە

سیاسیەکان نەدەزانی یاخود رەنگە کەمێکیان لەم بارەیەوە زانیبێ، چونکە ئەمە لە عادەتی حکوومەت نەبوو ئەو زانیاریانەی هەیەتی پێشکەشی فەرماندە سەربازیەکانی بکات، بەتایبەتیش سەبارەت بە ئامانجەکانیان وا بلاوکرایەوە کە پۆلەندای نوێ نەفرینی لە سیاسەتی (بلسۆدسکی) کرد چونکە حەزی لە دۆستایەتی ئەلمانیا دەکرد، بۆیە پۆلەندا ئاراستەیەکی وەرگرت کە دژی ئەلمانیا بوو، هەروەکو باسیش دەکرا کە پۆلەندا هیچ ئاماژەیەکی نەکرد کە ئارەزووی چارەسەرێکی مام ناوەندی بۆ کێشە و گرفتی ئەو ئەلمانیانە بکات کە لەناو سنووری ئەودا دەژیان. هەروەها لە کۆتایشدا وا بلاوبۆوە کە پۆلەندا بەیەکجاری دەستی بەردا لەهەر چارەسەریەکی قەبولکراو بۆ گرفتی رێڕەو، ئەو رێڕەوەی کە پەیماننامەی ڤرسایل لە سالی ١٩١٩ دیاری کردبوو، کە پێکهاتبوو لە خاکێك پانیەکەی ٦٠ میل بەرەو رۆژئاوا لە زێی (ڤستۆلا) ی خواروو کە درێژ دەبێتەوە بەرەو دەریای بەلتیق. ئەم رێڕەوە لە ئەلمانیا وەرگیرابۆوە و درابووە پۆلەندا. بەمجۆرە ناوچەی بڕووسیای رۆژهەلات لەگەل ناوچەکانی دیکەی رایخی ئەلمانی جودا کرابۆوە، بە جۆرێك نەدەتوانرا لە ئەلمانیا بۆ ناوچەی بڕووسیای رۆژهەلات بچن، تەنها بە هێلی ئاسنی شەمەندەفەر نەبێ کە ئەمەش دەبووایە بە چاکی کۆنترۆل کرابێ. پێشتریش زۆر پێشنیار کرابوون بۆ چارەسەرکردن و یەکلایی کردنەوەی ئەم کێشەیە وەکو ئەو پێشنیارەی کە داوای دروستکردنی هێلێکی تەسکی بێلایەنی دەکرد لە تەنیشت رێگاکەوە لەژێر سەرپەرشتی ئیدارەیەکی هاوبەشدا. هەروەها دروستکردنی رێگایەکی ئۆتۆمبێل کە رێگای سەرەکی ببڕیبوایە لە باکووری پۆلەندا بۆ مینای "جینیا"ی پۆلەندی و لە رایخی ئەلمانیشەوە بۆ بڕووسیای رۆژهەلات.

پیاوانی سوپاش لەوە زیاتر زانیاریان پێنەدراو، نهێنییە ڕاستەقینەکانی پرۆسەی پۆڵەندیان بە نهێنی لامایەوە. بەڵام لەلایەنی سەربازییەوە هێزەکانی ئەڵمانی هەنگاو بە هەنگاو بەرەو سنووری پۆڵەندا دەچوون و، فرمانیان پێکرا لەسەر سنوور قەڵابەندی بەهێز دروست بکەن، بڕوای باو لەلایەن گەل و سوپای ئەڵمانیا وابوو، کە لە ساڵی ١٩١٤ جەنگیان لەسەر فەرزکرابوو بە پێچەوانەی ئەوەی ساڵی ١٩٣٩، کە نە گەل و نەسوپاش تامەزرۆی ئەم جەنگە نەبوون، زۆر کەس لە چین و توێژە جیاجیاکانی گەلی ئەڵمانیا ئەم مەترسیە چاوەڕوانکراوەیان هەست پێدەکرد لەکاتی ڕوودانی ئەو جەنگەدا، هەروەها بۆیان ڕوون و ئاشکرا بوو کە پرۆسەی پۆڵەندا دەبێتە هۆی ڕوودانی جەنگێکی ڕاستەقینە نەك "جەنگی گوڵ" بەبێ پێکدادانی ڕاستەقینە (وەك ئەوانەی پێشوو). ئەوانەی بە خێرایی چاوێك بە نەخشەی ئەورووپای ساڵی ١٩٣٩ بخشێننەوە، تێدەگەن کە پۆڵەندا پێش ئەوەی ئەڵمانیەکان گوللەیەك بهاوێژن، یاخود بەر لەوەی سەربازێکی ئەڵمانیا سنووری ببەزێنێ، ستراتیژیەکەی داڕما، ئەو نەخشە کێشانە سنووریەی پۆڵەندا وایکرد لەلایەن ئەڵمانیاوە لە سێ لاوە گەمارۆ بدرێن، وەك ئەوەی دوو دەستی پۆڵاین ورد و خاشی کردبێ. لەلای باکووریەوە بڕووسیای ڕۆژهەڵات بوو، لە باشووری سنووری بڕووسیای ڕۆژهەڵاتیش هێزەکانی ئەڵمانیا بەرەو باشوور بۆ (وارشۆ) و (بریست لیتوفیسك) هەنگاوی دەنا، لەلایەکی دیکەشەوە سنووری پۆڵەندا — چیکسلۆڤاکیا هەڵمەتێکی بەرەو باکوور بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی (کراکا و ولمبرك) دەووروژاند، هەروەها پێویستت بە زانیاری سەربازی نییە تاکو بەیەك چاوپێداخشان هەڵوێستی بێ ئومێدی پۆڵەندا بزانێت ! !

ئەڵمانیا هەمیشە لە توانای دابوو ئەو تەفەوقە ستراتیژیە بەتەواوی بەکاربەرێت، ئەگەریش ئەو گەمارۆ ستراتیژیە بەتەواوی بەرهەمی نەبووبێ، چونکە شەبەکەی ڕێگاکان لە ڕۆژهەڵاتی سلۆڤکیا بەتەنها بەس نەبوو، بۆیە بەرەوپێشچوونی هێزە زەبەلاحەکان تەگەرەیان کەوتەپێش. لەمەش زیاتر ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی بڕووسیای ڕۆژهەڵات لەبەرچەند هۆیەکی هونەری ڕێگای بە کۆکردنەوەی هێزی زەبەلاح نەدەدا. هەروەها قەڵابەندی پۆڵەندا لە هێڵی (نیرۆ) لە باکوورەوە و چیای (کەربات) لە باشوورەوە دوو بەربەست بوون کە سوودیان هەبوو لە دواخستنی بەرەو پێشچوونی سوپای ئەڵمانیا. پۆڵەندیەکان لە هەڵوێستێکی دژواردا بوون، لە ڕۆژئاوای وڵاتەکەیانەوە، واتە لە ڕۆژهەڵاتی (ڤستۆلا) قووڵایی شوێنە پیشەسازی و تەموینیەکانیان لەوێ بوو، هەروەها زیاتر لەمەش ناوچەی پێشووی ئەڵمانیا (بۆزان) سەرچاوەی سامانی پۆڵەندا بوو، ئەگەر بهاتبایە ئەڵمانیەکان بیانتوانیبوایە پۆڵەندیەکان ناچار بکەن لەم ناوچەیە (بۆزان) پاشەکشێ پێ بکەن، ئەوا جەنگ کۆتایی پێهاتبوو. چونکە هیچ پیشەسازیەکی سەربازی گرنگ لە ڕۆژهەڵاتی (ڤستۆلا) نەبوو، لەوەش زیاتر ئەگەر ئەو ژمارە کەمەی بیرە نەوتیەکان لە (گالیسیا) لە ناوچەی (کەربات) بکەوتایەتە بەردەستی ئەڵمانیەکان ئەوا دەبووە هۆی ئەوەی پۆڵەندیەکان پێداویستی نەوتیان کەم بێت و کاریگەری خراپیان لەسەر جێبهێڵێت. لەبەر ئەو هۆکارە لۆژیکیانە پۆڵەندیەکان ناچاربوون زۆرینەی سوپاکەیان لە ناوچە گرنگەکانی دەوروپشتی (بۆزان) دابنێن، ئەو ناوچەیە دەکەوتە نێوان سنووری ئەڵمانیا بە قوڵاییەکی زۆرەوە، بەم

هۆیەش چەند هێزێکی لاوازیان مایەوە بۆ پاراستنی هەردوو باڵی تاکو (نیرۆ) و (کەربات).

بەم جۆرە دەبینین هەڵوێستی سەربازی لە ساڵی ١٩٣٩ لە بەرژەوەندی ئەڵمانیا دابوو، هەروەها بەهۆی درێژی سنوور و گەمارۆدانی لەلایەن سوپای ئەڵمانیاوە، هەڵوێستی سەربازی بەرامبەر چیکسلۆڤاکیاش لە ساڵی ١٩٣٨-١٩٣٩ گونجاو و لەباربوو. بۆیە (چیك) یش ناچار بوو بەرگری لە بەشی گرنگی وڵاتەکەی لە دەوروبەری (براغ) بکات.

سەرکردەکانی پۆڵەندا بەم هۆیەوە لە میحنەت و ناخۆشی دابوون، بۆیە زۆرجار فەریق (رۆنشتد) لەو سەردەمدا ئاماژەی بەو هەڵوێستە دژوارەی پۆڵەندیەکان دەکرد، بەڕاستی رۆنشتد زانیاری باشی دەربارەی سوپای پۆڵەندی هەبوو، چونکە پۆڵەندیەکان ئازا و دلێر و زیرەك بوون، سوپایەکی بەهێزیشیان هەبوو کە ئامادەبوون گرانترین و ناخۆشترین پرۆسە ئەنجام بدەن. بەڵام کەرەستە و تفاقی سوپای ئەڵمانیا باش و نوێ نەبوو، تەنها چەند یەکەیەکی زرێپۆشی کۆنیان هەبوو، هێزی ئاسمانیشیان لاواز بوو، فڕۆکەکانیشیان کۆن بوون، لەگەڵ هەموو ئەمانەش سوپای پۆڵەندا گیانێکی مەعنەوی بەرزیان هەبوو، شەڕوانی چاك بوون، هەروەها دەیانتوانی بە توانایەکی بەرزەوە جموجۆڵ ئەنجام بدەن، بە شێوازی تایبەتی خۆشیان ماوەی گواستنەوەیان دەبڕی و دەچوونە سەر شێوازی سوپای رووسیایی. ئەفسەرەکانی پۆڵەنداش لە نێو خۆیان گونجاو بوون، لەلایەن سوپای ئەڵمانیاشەوە رێزی خۆیان هەبوو، باشترین شتیش لە سوپای پۆڵەندا سوارەکانیان بوون کە بە نەریتە کۆنەکانیان دەناسرانەوە، ئەو سوارانەی کە لەساتی پرۆسەی پۆڵەندیدا لەلایەن هەندێ تیپی ئەڵمانیەوە هەزاران حسابیان بۆ دەکرا،

ئـــەوكات شـــتێكی زانـــراو بـــوو، كـــە پۆڵەندیـــەكان بەباشـــی خۆیـــان ئامـــادەكردبوو، كەرەســـتەی بـــەرگری پێویســـتیان دژی رووســـیا دابـــین كردبـــوو، بـــێ ئـــەوەی ئـــەو ئاراســـتەیە بشـــارنەوە. بـــەڵام قەڵابەنـــدە نوێیەكانیان بەس نـەبوو بۆ پاراستنی سـنووره بەرفراوانەكـەی پۆڵەنـدا. بۆیە سـەركردایەتی باڵای پۆڵەنـدا ناچـار بـوو ئـەو ناوچـانە بپارێزێ كـە گرنگی زیاتریان هەبوو، ئەمـەش بە دروسـتكردنی قەڵابەنـدی لـە ئاسـن و چیمەنتۆی دروستكراو بوو، قەڵابەندی (سـیلزیا) ی سـەروو نـوێترین و بـە هێزتـــرین ئـــەو قەڵابەندیانـــە بـــوو، ئـــەو قەڵابەندیانـــە دەیـــانتوانی بـــە سەركەوتوویی خۆڕاگربن بەرامبـەر بۆردومـانی ئاسمـانی و تـۆپی قـورس. هـەروەها ئـەو قەڵابەندیانـەی كـە كەوتبوونـە بـاكوور لـە (نـیرۆ) لەسـەر سنووری باشـووری بڕووسـیای رۆژهـەڵات بـە پلـە دوو دەهـاتن لـەدوای قەڵابەندی سیلزیای سـەروو، بەتایبـەتیش ئـەو قەڵابەندیانـەی كەوتبوونـە نزیـك (ئۆسـتاو) بـە درێـژایی سـنووره بەرفراوانـەكانی دیكـەش جگـە لـە بەربەستە چیمەنتۆكان هیچی تری لێ نەبوو، ئەم جۆره بەربەستانەش لـە ناوچەی بۆزنان زۆربوون. شێوەی قەڵابەنـدی و بەربەسـتەكانی پۆڵەنـدا و قـەڵا و بەربەسـتەكانی چیكسـلۆڤاكیا لـە سـاڵانی ١٩٣٨-١٩٣٩ وەك یـەك بوون، یـاخود بەیـەكتر دەچـوون و پلانـی جموجۆڵـەكانی سـادە و سـاكار بوون: سوپای باكوور كە لە هەردوو سوپای سێیەم و چـوارەم پێكهـاتبوو لەگەڵ هێزەكانی زرێپۆش و تیپی سوارەی یەك شوێنێك لە بـاكوور داگـیر دەكـەن و، پێشـڕەوی دەكـەن بـەرەو (بۆزنـان) - (وارشـۆ) - (برسـت لیتۆفسـك) بەسـەركردایەتی فـەریق فـۆن (بـوك) بەمەبەسـتی گـەمارۆدانی سوپای پۆڵەندی. لەلایەكی دیكەشەوە سوپای باشوور سنوور دەبەزێنێت بەرەو (تاترای سەروو) (كەربان-بوشن-برسلو-كلوكو) پاشان پێشڕەوی

دەکات بەرەو رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلات بۆ گەمارۆدانی سوپای پۆلەندی لە باشوور و لە پێشەوە، بۆئەمەش فەرماندەی گشتی سوپا فۆن (براچش) و سەرۆکی دەستەی ئەرکانی گشتی (هیلدەر) توانی هاوکارییەکی تەواو لە نێوان ئەو دوو سوپایەیە دابین بکات. سوپای باشوور بە سەرۆکایەتی فۆن رۆنشتد لەم دوو سوپایە بە هێزترینیان بوو، چونکە لە سێ سوپا و بەشێکی زۆری یەکە زرێپۆشەکان پێکهاتبوو، سوپای چواردەش کە بە فەرماندەیی لیوا (لیست) بوو، کە یەکێك لە هێزەکانی فەیلەقی فۆن (کلیست) ی زرێپۆش بوو لە لابالی راستە بوو، ئەرکی ئەم سوپایەش بەرەوپێشچوون بوو بۆ سیلیزیای سەروو لە میانەی کانە خەلووزەکانەوە بە ئاراستەی رۆژهەلات بەرەو (کراکاو) و (بەرزی مسل) و (لمبرك). هەروەها ئەرکی بوو گەمارۆی بالی باشووری سوپای پۆلەندا بدات، کە لە هەردوو تەنیشتی چیای (ناترای سەروو) بوو، کە بەرزی لوتکەکانی زیاتر لە هەشت هەزار پێ بوو، بەبەزاندنی (کەربات) بە چەندین مەفرەزەی بەهێز کە دواتریش بە تیپی شاخاوی پالپشتی کرا. لە ناوەندیش سوپای دەیەم بە فەرماندەی فۆن ریشناو زۆر بەهیز بوو، ئەو هێزە سەرەکیانەش بەشی هەرە مەزنی هێزەکانی زرێپۆش و تیپە ئالیەکانی تیابوو، ئەرکەکانیش بریتی بوو لە هێرش کردن بەرەو سیلیزیا لە بەرەی گشتی (راندۆم) لەلای چەپیش سوپای هەشت بوو بە فەرماندەی لیوا (بلاسکو ویتس) بێ هێزترین ئەو سوپایانە بوو، کە پێویست بوو لەسەری لە ناوچەی نزیك (کلوکو) هێرش بەرێت بە ئاراستەی (لۆتس) لە هەموو ئەوانەش گرنگتر پێویست بوو بالی باکووری سوپای رۆنشتد لە (وانا) و (بزورا) بپارێزێت، چونکە بەشی زۆری سوپای پۆلەندی لە دەوروبەری (بوزنان) و باکووری بە هێزی زۆرەوە

کۆبووبوونـەوە. هێـزی ئاسمـانی ئـەڵمانیش کەشـتی گـەلی چـوارەم بـە سـەرۆکایەتی (لۆهـەر) تـەرخانکرابوو بـۆ پاڵپشـت کردنـی هێرشـبردن لەبەرەی رۆنشتد. ئەوەش زیاد کرا کە تەشکیلاتی برووسکەی ئاسمانی بە فەرماندەیی لیوا فۆن (ریخ تۆڤن) لە نزیکەوە پاڵپشتی فەیلەقی زرێپۆش بکات. بەرەکانی شەڕ زۆر فراوان بوون، (تـاترای سـەروو-تروبا-ئۆپلن-برسلاو-کلوکو) ی دەگرتـەوە، واتـە نزیکـەی ٢٧٥ میـل ئەگـەر بێـت بـە هێڵێکـی راسـت دابنـێین لـە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی. رۆنشـتد فەرمانـدەی گشتی ئەو بەرەیە بوو، کە پاش ئەوەی خانەنشین کرابوو لە سـاڵی ١٩٣٩ گەڕاندبوویانەوە خزمەتی سەربازی. چونکە سوپا وایان دەڕوانیە رۆنشـتد کە سـەربازێك بـوو رەوشـتێکی بـەرز و بەهرەیـەکی تایبـەتی هـەبوو و لـە جموجۆڵـە سـتراتیژیەکان دەگەیشـت و ئاراسـتە راسـت و دروسـتەکانی دەزانی. بەڵام سەرۆکی دەستەی روکنی سەرکردایەتییەکەی لیوای چالاك و بـەتوانا و کاریگـەر فـۆن (مانشـتاین) بـوو، بۆیـە لـە بارەگـای سەرکردایەتییەکەی باشترین ئەفسەر و فەرماندە هەبوون. سـەرکردەکانی دیکەی دەستەی روکن ئەزموون و توانایان کەم بوو، چونکە ئەو دەستەیە یەکەم جار کـە دامـەزرا ئـەو کاتـە بـوو کـە بـاری نائاسـایی راگەیـەنرا لـە سەرەتای جەنگدا، هەروەها زۆر لە ئەفسەر و پلەداری دیکەی یـەدەك کـە لەژیانی سڤیلی گەڕانەوە بۆ خزمـەتی سـەربازی پەیوەنـدیان پێـوە کـرد، خزمەتکردنیش لە بارەگای سەرەکی بەو شێوەیە کـارێکی ئاسـایی نـەبوو لایان، بەڵام توانای بارەگاکەی بەرە بەرە باشتر بوو بـە رۆیشـتنی کـات و بە مومارەسە، یەکەم جـاریش بارەگـای سـەرکردایەتییەکەی لـە ناوەنـدی مەشـقکردن لـە (سـیلیزیا) دانـرا، دواتـر گوێزرایـەوە بـۆ (نـیس) و دێـری کاسۆلیکەکان بۆ خاکی پیرۆز بـووە بارەگایـان و، قەشـەکان لـە باخچـەی

دێـر و ناوچـەکانی دیکـەی دێـر بەشـداریان کـرد و یـەکتریان دەبـینی، سەرۆکی دێر چەندین شەو لەگەڵ رۆنشتد قسەی دەکرد و بەبێ گرفت بیر و بۆچوونەکانیان دەگۆڕیەوە، وا بڕیـاربوو رۆژی ٢٦ی ئـابی سـاڵی ١٩٣٩ سـنوور ببـەزێنرێ، هـەروەها پێویسـت بـوو مـەفرەزەکانی پـەی پێـبردن (ئیستیتلاع) ببنە بێکهاتەی جەنگ لە شەوی ٢٦/٢٥ ی ئاب. ئەوەبوو لـە شەوی ٢٥ ی ئاب گشت فرمانـەکان دەرچـوون و سـوپاش ئامـادە بـوو بـۆ جموجۆڵ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان. گیانی مەعنەوی بـاو لـە نێـو ئـەم سوپایەدا بەرز نەبوو، هەروەها لای پۆڵەندیـەکانیش پشـێوی زۆر دروسـت نەبوو، بـەڵام لێـرەدا پرسـیارێك خـۆی قـووت کردبـۆوە: پـاش ئـەوە چـی روودەدات؟ لە سەعاتەکانی یەکەمی شەوی ٢٥ ی ئاب فرمانێکی سەیرمان بۆهـات لەلایـەن هیتلـەرەوە، کـە فەرمانـدەی گشـتی سـوپا بـە ئێمـەی راگەیانـد، ناوەڕۆکەکەشـی ئـەوەبوو کـە سـوپای رۆژهـەڵات هـەر ئێسـتا بوەستێت! شتێکی روونـە سیاسـیەکان بـەدوای دەرگایـەك دەگـەڕێن بـۆ دوورکەوتنەوە لە جەنگ لە چرکەساتی کۆتاییدا، ئەم فرمانەش پێویسـتی بـە جێبـەجێکردنی خێـرا هـەبوو، ئـەگینا هێزەکـانی پێشـەوە سـنوور دەبەزێنێت و جەنگ دەستی پێدەکرد. راگرتنی ئەو بەرەوپێشچوونەی کە خەریك بوو لەلایەن بەشەکانی پەی پێبردنی پێشـەوەی هێزەکانمـان پێـی هەڵبستن لە بەرەیـەك کـە درێژییەکـەی ٢٧٥ میـل دەبـوو پـێش بەزانـدنی سنوور کارێك بوو جێگەی سەرسوڕمان بوو، بـەڵام لەلایـەن سـەرکردایەتی گشتی و فەرماندەی تیپەکان بە باشترین شێوە جێبەجێ بوو، شەوێك بوو بەهۆی مانگە شەو دونیا رووناك بوو، رێگاکانی نێـوان (تـاترای سـەروو) و (کلوکو) بە رەتلـەکانی سـوپای باشـوور زۆر قـەرەباڵغ بـوو، کەتیبەیـەکی لەوێ ئالیش جموجۆڵی دەکرد بەرەو رۆژهەڵات لەسەر رێگای (سیلین) لـە

چیکسلۆڤاکیا لە باشووری (تاترای سەروو) بەمەبەستی بەزاندنی چیای کەربات بە ئاڕاستەی رۆژهەلات، بۆیە پەیوەندیکردن بەو کەتیبەیە کارێکی دژوار بوو. بەهۆی دووریەکەی لە بارەگای سەرکردایەتی، هەروەها لەبەر خراپی هۆکانی گواستنەوە رۆنشتد ناچاربوو ئەفسەرێك بە فڕۆکەیەکی بچووکی ئەلمانیایی کە ئەفسەری روکنی لە پێشینەکان بەکاریان دەهێنا لە جۆری (ستۆرك) بنێرێ و دوای بەزاندنی ئەو ناوچەیەی سوپای ١٤ ی لێبوو بگاتە ئەم کەتیبەیە. ئەو ئەفسەرە توانی بەهۆی رووناکی مانگ کەتیبەکە بناسێتەوە، لەو کاتەشدا کەتیبەکە لە جموجۆلدا بوو لەسەر رێگای رۆژهەلاتی (سیلین) و بەفڕۆکەکە لە نزیك بارەگاکەیان نیشتەوە و بڕیاری وەستانی جموجۆلی پێ راگەیاندن.

بەم جۆرە بزوێنەری سوپا لە جوولە وەستاو، هەروەها لێرە و لەوێ دەوریاتی بچووکی ئالی سنووریان بەزاندبوو، بەلام پێش ئەوەی لەگەل دوژمن بەیەکدا بدەن توانرا پاشەکشێیان پێ بکەن. رۆنشتد نەیدەزانی هۆکاری فەرمانی وەستاندنی جموجۆلی سوپا چییە ! !، چونکە هیچ زانیاریەکی دەربارەی هەلوێستی سیاسی نەگەیشتبوێ. بەلام ئەوکات وا بلاوبوو کە مۆسۆلینی یاخود ولاتە رۆژئاواییەکانی دیکە پێشنیاریان کردبوو بۆ چارەسەری ئاشتیانەی نێوان هەردوو لا. پێشتریش هیتلەر لە سالی ١٩٣٨ فرمانی دەرکردبوو بەوەستانی بەرەوپێشچوون بەر لە جموجۆل بەرەو (سودیت) ، کاتێکیش ئەوجارە فرمانی وەستانی جموجۆل گەیشت، دەستەی روکن هەمووی خۆشحال بوون بەم هەوالە، هەر بەم بۆنەیەشەوە رۆنشتد چەند شووشە شەڕابێکی بە هاوبەش لەگەل سەرۆکی دێر دەستکەوت کە لە (نیس) ئامادەکرابوو، بەهۆی ئەم بۆنە خۆشە. ئەمە راستینەی گیانی مەعنەوی باوبوو لەو کاتەدا، بەلام فرمانی

وەستانی بەرەو پێشچوون زۆری نەخایاند، جارێکی دیکە فرمان گەیشت بە دەستبێگردنەوەی پێشڕەوی و بەزاندنی سنوور و دەستپێکردنی شەڕ، لە رۆژی یەکی ئەیلوول (سێبتێمبەر) ی ساڵی ١٩٣٩ هەردوو سوپا سنووری پۆڵەندایان لە باکوور و رۆژئاوا و باشوورەوە بەزاند و ئاگری جەنگ هەڵگیرسا. سەرەتا بەرگری پۆڵەندیەکان زۆر توند بوو، بەتایبەتی لەناوچەی پیشەسازی لە (سیلیزیای سەروو) کە سوودیان لە قەڵابەندیە بەرگریە بەهێزەکان وەرگرت، بە شێوەیەك زیانی سوپای ١٤ ی ئەڵمانی لەو ناوچەیە گەلێ زۆربوو، بەڵام لە ناوچەکانی دیکە بە درێژایی سنوورە فراوانەکە، پۆڵەندیەکان لە سەرەتادا خۆیان لە شەڕکردن پاراست و، لەدوای دوو-سێ رۆژ لە دەستپێکردنی شەڕ ئینجا بەرگریان بە هێزکرد و، زنجیرەیەك شەڕی توند و جارجارەش سوك روویدا، کە ناکرێ لەم کتێبەدا درێژەی ئەو شەڕانە باس بکەم. پۆڵەندیەکان وەك لێیان چاوەڕێ دەکرا بە ئازایەتییەکی زۆرەوە جەنگان. لەوەش زیاتر هێزە سوارەکانیان چەندین جار بە شەو هەڵمەتی کتوپڕیان دەبردە سەر هێزەکانمان، وەك بڵێی سوپایەك لە خێوبوون، کاتێ بەشی زۆری هێزەکانیان لە نزیك (بۆزنان) بۆ دواوە کشانەوە بەرەو باشوور بە (بزورا) ئەزمەیەکی کاتی روویدا، بەڵام کاتێ سوپای ٨ ی سوپای رۆنشتد بوو دەستی بە هێرشکردن کرد بۆ رۆژهەڵات، پۆڵەندیەکان لەسەر زێی بزورا دەرکەوتن بە ئاراستەی لابالّی سوپای ٨، بۆماوەی چەند رۆژێك ئەو سوپایەیان خستە بەردەم هەڕەشەیەکی جدییەوە. ئەمەش وایکرد هەندێك تیپی سوپای ١٠ کە بەشێوەیەکی کاتی لە ناوچەی ناوەند بوون بنێردرێن بۆ پاڵپشتی کردنی سوپای ٨. رۆنشتد و سەرۆکی دەستەی روکنەکەی ئیجرائاتی کاریگەریان کرد، هەردووکیان بە فڕۆکە چوونە بارەگای

سوپای هەشت لە (لوتس) و فرمانی پێویستیان دەرکرد، ئەم ئەزمەیەش لەلابالّی چەپی سوپای ٨ بەهۆی کەمی کردەی پەی پێبردنەوە بوو کە بۆ ئەم سوپایە دانرابوو، بەراستیش ئەم مەترسیە لە ئەنجامی کەمی ژمارەی کەسانی پەی پێبردن بوو لەم سوپایەدا، چونکە لەیەك کەتیبەی ئالی زیاتری نەبوو، کە ئەویش لە جیاتی ئەوەی بۆ قوولّترین خالّی لابالّی راست تەرخان بکرێت، بۆ لای راست تەرخان کرابوو. لەوەش زیاتر کردەی پەی پێبردنی تەعبەوی زۆر کەم بوو، ئەوانەی کە لەلایەن ئەسپ سوارەکانەوە کران، ئەو بەشەی کە هەمیشە لە ناوچەکانی رۆژهەلاّت زۆر بەسوود بوون، رۆنشتد کە زانیاری زۆر وردی لەسەر ناوچەکانی رۆژهەلاّت هەبوو زیاتر لە جارێك پێویستی گواستنەوەی یەکەکانی پەی پێبردنی راگەیاند لە بەرەکانی رۆژئاوا بۆ بەرەکانی رۆژهەلاّت، چونکە هێزەکانی ئەلّمانی لە رۆژئاوا لە هەلّوێستێکی جێگیردابوون و لە شوێنەکانی خۆیان لە قەلاّبەندیەکانی رۆژئاوا، یەکەکانی پەی پێبردنیش لەوێ بەکارهێنانیان سودێکی وای نەبوو. بەلاّم پەی پێبردنی ئاسمانی سەرکەوتووبوو، ئەمەش بەهۆی زۆری فڕۆکەکانی ئەلّمانیاوە بوو کە کۆنترۆلّی ئاسمانی ئەو ناوچەیەمان کردبوو، بەلاّم فڕۆکەوانەکان بۆ هەمیشە نەیانتوانی بە وردی رەوشی سەرزەمینمان بۆ دیاری بخەن. چونکە لە مانگی ئەیلوولی سالّی ١٩٣٩ بارودۆخی ئاووهەوا مامناوەندی بوو، خۆر بە دەرەوە بوو ئاسمان پرشنگدار بوو، لە رێگا قومەکانیشی خەلّکێکی زۆری پەنابەران لە رۆیشتندا بوون و، هەروەکو لە گشت شوێنێکی رۆژهەلاّت باوە ئەسپ و مەڕ و مالاّت و عەرەبانەشیان لەگەلّ بوو. هەروەها هێزەکانی پۆلّەندیش بە ئاراستەی رۆژهەلاّت لە پاشەکشێ دابوون و، هێزەکانی دیکەی پۆلّەندیش دووبارە خۆیان لە باکوورەوە

بەرەو باشوور خۆیان دزییەوە، تێکەڵیەکی زۆری هێز و خەڵك لە ڕێگا بوون، بەڵام بەهۆی لە تەم و مژێکی زۆر کە لە هەموو لایەکەوە بوو و گشت ڕێگاکانیشی گرتبووەوە لە ئاسمانەوە نەدەبینران، ئەگەر ئەو تەم و مژە نەبا دەتوانرا بزانرێت کەچی لەسەر زەوی هەبوو. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر پۆڵەندیەکان وەك هەر گەلێکی ڕۆژهەڵاتی دیکە سوودیان لە ڕۆیشتنی شەوانە وەردەگرت بۆ جێگا گۆڕین و شەڕکردن، پۆڵندیەکان لە جموجۆڵی شەوانەدا لە هێزەکانی ئەڵمانی باڵا دەست تر بوون لە ساڵی ١٩٣٩ دا. ئەوەش ئەڵمانیای ناچار کرد بۆ یەکەم جار بە شەویش جموجۆڵ بکات. فەرماندەی گشتی سوپای باشوور پاش ئەوە گەیشتە بڕیارێکی ستراتیژی گرنگ، چونکە سوپای پۆڵەندی بەهۆی فشاری سوپای باکوور پێویست بوو لە (برومبرگ) و (بۆزنان) پاشەکشێ بکەن تاکو لە گەمارۆی دوو لایەنە ڕزگاریان ببێت. چەند ڕۆژێك بێ دەنگی باڵی بەسەر سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیادا کێشا، دوو ئەگەریش هەبوون: یەکەمیان ئەوەبوو کە پۆڵەندیەکان تا ئێستا لە ڕۆژئاوای (وارشۆ) ن. دووەمیشیان ئەوەبوو کە ئەوان گەیشتوونەتە دواوەی ئەو ناوچەیە بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات، ئەمەش بە پاشەکشێ کردن لە ڕێگای زێی (یەك) ەوە. سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی ئەگەری دووەمی پەسەند کرد و، داوای لە سوپای باشوور کرد لە ڕۆمانیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی لە ڕێگای زێی (ڤستولا) بە ئاڕاستەی (لوبلن) بەرەو پێش بچن بۆ بڕینی هێڵی پاشەکشەی پۆڵەندیەکان لە نێوان هەردوو زێی (بەگ و ڤستولا). بەڵام ڕۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ڕوکنەکەی بە شێوەیەکی وا ڕەوشەکەی خوێندەوە کە جیاواز بوو لەگەڵ بۆچوونەکەی سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی و، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە تا ئەوکات بەشی زۆری

هێزەکانی پۆڵەندی لە رۆژئاوای (وارشۆ) دەجەنگن. لەسەر ئەم بنەمایەش ئاڕاستەی سوپای ۸ و بەشی زۆری سوپای ۱۰ ی ئالی بە خێراییەکی زۆرەوە گۆڕدرا بۆ باکوور بەرەو (وارشۆ). بەم بڕیارەش رۆنشتد بەرپرسیارێتی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە دروستەی هەڵگرت، هەرچەندە پێچەوانەی بۆچوونی سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا بوو. هەردوو سوپای ۱۰ و ١٤ و گشت تۆپە قورسەکان بە خێرایی بەرەو ئاڕاستەی (وارشۆ) گواسترانەوە، بۆ گەمارۆدانی ئەو شوێنەی کە بەتوندی بەرگریان دەکرد هەروەها بە قەڵابەندی و شوێنی سەختی پۆڵەندیەکان دەورە درابوو، بۆئەوەی پەڕینەوە لە زێی ڤستولا کارێکی قورس و گران بێ، بەڵام بە هاوکاری لەگەڵ سوپای باکوور کە لەلای باکوورەوە پێشڕەوی دەکرد توانرا بەشی زۆری سوپای پۆڵەندی ببەزێندرێت کە لە دەوری (وارشۆ) دابوون. بەرگریەکانی (وارشۆ) زۆر بەتوندی لە ئاسمان و زەمینەوە بە فڕۆکە و تۆپ بۆردومان کرا و دواتریش لەلایەن هێزی پیادە و زرێپۆشەوە هێرشی کرایە سەر، فەرماندەی پۆڵەندی ژیر و دانا ناچار بوو لەگەڵ سوپا و قەڵابەندیەکان خۆی بەدەستەوە بدات. بەم جۆرە شەڕی برووسك ئاسا لە پۆڵەندا ئامانجەکانی بەدەست هات، کە ئەمەش تەنها لەلایەنی بانگەشەوە بوو، هەرچەند بەنیسبەت هێزەکانی ئەڵمانی شەڕ کۆتایی نەهاتبوو، چونکە بانگەشەکان باسی شەڕێکیان دەکرد کە ۱۸ رۆژی خایاند، بەڵام رووداوەکان لە بواری کردەنیدا وانەبوون، بێگومانیش بەشی زۆری هێزەکانی پۆڵەندا رووخابوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا هێزەکانی ئەڵمانی لەلای رۆژهەڵاتی زێی (ڤستۆلا) رووبەڕووی هێزی چالاکی سوپای پۆڵەندا دەبۆوە، ئەو هێزانەی پۆڵەنداش هەوڵی دەدا خۆی بدزێتەوە بە پەڕینەوە لە نێوان هەردوو زێی

(بەگ) و (ڤستۆلا) بۆ وڵاتی رۆمانیا. دوای ئەوە بارودۆخەکان بە خێراییەکی سەیر گەشەی کرد و، هیتلەر لەگەڵ رووسیا گەیشتە پەیمانێك دەربارەی دابەشکردنی پۆڵەندا. لەسەرەتاش وارێکخرا گشت ناوچەکانی کە کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی ڤستۆلا بۆ رووسیا بێت. بۆیە هێزەکان و زرێپۆشەکانی رووسیا سنووری پۆڵەندایان لە بەرەیەکی فراوان لە نێوان (مینسك) و (بۆدۆلیسك) بەزاند و لەسەرخۆ بەرەو رۆژئاوا پێشرەویان کرد، لە ئەنجامی ئەو پێشرەویەش سوپای باشوور لەگەڵ هێزەکانی پۆڵەندا گەیشتنە یەکتر و شەڕ و پێکدادان لە نێوانیان روویدا. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئەو هێزانەی پۆڵەندا لە هەوڵی ئەوە دابوون بگەنە رۆمانیای بێلایەن و لە چنگی هێزەکانی ئەڵمانی و رووسەکان رزگاریان بێت. هەروەها زۆربەی گەلی پۆڵەنداش لە رۆژهەڵاتەوە لە ترسی هێزەکانی رووسیا بەرەو رۆژئاوا ملی رێیان گرتبووە بەر.

دەتوانین بێنینە پێش چاومان کە رەوشەکە چەندە نادیار و ناڕۆشن بوو، ئەوکاتەی کە جەنگ لە رۆژهەڵاتی (گالیسیا) و دەوروبەری (لوبلن) بەردەوام بوو، بەتایبەتیش لەکاتی شەودا، ئەمەش لەدوای هەژدەمین رۆژی جەنگ بوو، چونکە پۆڵەندیەکان سوودیان لە تاریکی و چەنگەل و دارستانەکانی رۆژهەڵاتی پۆڵەندا وەرگرت.

لە ناوچەی (کرودیك) لە (گالیسیا) و دەوروبەری (لمبرك) شەڕی قورس و دژوار روویدا، بەتایبەتیش لە زەلکاو و دارستانەکانی دەوروبەری ئەو ناوچەیەیە. پۆڵەندیەکانیش لە بەرەی شەڕ و دواوەی هێزەکانی ئەڵمانی دەرکەوتن و هەوڵیان دەدا بەوێدا تێپەڕن، لەناو ئەو رەوشە ئاڵۆزە رووبەڕوو بوونەوەیەکی سادە روویدا لە نێوان یەکەکانی تفەنگ لە تیپی چیایی یەکەم و یەکەکانی زرێپۆشی رووسیایی، چونکە ئەفسەرێکی

سوپای ئەڵمانی کە لە رەبیەیەکدا بوو دەبابەکانی رووسیای نەناسیەوە و فرمانی دەرکرد تەقەیان لێبکەن، بەهۆی ئەمەش دەبابەیەکی پێشەوەی رووسیا پێکرا و، هەروەها هەردوو ئەفسەری ئەڵمانی و رووسیایی لەم شەڕە کوژران، هەرچەندە لەلایەنی بانگەشەوە پرۆسەی پۆڵەندی کۆتایی پێهاتبوو، بەڵام رەوشی هێزەکانی رۆنشتد لە گالیسیا رۆژ دوای رۆژ بە شێوەیەکی سەیر گەشەی دەکرد، پێویست بوو لەسەر گشت هێزەکانی ئەڵمانی بۆ رۆژئاوای (ڤستۆلا) و (سان) پاشەکشە بکەن بە گوێرەی پەیمانی رووسیا و ئەڵمانیا بۆئەوەی ئەم ناوچەیە بدرێتە دەست یەکێتی سۆڤیەت، بەڵام هێزەکانی ئەڵمانی لەکاتی پاشەکشەیدا لەلایەن هێزەکانی پۆڵەندیدا رووبەڕووی شەڕی بچووك دەبوونەوە، هەرچۆنێك بێت رووسەکان ئەم بەرخودانانەیان بۆ هێزەکانی ئەڵمانی جێهێشتبوو، خۆشیان بە هێواشی و لەسەرخۆ بەرەو رۆژئاوا پێشڕەویان دەکرد. بەمجۆرە یەکەکانی سوپای ١٤ خۆی لە رەوشێکی ناخۆش و ئاڵۆزدا لەکاتی پاشەکشەکردندا بە رەتبوون لە (سان) بە ناوچەی (تاینۆ) ی بەناوبانگ بە قوم و کەمی رێگا و دارستان و زەلکاوەکان بینییەوە. بۆ بەهانا هاتنی ئەو یەکانەش چەندین یەکەی دیکەی ئەڵمانی گەیشتنە رۆژهەڵات. پاشان بڕیاری یەکەمی دابەش کردنەکە گۆڕانی بەسەردا هات و، هێڵی نوێی دابەش کردن بووە هێڵی (سان) — (بەگ). ئەوەش مانای ئەوەبوو هێزەکانی رووسیا بە ئاراستەی رۆژهەڵات پاشەکشە بکەن و هێزەکانی ئەڵمانیاش دووبارە پێشڕەوی بکەن و لە (ڤستۆلا) بپەڕنەوە و بەرەو (بەگ) ی خواروو. بەم شێوەیە بە دیاردەکەوێت کە بەهۆی دیاریکردنی هێڵی جیاکەرەوە بە شێوازی سیاسی چەندە ناخۆش بوو چەندە زیانی لە هێزەکاندا. شەڕی پۆڵەندی کۆتایی بە کردەنی پێ

نەهات تەنها لە نیوەی مانگی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) نەبێت، هەتاکو پاش ئەم کاتەش هێزەکانی ئەڵمانیایی زیانی گیانی گەورەیان بەرکەوت. لەو ماوەیەشدا دەستەی روکنی رۆنشتد لە گوندێکی باشووری رۆژئاوای (وارشۆ) بوو کەهی خێزانی (باتوکی) پۆڵەندی بوو، لەم شوێنەشدا رۆنشتد فرمانی دامەزراندنی بە فەرماندەی گشتی بەرەی رۆژهەلات بۆ دەرچوو. لەگەڵ مانەوەشی لە پۆڵەندا بەخۆی و دەستەی روکنی بۆ پاراستنی وڵات بە سیفەتی حاکمی سەربازی لە پۆڵەندا دامەزرا. ئەمەش بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئارەزووەکانی نەدەگونجا، چونکە بڕیاردرا پلەوپایەی حاکمی مەدەنی لە پۆڵەندا دابنرێت و، حاکمێکی نازی بۆ وڵات دامەزرا. پێشووتریش ناکۆکی توندی بیر و بۆچوون لە نێوان رۆنشتد و پیاوانی حزبی نازی سەریهەڵدابوو، هەروەها ئەم جۆرە جیاوازی و ناکۆکیانەش لەکاتی جەنگی پۆڵەنداش روویدابوو، بۆیە رۆنشتد هەوڵی زۆری دا واز لە پلەوپایەی حاکمی سەربازی بێنێت و لە پۆڵەندا دووربکەوێتەوە. ئەم ئارەزووەشی لە نیوەی مانگی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) هاتەدی و، هیتلەر خۆی فەرمانی دەرکرد بە گواستنەوەی رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی بۆ رۆژئاوا و وەرگرتنی سەرکردایەتی سوپای (ا) لەوێ و جەنەڕاڵ (بلاسکو ویتس) یشی کردە حاکمی سەربازی نوێی پۆڵەندی، دەستەی ئەرکانی رۆنشتدیش حوکمی وڵاتی دایە دەست حاکمی نوێی سەربازی خۆشی گواستراوە بۆ (لوتز) لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمیش دەستەی ئەرکانی رۆنشتد گواسترایەوە رۆژئاوا بۆ (کۆبلنز) لەسەر زێی (راین) و، رۆنشتدیش سیدالیای خاچی ئاسنینی بە پلەی خاچی (دلاوەر) پێبەخشرا. ئەزموونی جەنگی پۆڵەندی سەلماندی کە بەشێك لە هێزەکانی پیادەی سوپای ئەڵمانی لەکاتی شەڕدا جێگیر

نەبوون، ئاستیشیان نەدەگەیشتە ئاستی ئەو یەکە پیادە بەناوبانگانەی ساڵی ١٩١٤. ئەمەش لەلایەن زۆر فەرماندەی یەکەکان گرنگی پێدرا و بێزاری خۆیان لەوە دەردەبڕی کە هێزەکانیان بە دڵێکی بە ترس و لەرزەوە هێرشیان دەبرد. جێی گومانیش نیە ئاستی هەندێك تیپیش لەمە بەرزتر بوو، بەڵام لەو تیپە پیادانەش ئاستی هەندێکیان زۆر باش نەبوو. هۆی ئەمەش سەربازی پیادەی ئەڵمانی نەبوو، بەڵکو هۆکارەکەی ئەو فراوانبوونە خێرایەبوو کە لەکاتی دروستکردنی هێزەکان پیادەکرا. کە لە ئەنجامیش بووە هۆی ئەوەی گونجانێکی باشی ناوەخۆی لە نێو سوپادا لێنەکەوتەوە. هۆکاری راستەوخۆی کۆتایی هاتنی جەنگیش بە خێرایی و بە سەرکەوتوویی دەگەڕایەوە توانا و بەهێزی هێزە ئاسمانی و زرێپۆشەکان، لەم بارەیەوەش راپۆرتێك کە کەمتوانایی تیپەکانی ئەڵمانیای تیابوو بۆ هیتلەر نێردرا، ئەمەش هیتلەری بێزارکرد، چونکە ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە هێزە پیادەکانیان لەگشت روویەکەوە زۆر چالاکن و هەروەك ئەو هێزە پیادانەن کە لەساڵی ١٩١٤ خۆی وەکو سەربازێك لەوێ خزمەتی کردبوو. بەڵام لە راستیدا بۆچوونەکەی وا دەرنەچوو. لێکۆڵینەوە لە شەڕی پۆڵەندا سەبارەت بە پیاوانی سوپا خۆش و بەسوودە لەلایەنی رۆشنبیرییەوە، چونکە جەنگێك بوو بە بەردەوامی هەڵوێست و بارودۆخی گۆڕاوی تیابوو، لە هێرش بردن و گەمارۆدان و خۆدزینەوە و......هتد. هەروەها هەڵوێست و رەوشی نوێ و کتوپڕ و گۆڕانی خێرای ئەنجامی تیابوو، هەروەها لەکاتی شەڕدا هیچ پشوودانێك نەبوو بۆ دەستەی ئەرکان و هێزەکان لەکاتی رۆژدا، بێ گومان بە شەویش لە رۆژ باشتر نەبوو. ئەو پڕۆسەیە بە شێوەیەکی تایبەتی لەگەڵ پلانە ستراتیژی و تەیارکردنەکانی رۆنشتد یەکانگیربوو، شەڕێك بوو کە

گۆڕانکاری خێرایی تیابوو، هەروەها لیوا فۆن (مانشتاین) سەرۆکی ئەرکانی سوپاکەی وەك بلێی بۆ پرۆسە و کردەی ئاوا دروست کرابێت. بەشێوەیەك هەردوو سوپا نزیکەی ٦٩٠ هەزار پۆڵەندیان بەدیل گرت. لەسەرەتای جەنگی پۆڵەندا ئەفسەرێکی پۆڵەندا بە پلەی لیوا بەدیل گیرا و دوو رۆژ وەك میوان لە بارەگای رۆنشتد مایەوە. ئەم لیوایە شیوەنی بۆ سیاسەتی وڵاتەکەی کرد و بە گلەییەوە و بە نائومێدییەوە گوتی : ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرە پۆڵەندیەکان بە هیوابوون هەردوو سوپای پۆڵەندی و ئەڵمانی بەیەکەوە بەرگری بکەن لە دژی مەترسی رووسیا. نەزانینی ئەو رووداوانەی کە لە دوارۆژ روودەدات وای لێکردین ئەو قسانەی ئەم لیوا ژیر و بەڕێزە تەنها بە موجامەلە دابنێین، بەڵام رەنگە ئەو وەك پۆڵەندیەك نەزانراوەکانی دوارۆژی دووری بینیبێت.

## بەشی پێنجەم

### شەڕی بروسك ئاسا لە ڕۆژئاوا لەساڵی ١٩٤٠

بارەگای نوێی ڕۆنشتد لەشاری (کۆبلنز)ی کۆنی ئەڵمانی بوو لەسەر زێی راین، بارەگاکانیش لە بینا کۆنەکان بوو کە پێشووتر بارەگای فەیلەقی ٨ ی بڕووسیایی لەوێ نیشتەجێ بوون، لەوێش بە ئاشکرا هەست بە نەریت و تەقالیدی سەدەیەکی تەواو دەکرا. زۆربەی ئەفسەرانیش لە هوتێلی (ڕێزن فێرستن هۆڤ) نیشتەجێ بوون. ڕەوشی سیاسیش لە راستیدا بە نادیاری مابووەوە، چونکە سەرکردەی سوپای فەیلەقەکان ئاگاداری زۆریان لەسەر مەبەست و ئامانجەکان نەبوو، بۆیە بانگەشەیەکی هاکەزایی کاریگەری زۆر مەزنی لێکردن. بە جۆرێك هیچ کەسێك لە نێوان گەنگەشەو راستەقینەدا جیاوازی پێنەدەکرا، ئەو زانیاریە کەمانەی دەربارەی ڕەوشی سیاسی هەروەك چاوەڕوان دەکرا کاریگەری هەبێت لەسەر سەرکردەکانی سوپای وڵاتانی ڕۆژئاوایی، بەو شێوەیە کاریگەری لەسەر ڕۆنشتد و کۆنە فەرماندەکانی سوپادا نەبوو. بەهۆی نەریتی دوو سەدەی دوور و درێژ، سەربازانی بڕووسیای ئەڵمانیا فێرببوون خۆیان لە قەلای کاروباری سیاسی نەدەن. بەم هۆیەوە مەیل و ئارەزوویان بۆ زانینی نهێنیەکان نەبوو، یاخود لاوازبوو.

هۆکاری خۆ دوورەپەرێزگرتنی هێزەکانی ئینگلتەرە و فەڕەنسا لە بەشداریکردنیان لە شەڕدا روون نەبوو، لە کاتێکدا کە زۆربەی سوپای ئەڵمانیاو زرێپۆشەکانی هێزەکانی ئاسمانی بەرەو ڕۆژهەلات و بۆ پۆڵەندا لە جموجۆڵدا بوو، تەنگژەی سیاسی هەر لە بەهاری ساڵی ١٩٣٩ بوونی

هەبوو، لە ڕۆژی یەکی ئەیلوول شەڕی پۆڵەندا هەڵگیرسا، لە ڕۆژی دووەمی ئەیلوول مۆسۆلینی هەوڵیدا ناوبژی بکات، ئەم ناوبژییەش دەبوو فەڕەنسا و ئەڵمانیا لەسەری ڕازی بن، بالیۆزی بەریتانیا لە بەرلین بڕیارێکی دەرکرد لەسەر ڕووداوی شەڕ، لە کاتێکدا فەڕەنسا چارەنووسی خۆی بە بەریتانیا گرێدا، مایەوە ئەو نهێنییەی کە چارەسەرکردنی گران بوو: بۆچی هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو فەڕەنسا بە تەواوی سنوورێکیان بۆ ئەڵمانیا دانەنا، بە داگیرکردنی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە ئەیلولی ١٩٣٩؟

ئایا لەوێدا هۆکاری سیاسی هەبوو؟ ئایا هیچ هیوایەك هەبوو بۆ چارەسەری لەدوای شەڕی پۆڵەندا؟ ئایا ڕێککەوتنی هەردوو دەوڵەتی ڕووسیا و ئەڵمانیا دەربارەی پۆڵەندا دەبێتە هۆی ترسانی ئەم دوو دەوڵەتە؟

ئەوەی کە ناونرابوو دیواری ڕۆژئاوا، تەنها فێڵێك بوو لە فیلْ و بانگەشەی ئەڵمانیا - شتێکی گرانە باوەڕ بەوە بکەین کە ڕاستیی نهێنی ئەم دیوارە لە لایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی ڕۆژئاوا بە شاراوەیی مابووبێتەوە.

چونکە ئەستووری کۆنکریتەکان و قەڵابەندیەکان بەس نەبوو بۆ بەرگریکردن و بۆردوومانی قورس، هەروەکو ئاسان نەبوو بۆ دانانی مۆڵگەی چاك و دروستکردنی لە چیمەنتۆ، هەروەها گۆڕەپانی شەڕیش بەشی ئەو مۆڵگە چاکانەی نەدەکرد، لە سەرەتادا هیچ شتێکی تیا نەبوو، تەنیا کەمێك تێلدڕ نەبێ،پڕچەککردنی دیوارەکانیشی بە تۆپ و ڕەشاشی گەورەش بێهێز بوو، چاککردن و دروستکردنی تۆڕی ڕێگەو هێڵی ئاسن زۆر پێویست و زەرووری بوو، هەوڵێکی زۆریش درا لە دروستکردن و

چاككردنی هەندێك لە ڕێگەكان، هەموو سەربازێك ئەوە دەزانێت كە دروستكردنی ڕێگەو چاككردنی هێڵە ئاسنینەكان و خانوو شتێكی زەرووری و پێویست بوو، هەروەها لە دوای ئەوانەش دروستكردنی مۆڵگەی هەمیشەیی بۆیان، كاتێك ڕۆنشتد (بۆ یەكەمجار دیواری ڕۆژئاوای پشكنی، پێكەنی. سەرەڕای ئەوەش نەبوونی هۆیەكانی پەیوەندی كەم بوو، هەروەها نەبەسترابوونەوە بە فڕۆكەخانەكان و بە مۆڵگەی چەكەكانی دژە فڕۆكە، بەڵام پڕوپاگەندەكان وا نیشانیان دەدا كە دیواری ڕۆژئاوا زۆر بەهێزترە لە (ماجینۆی كۆن). هەرچۆنێك بێت كەچی بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە دیواری ڕۆژئاوا وەكو تەختەیەكی شەترەنجە و تواناشی باشە بۆ بەرگریكردن، كەچی هێڵی ماجینۆ لە هێڵێكی گەورەو كۆن زێتر نەبوو. بەڵام ڕاستینەی شێوازی بەرگریكردنی قووڵایی لە دیواری (ڕۆژئاوا) لە ڕاستیدا لە ئامادەباشیدا نەبوو، بە پێچەوانەی هێڵی ماجینۆ كە لە ژێر چاودێریەكی ورد دروستكرا، كە بەهێزتر بوو لە دیواری ڕۆژئاوا، شتێكی سەلمێنراویشە كە تیپەكان لە چاو هێزەكانیان زۆر گەورەبوون، شتێكی سروشتیش بوو كە ژمارەیەكی زۆر لە سیخور بەشداری لە دروستكردنی دیواری ڕۆژئاوادا بكەن، هەر بۆیەش فەڕەنساو بەریتانیا پروپاگەندەكانی ئەم دیوارەیان زانی، كە زیادەڕەویەكان لە پێناسەی هێزەكەیانە جگە لەوەش هێزەكانی ئەڵمانیا لە ئەیلوول و تشرینی دووەم وا ڕەفتاریان كرد كە لە ٧٥٪ لە سوپای ئەڵمانیاو هێزی ئاسمانی لە ڕۆژهەڵات دەجەنگان و دوور لە ڕووباری (بەگ) و هیچ هێزێكی ئەڵمانیا لە ڕۆژئاوا نەمایەوە، تەنها چارەگێكی نەبێت، ئەویش بەبێ هێزی زرێپۆش بوو، جگە لەوەش لە فڕۆكەخانەكانی ئەڵمانیاش هیچ هێزێكی وەها نەمایەوە تەنیا چەند یەكەیەك لە هێزی

ئاسمانی نەبێت، ئەم تیپە بچووکانەی ئەڵمانیاش تەنیا بۆ پاراستنی سنوورەکانی لەگەڵ هۆڵەندە و بەلجیکاو فەرەنسا بەکارهێنران، هەر یەکێکیش لەم یەکانە کەرتێکی فراوانی لە ئەستۆدابوو، لەوێدا هیچ بەرگریەك نەبوو بە مانای راست، بەڵکو هێزەکانی ناوخۆش بەو شێوەیە نەبوو، لەم ناوچانەشدا هیچ پێکدادانێکی ئاسمانی رووی نەدا، کەواتە دوو تیپ سەرو زیادە بۆ چاودێریکردن و بەس، لەوێدا دۆخێکی شەڕ هەبوو بەڵام بەبێ رووبەڕووبوونەوە، چونکە تەقەکردنێکی وەها نەبوو تەنیا تەقەکردنێکی هەوایی و وێل نەبێت، زۆربەی زەرەرو زیانەکان لە ئەنجامی هێرشەکانی ئاسمانی یان تەقینەوەی مینەکان بوو لە شەودا، لەڕاستیشدا پەیوەندیەکی خۆشەویستیش لەنێوان کەرتەکانی پێشەوەی هەردوولا دروست بوو، هەردوو لا دڵنیا بوون لە یەکدی بۆ کاری چاکەو لەیەکتر نزیك دەبوونەوە، وەك بڵێی پەیمانێك لە نێوان پیاوە بەشەرەفەکان مۆرکرابێت، بێ ئەوەی یەکێك لە هەردوو لایان ئەم پەیماننامەیە پێشێل بکات، پێش ئەوەی شەڕی پۆڵەندا لە ئەیلوول کۆتایی پێ بێت، تیپەکانی ئەڵمانیا کە زیادبوون لە پێویست کێشرانەوە بۆ رۆژئاوا، دوای کۆتایی هاتنی ئەو شەڕەش هێزەکانی ئەڵمانیا بەرەو (راین) جوڵان، هیچ هێزێکی وا لە رۆژهەڵات نەمایەوە، تەنیا چەند هێزێکی کەم و لاواز نەبێت، تا ئەم کاتەش هیچ شتێك رووی نەدا لە رۆژئاوا کە باسی بکەین.

تا ئێستا شەعبیەتی هیتلەر بەرزە، گەلی دوودڵیش هەمیشە باوەڕی بە هیتلەر هەیەو، بڕواشیان وایە کە دەستەی ئەرکانی گشتی بە بەردەوام لەسەر هەڵە دەڕۆیشت، ئەو کاتە سەرکردەی گشتی سوپا موشیر (براوچش) باوەڕی بەوە هەبوو کە هێزێکی لاواز بەسە بۆ چاودێریکردنی

سنووری رۆژئاوا، تاکو له چرکهساتهکانی کۆتاییدا سیاسیهکان چارهسهریهکی ئاشتیانه دهدۆزنهوه بۆ کێشهکه، لهبهر ئهوه ڕێوشوێنهکانی سهربازی له وێدا تهنیا بۆ بهرگریکردن بوو، ههروهکو بهم پێیه سوپای ئهڵمانیا ڕێکیخستبوو، کاتێك هیتلهر پلانی خۆی ڕاگهیاند، پێکدادان له نێوان خۆی و بارهگهی سوپا ڕوویدا، بۆیه هیتلهر فهرمانێکی دهرکرد که سوپای ئهڵمانیا له رۆژئاوا وا ڕێکبخرێت که بتوانیٚ هێرش بکات ئهگهر پێویست بوو، بۆیه کاتێك رۆنشتد له پایزی ۱۹۳۹ گهیشته (کۆبلنز) بارودۆخهکهی زۆر به دژواری بینی.

بهرهی رۆژئاوا دابهش کرابوو بهسهر سیٚ پێکهاتهی سوپا: پێکهاتهی سوپای (ب) به سهرکردایهتی فۆن (بۆك) بوو، که پێکهاتبوو له سوپای ههژدهم و شهشهم و چوارهم، لهگهڵ بهشێکی زۆری فهیلهقی ئالی، ئهم پێکهاتهیه له قوڵایی وا دانرا له راینی خواروو تاکو رۆژههڵات، به شێوهیهك که تیپی پێشهوه لهسهر سنووری رۆژههڵاتی هۆلهندهو بهلجیکاو بهشێکی ناوچهی ئیفل بێت، ئهم پێکهاتهیه زۆر به هێزتر بوو له پێکهاتهکانی تر که بوو بههۆی هیوای پیاوه گهورهکان، پێکهاتهی سوپای (ا) که پێکهاتبوو له سوپای دوازدهههم به سهرکردایهتی (لیست) بوو سوپای شانزهههمیش به سهرکردایهتی (بش)بوو، که بهبیٚ هێزی ئۆتۆمبیل بوو، ئهم پێکهاتهش له باشوور نزیك بوو، ههر بۆیه له مهڵبهندی بهرهی رۆژئاوا جێنشین بوو، تیپی پێشهوهش که لهسهر سنووری فهڕهنساو لۆکسهمبۆرگ و بهشێکی لای راستی درێژ دهبۆوه بۆ باشووری رۆژئاوا، که له بروم نزیك بوو، بهشی لای چهپیشی نزیك (نیرزك) له مسار بوو.

پێکهاتەی سوپای (ج) بە سەرکردایەتی فۆن (لیب) لەسەر سنووری ئەڵمانیا جێگیربوو، کە لە نیرزك درێژدەبێتەوە بۆ سار بڕۆکن تا دەگاتە سنووری باشووری. هەروەها لە بلاتینای بافاری دوای بۆ رۆژهەڵات لە راینی سەروو لە نێوان (کارلس روها)و (بازل) بۆ باکوور، ئەم پێکهاتەی سوپایەش بوو بە ئەلقەی پەیوەندی لە نێوان هەردوو پێکهاتەی (ا-ب) پلانی هێرشەکانی ئەڵمانیا لە کاتی پێویستداو لە کۆتایی ساڵی ۱۹۳۹ پەیڕەوکران کە بەم جۆرە بوو:

- پێکهاتەی سوپای (ب) بە هێز هێرش دەکات بۆ باشووری هۆڵەندەو بەلجیکا بە ئاراستەی نۆکەندی (دوقل) ساڵی ۱۹۱٤ روون بۆوە کە ئامانجی ئەڵمانیاش هەر لەمە دەچوو، کاتێك سەرۆکی دەستەی ئەرکانی پێشوو (کۆنت شلیڤن) پلانەکەی دانا، ئەو پلانەی کە بە پێی بیرو بۆچوونەکەی جێبەجێنەکرا، (رۆنشتد) نەیزانی پلانی ساڵی ۱۹۳۹ بەدوای پلانی ساڵی ۱۹۱٤دا هات و بەیەك گەیشتن یان لەوێدا هۆکار هەبوون بۆ گەڕانەوەی پلانی شلیڤن بە شێوەیەکی فراوانتر. هەر چۆنێك بێت فەرمانەکە ئەرکی خرایە ئەستۆی پێکهاتەی (ب) بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە، بۆیە ئەرکی دیاریکراوی رۆنشتد ئاسانتر بوو، هەروەها لەسەر پێکهاتەی (ا) هەڵسێت بە ئەرکێکی سەرەکی کە ئەویش هێرش کردن بوو بۆ (موون)ی ناوەڕاست و بەس لەنێوان (جفت و سیدان) بۆ ئەوەی لای چەپی پێکهاتەی باکوور لەوێدا جێگیر بێت، ئینجا هەموو شتێك لەسەر پێشکەوتنی هەلۆێستەکان دەوەستێت، بەڵام پێکهاتەی (ج) کە پێویستە دواتر بەشداری لەشەڕدا بکات. کەواتە هێڵی ماجینۆ لە باکوورو رۆژئاوا پێشێل دەکرێ ئیلزاس و لۆرین داگیر دەکرێ، کاری بارەگای رۆنشتد هەر لە کانوونی یەکەمی ۱۹۳۹ پشتی بەم بنەمایانەی خوارەوە بەست: گەر

هاتوو فەرمانی هێرشکردن دەرچوو بەرەو رۆژئاوا، ئەوا پێویست دەکات پلانی داهاتوو بگۆڕدرێ، سەرۆکی دەستەی ئەرکان (فۆن رۆنشتد) جیا دەکرایەوە لە لیوا (فۆن مانشتاین) بە گیانێکی داهێنەرانە، چونکە ئەو هەمیشە لە بیرکردنەوەدا بوو لە هەموو مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراو، چونکە چاکەوپیاوەتی لە دیارکردنی پلانی کارکردن بە شێوەی کۆتایی، تەنها هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. رۆنشتد بۆچوونی سەرۆکی دەستەی روکنەکەی هەر زوو قەبووڵ کرد.

لە دواییدا لەگەڵ سەرۆکی دەستەی ئەرکانی خۆی لەمەڕ روونکردنەوە لەسەر پلانی نوێ بۆ سەرکردایەتی باڵا کەوتنە گفتوگۆ، دوای ئەوەی ماوەی چەند مانگێك رابورد بۆ تەواوکردنی.

چونکە بەرپرسیارێتی ئەنجامی پلانی پێشنیارکراو بەتەنیا دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردەی باڵا، واتە دەکەوێتە ئەستۆی فۆن رۆنشتد بەگوێرەی داب و نەریتی سەربازی.

رۆنشتدو سەرۆکی دەستەی روکنەکەی دەیانپرسی کە ئاخۆ ، هێرشی پێکهاتەی سوپای باکوور لە هۆڵەندا دەبێتە هۆی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە بەخێراترین کات. هەریەك لە هۆڵەندا و بەلجیکاش هەڵستان بە دانانی بەربەستی بەهێز لە دژی زرێپۆشەکان، لەو بەربەستە گرنگانەش دروستکردنی نۆکەند و ناوچەی گۆماوەکان بوو لە هۆڵەندا، کە دەبوونە هۆی دروستکردنی گرفتی ترسناك لە بەردەم هێرشکردنی زرێپۆشەکان، هۆڵەندا و بەلجیکا کەمتەرخەم نەبوون لە بە هێزکردنی بەرگریەکانی سنوور و قەلابەندیەکانی ناوەخۆ، بەڵکو هێڵی قەلابەندی قووڵ و توندو تۆڵیان هەبوو، چونکە ماوەیەکی درێژە دۆخی شەڕکردن

هەیە، بۆیە پێویست بوو هەردوو سوپای هۆڵەندا و بەلجیکا کاتێکی زۆریان دەستبەربکردایە بۆ ئەنجامدانی ئامادەباشییەکی تەواو بۆ بەرگریکردن.

لێرەدا رۆنشتد پێشنیاری کرد بە پشت بەستن بە پێشنیارەکانی (مانشتاین) فەیلەقی زرێپۆش لە ژێر فەرمانی پێکهاتەی سوپای (ا) دەبێت،، هەروەها دوای ئەوەش پێشنیاری ئەوە کرا ئامانجەکانی پێکهاتەی (ا) زیاتر لە پێشوو فراوان بکرێن بەرەو رۆژئاوا، بەڵکو ئەم پێکهاتە هێرشەکەی کورت نەکاتەوە بۆ (موون)ی ناوەڕاست و بەس، بەڵکو دەبێت لەم زێیە بپەڕێتەوەو لەپێشڕەوی بە ئاڕاستەی رۆژئاوا بەردەوام بێت، بەمەش پێکهاتەی سوپای (ا) یان دەتوانی پارێزگاری لەلای باشووری پێکهاتەی (بوك) بکات، یان هەڵدەستێت بە پشتگیری کردنی پێکهاتەی سوپای (ب) لە رۆژئاوای (موون) و بەرەوپێشچوونی بۆ باکوور بە ئاڕاستەی (بروکسل)، بۆئەمەش رەزامەندی بارەگای دەستەی ئەرکانی سوپا وەرگیرا بۆ ئەم پێشنیارانە. لە مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٤٠ خزمەتگوزاری هەواڵگری ئەڵمانیا زانیاری لەسەر لەسەر گرێدانی کۆنگرەیەك لەنێوان ئەفسەری ئەرکانی فەڕەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندە لە (بروکسل) دەستکەوت. وا نەبێت ئەمەش شتێکی سەیر بێت چونکە بریتیبوون لە کۆمەڵێك رێوشوێنی چارەسەری. بەڵام ئەوەی سەیر بوو ئەو شتە دیاریکراوانە بوو کە لە نێو کۆنگرەی ناوبراودا باسکران و هەموویان ئاشکرابوون، بەمەش دەستەی ئەرکانی سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا زانیاری هەبوو لەسەر سوپای بەریتانیا کە هێزەکانی دادەبەزاند لە ئەوروپا و هێزێکی سوپای فەڕەنساش پێشڕەوی دەکات بە بڕینی سنووری فەڕەنسای باکوور راستەوخۆ بەرەو (بروکسل) بەمەبەستی

لەیەك نزیکبوونەوەی هەڵوێستە بەیەك چووەکانیان، هەروەکو لە ساڵی ١٩١٤ روویدا، هەروەها بۆ دڵنیابوون و پشتگیریکردنی کاریگەری سوپای بەلجیکی و هۆڵەندی گەر هاتوو ئەڵمانیا سنووری بەزاند.

ئەم زانیاریانە، بوونە پشتگیری بۆ پێشنیاری لیوا فۆن (مانشتاین)ی دەربارەی گۆڕینی هەیکەلی گشتی بۆ پلانەکانی جموجۆڵکردن کە دابەش کرابوون، ئێستا شتێکی روون و ئاشکرایە کە هێرشی هاوپەیمانانی رۆژئاوا کە بریتیبوون لە هەر چوار وڵاتی فەرەنسا و هۆڵەندا و بەلجیکا و ئینگلتەرا، کە لەناو سنووری بەلجیکا دەبێتە هۆی پێکدادانی هێزەکانیان لەگەڵ هێرشی سەرەکی کە پێکهاتەی سوپای (ب) یە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەنجامێکی خێرا لە شەڕەکە بەدەست نەیەت. بەڵکو دەبێتە هۆی شەڕێکی درێژخایەن لە ناوچە قەڵابەندی و بە هێزەکانی هۆڵەندە و بەلجیکا. بۆیە راستکردنەوەی پلانی نوێی رۆنشتد و مانشتاین بۆ ئەوەبوو چەقی قورسایی سوپا بگوازنەوە بۆ مەڵبەند، یان بۆ پێکهاتەی سوپای (أ)

لەسەر ئەمە خێرایی رۆیشتنی کتوپڕ بۆ یەکلاییکردنەوەی هێڵی نامور- سیدان بۆ رۆژئاوا،دەبێتە هۆی خێرایی پێشڕەوی بۆ پێشەوە تا دەگاتە ( ساحل القنال) ی ئینگلیزی نێوان دانکرك و ئەبفیل، دوای ئەوەش لەکاتی کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسی - ئینگلیزی بۆ ناوچەکانی دەوروبەری برۆکسل واتە ئەو پێشڕەویە خێرایەی پێکهاتەی سوپای (أ) کاریگەری دەبێت بۆ هەردوولاو پشتەوەی ئەو هێزانە بە ئاراستەی ناوبراو، ئەگەر سەرکەوتووبوو لە بڕینی هێڵی کشانەوەی سوپای بەریتانی بۆ بەندەرەکانی کەناڵ و بڕینی هێڵی کشانەوەی هێزەکانی فەڕەنسی بۆ فەڕەنسا. چونکە دۆزەکە هەموو چواردەوری درابوو، وای لەدوژمن کرد

واتێبگات کە هێزە سەرەکیەکانی ئەڵمانی لە باکوور دان. دوای جیاوازیەکی زۆر لە بیرو بۆچوونەکان لەنێوان هیتلەرو سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا، هیتلەر بڕیاریدا لەسەر ئەو پلانەی کە پێشکەشی کرابوو، بەمجۆرە بوونی پلانێکی کۆتایی بەدیارکەوت بۆ جوولەکردن کە بۆی نووسرابوو رۆژی ١٠ ی مایس دەبێت جێبەجێ بکرێ.

لای چەپی بۆ پێکهاتەی سوپای (ب) واتە بۆ سوپای چوار ، فۆن ( کلوکا) لەژێر سەرکردایەتی پێکهاتەی سوپای رۆنشتد بێت، بەبێ ئەوەی ئەو کەرتەی کە بۆی دیاریکراوە بگۆڕدرێ، بەمجۆرە سێ سوپا کەوتە ژێر فەرمانی رۆنشتد: سوپای چوارو دوانزەهەم و شانزەهەم، هەروەها بەشێکی گەورەش لە کەرتەکانی فەیلەقی زرێپۆش و ئۆتۆمبێلەکانی ئەڵمانیا لە ژێر فەرمانی ئەودابوو. لیوا فۆن کلیست سەرکردایەتی چەکە زرێپۆشە یەکلاییکەرەوەکانی دەکرد کە ئەوکاتە بەناوی: پێکهاتەی زرێپۆشەکان ناویان دەبرد. کەچی کودریان یەکەکانی پێشەوەی سوپای ئۆتۆمبێلی گرتبووە ئەستۆ، بەمجۆرە ٩ تیپی زرێپۆش و ئۆتۆمبێل کەوتنە ژێر سەرکردایەتی فۆن کلیست و گوازرانەوە بۆ مەڵبەندی ناوچە داگیرکراوەکانی هەردوو سوپای شانزەهەم و دوانزەهەم.

ئەم یەکانە گەورانەی کەوتبوونە قوڵایی بە پلەیەك کە یەکەکانی پشتەوە مۆڵگەکانی گرتبوو کە ماوەیەکی زۆر دوور بوو لە رۆژهەڵاتی (راین)، جگە لەوەش فەیلەقی پانزەهەمی زرێپۆش لەوێدا هەبوو کە پێکهاتبوو لە تیپی پێنجی زرێپۆش و تیپی حەوتەمی زرێپۆش (رومل) کە راستەوخۆ لە ژێر فەرمانی سوپای چوارەمدا بوو. بەمجۆرە ئەو هێزانەی کەوتبوونە ژێر دەستەڵاتی سەرکردایەتی رۆنشتد پێکهاتبوو لە ژمارەیەکی زۆر لە پیادە و یانزە تیپی زرێپۆش و ئۆتۆمبێل، ئەمەش ئەرکێکی قورس بوو.

فـەرمانڕەوایی کردنـی ژمارەیـەکی گـەورە لـە یەکـەکان کـە تاڕادەیـەك هێزلەکان گەورە بوون و لەشوێنێکی بەرتەسکیش بوون لە نێوان (راین) و سنووری رۆژئاوا، لەگەڵ دابینکردنی هەموو پێداویستیەکان بۆ کەرتەکان، لەمەش گرانتر فەرمان دەرکردن بوو بەجموجۆڵ پێکردنیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان. ئا ئەمە هەڵوێستی رێژەیی بـوو لـە مایسی سـاڵی (١٩٤٠) ، هەر لە رۆژی ٩ مایس زانیاری لە بارەگـای سـەرکردایەتی گشـتی گەیشـتە رۆنشتد کە بەم نزیکانـە کەرتـەکانی بـەریتانیا دادەبـەزن بـۆ کـەنارەکانی بەلجیکا و هۆڵەندە.

هێزەکانی ئەڵمانیا لە ماوەی شەش مانگدا– لـە مـاوەی نێـوان کۆتـایی هاتنی شـەڕی پۆڵەنـدا و نێـوان سـەرەتای دەسـتپێکردنی شـەڕی رۆژئـاوا توانی تاقیکردنەوەیەکی زۆر لەسەر شەڕی پۆڵەنـدا بـە دەسـت بـێنی. لـە ئەنجامی ئەو مەشقە بەردەوامـەی لـەژێر روونـاکی ئـەو تاقیکردنەوانـە بـە دەستیهێنا، هەر لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا تـوانرا ئاسـتی لێهـاتوویی و شەڕی هەندێك لە سوپای ئەڵمانیا بۆیەکـەم جـار بـە شـێوەیەکی بەرچـاو بەرز بکرێتەوە.

جارێکیان فڕۆکەیـەکی ئـەڵمانیا لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٤٠ بـوو کـە دوو ئەفسەری ئەڵمانی هەڵگرتبوو لە رێگای خۆی لایدا و ناچار بوو لە ناوچەی هاوپەیمانان بنیشێتەوە، ئـەم دوو ئەفسـەرەش هەنـدێك لـە بەشـی پلانـی جووڵەی ئەڵمانیایان هەڵگرتبوو، دوای ئەوەی نیشتنەوە توانیـان هەنـدێك لە کاغەزەکانیان بدڕێنن، لـە بەرامبـەر ئەمـەش هێـزی ئاسمـانی ئـەڵمانیا گرنگیەکی زۆری بەم کارەدا، بەڵام هیتلەر گرنگی پێدانی لەوە کـەمتربوو، لە هاوپەیمانەکانیش وا بێت کە ئەم دابەزینە فێڵێکی نەخشـە بۆکێشـراوە بۆ سـەر لێشـێواندنیان، جگـە لەمـەش ئـەو زانیاریانـەی کـە لـەلایان بـوو

کورتکراوەی پلانە کۆنەکە بوو، نەك نوێیەکە کە رۆنشتد و مانشتاین دایان نابوو، بۆیە ئەم رووداوە هیچ زیانێکی بە ئەڵمانیا نەگەیاند.

رووداوێکی تریش بە ناشارەزایی لەماوەی نێوان تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٣٩) و مایسی ساڵی (١٩٤٠) روویدا، ئەو فەرمانە گۆڕدرا کە بۆ هێرشکردنە سەر سنوور و گەڕانەوە دەرچوو بوو، لە یازدە جار کەمتر نەبوو، هەتاکوو ئەو خوێنەرانەی کە زانیاری سەربازیشیان نییە، دەتوانن لە رێکخستن و کۆنترۆڵی تەواوی جووڵەی ئەم هێزە گەورانە تێبگەن کە چەند جارێك دەبووایە هێرش بکەن و بگەڕێنەوە دواوە.

ئەم کارەش هیتلەر لە پێشوودا جارێکیان بە رێژەیەکی بچووك لە پاییزی ساڵی (١٩٣٨) پێش ئەوەی هێرش بکرێت بەرەو (السودیت) ئەم شێوازەی بەکارهێنا بوو. جارێکی تریش لە کۆتایی ئابی ١٩٣٩ بەکاریهێنا بوو، پێش ئەوەی شەڕی پۆڵەندا دەست پێبکات، جێبەجێکردنی ئەم کارەش بۆ مەبەستێکی سیاسی بوو.

بۆیە زۆرجار هۆکاری گۆڕینی فرمانەکان لەبەر ئاڵۆزی کەش و هەواوە بووە، چونکە سوپا لە کاتی ئاڵۆزی کەش و هەوا فەرمانی پێ دەگات بۆئەوەی واز لە هەموو رێ و شوێنێکی وەرگیراو بهێنن، وەك بەفر و باران لە چیاکانی رۆژئاوای (راین) بۆئەوەی بەم کارە هەڵنەستن.. ئەم رۆژانە رۆژی ناخۆشبوو بۆ پیاوانی کەش و هەوا، بۆیە رۆنشتد و زۆر لە ئەفسەرەکان لەو باوەڕەدا نەبوون کە هەرچۆنێك بێت ئەوان لە هەر کات و ساتێکدا هەڵبستن بە هێرشکردن.

هیتلەر لە ٦ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ دەرفەتێکی ئاشتی رەخساند، ئەمەش لە (رایخشتاغ) بوو کە کاتێ وتارێکی پێشکەش بە هەموو جیهان

کرد بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ، لەبەرئەوە سوپا داوای کرد لە مانگێکەوە بۆ چەند مانگێکی تر هەڵمەتێك لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە لە دژی هاوپەیمانەکان بدرێت، بۆیە یاریدەدەری هیتلەر لیوا (شبدل) لە ماوەی زستاندا چەندین جار سەردانی یەك لە دوای یەکی بۆ بارەگاکان و یەکەکان کرد بۆئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری کاریگەری بارودۆخ و ئاو وهەوا بێ لەسەر رێگا و زێیەکان.

زستانی (١٩٣٩-١٩٤٠) زستانێکی سەخت بوو، بۆیە پردە گرنگەکان بە ئاراستەی (راین-مووزل) جێگای هەڕەشەکردن بوون لەبەر ترسناکی هەڵستانی ئاوی بەفرەکان، هەروەها رێگا خوار و خێچەکانی ناوچەی چیاکانی نێوان سنور و (راین) بەستەڵەك و ناخۆش بوو، ئۆتۆمبێلە سەربازیەکان هەڵدەخلیسکان، کەچی ئەو تۆپانەی کە بە ئەسپ و بارگین رادەکێشران دەیانتوانی زۆر بە هێواشی بەرەو پێشەوە بڕۆن. رۆنشتد ئاگاداری کردنەوە لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك لەکاتی زستاندا، چونکە سەرکەوتنی ئەم جۆرە کردانەلەسەر چەند هۆکارێك بەندە کە لەحیسابی مرۆڤدا نییە. لە دواییدا دەبێت ئاماژە بە گواستنەوەی فۆن (مانشتاین)ی پرشنگدار بکەین لە پلەی سەرۆکی دەستەی ئەرکانی سەرکردایەتی رۆنشتد و، گۆڕینی بە لیوا فۆن (سود نستیرن) لە ئەنجامی ناکۆکی و رق و قینە لەبەرئەوەی وادادەنرێت خاوەنی پلانی جوڵەی نوێیە کە زۆر رشتبوو لەسەر جێبەجێکردنی و سوودەکانی، بەڵام رۆنشتد سەرنەکەوت لە راگرتنی ئەم گواستنەوەیە، پلەی (مانشتاین) بەرزکرایەوە بۆ پلەی لیوا و سەرکردایەتی کردنی فەیلەقیشی پێ سپێردرا، بەلام فەیلەقەکە هێزێکی پیادە بوو!!

رەنگە بەهۆی ئەوەی مانشتاین بەناوبانگ بوو بە لێهاتوویی و بیر و بۆچوونەکانی بۆیە خۆشەویست نەبووبیێ، لەگەڵ ئەوەی سەرکردەی گشتی و دەستەی ئەرکانەکەی ئاخیان هەڵکێشا لە کاتی جیابوونەوەی مانشتاین، بەڵام لەگەڵ ئەوەش توانیان قەناعەت بەسەرۆکی ئەرکانی نوێی لەسەرخۆ و شارەزا فۆن (سود نستیرن) بێنن.

لێرەدا هێڵە دیارەکان بوون بە هێڵی ستراتیژی، ئەرکی پێکهاتەی سوپای رۆنشتد و سێ سوپاکەی و هێزی زرێپۆشەکەی بوو بەرەو پێشەوە بچن بە هێڵی نامور —سیدان و بگەنە کەناری کەناڵی فەرەنسی لە نێوان دانکرك و ئەبیفیل، بە خێراییترین کات بەمەبەستی بڕینی گشت هێڵەکانی گەڕانەوەی بەریتانی و فەرەنسیەکان بەرەو بەلجیکا پێشڕەویان کردبوو، بێ ئەوەی خۆی خەریك بکات بە بیرکردنەوە لە هەردوولا باڵی پێکهاتەی سوپاکەی.

چاوخشاندنێك بە نەخشەی فەرەنسا ئەوە بەدیار دەخا کە بڕینی هەر میلێك بەرەو رۆژئاوا لە لایەن پێکهاتەی سوپا دەبێتە هۆی ئەوەی باڵی باشووری پێکهاتەی سوپای رۆنشتد، واتە دەبێتە هۆی رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەو مەترسی.

رۆنشتد بە بوونی هێزی یەدەکی بەهێزی فەرەنسای زانی لە دەوروبەری پاریس و ( شالۆن —سیر مارن— فردان) ، هەروەها بەهرە باشەکەی دەستەی روکنی فەرەنساشی لەبەرچاوان بوو، هەروەها ئەوەشی دەزانی کە تۆڕی رێگا و هێڵەکانی شەمەندەفەریش یارمەتیدەریوون بۆ گواستنەوەی هێزەکان بەخێراییەکی زۆرەوە، رۆنشتد بۆچوونێکیشی هەبوو دەربارەی لیوا(غاملیان) ی فەرەنسی، وا راهاتبوو بە پێکەنینەوە

دەبارەی بڵێت " بێگومان بچووکەکەم (غاملیان) دەزانێ چی دروست دەکات" لەساڵی ١٩٣٦ لە لەندەن بوار بۆ رۆنشتد رەخسابوو تاکو غاملیان بناسێ، ئەمەش لەوکاتە بوو کە بەنوێرەیەتی سوپای ئەڵمانیالە رێورەسمی جەنازەی مەلیك جۆرجی پێنجەم یەشداری کردبوو.

## بەشی شەشەم

### سەرکەوتن لە فەڕەنسا

لەوکاتەی شەڕ لە (ئەرتواز ) و (فلاندەرس ) کۆتایی پیّ دەهات لە سەرەتای مانگی حوزەیران. کۆکردنەوەی سوپای ئەڵمانی دەستی پێکرد لە رۆژئاوا بۆ هەڵمەتی دووەمی سوپاکە بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە جەنگ لە فەڕەنسا، بۆ گەیشتنیش بەو ئامانجە پێوست بوو سوپای فەرەنسی دابمرکێنێتەوەو فەڕەنساش داگیر بکات. هێڵێکی بەرگری درێژیش لە باشوور دروست بوو بەم شێوەیە (ئابیڤیل ) — (ئامیانس ) —( سواسۆن ) —(رووباری ئایسن) —( سیدان )سنوری ئەڵمانی کە ناوچەی ئەلزاسی و لۆرینی تا باکووری بازل بۆ خۆی رادەکێشا. ئەم بەرە درێژەش دابەش دەبوو بۆ سیّ کەرت بەم شێوەیە : سوپای (ب) بە فەماندەیی (فۆن بوك ) و بەشی هەرە گەورەی هێزە زرێپۆشەکان بە فەرماندەیی (کلیست)لە (ئەبیڤیل) گواسترایەوە بۆ لێواری (لاڤیر). پێکهاتەی سوپای (أ) بە فەرماندەیی (فۆن ڕۆنشتد) لەگەڵ بەشێك سوپاو فەیلەقی (کۆدریان) ی زێپۆش ناوچەکانی لای رۆژهەڵاتی سوپای (ب) یان داپۆشی لە لێواری (لاڤیر) تاوەکو نزیك (مۆنتمیدی).

پێکهاتەی سوپای (ج) یش بە فەرماندەیی فۆن (لیب ) تەرخانکرابوو بۆ ناوچەی (مۆنتمیدی ) و هێلی (ماجینۆ)و(راین) درێژ کرایەوە تاوەکو باکووری بازل. بەشێوەیەکی گشتی ئامانج لەم دابەش کردنە هێرش کردن بوو بە هەردوو پێکهاتەی سوپای (أ) و(ب) و لە هەمانکاتدا هێرشی کردن بوو بە پێکهاتەی سوپای (ب) بەرە باشوور و رۆژئاوا تاوەکو سنوری

باشووری فەڕەنسا لە (برانیس ) و دەریای سپی ناوەڕاست، جگە لەمەش ئامانج سەرەکی پێکهاتەی سوپا(ب) ی سوپا گەمارۆدانی (پاریس) بوو لەگەڵ بەردەوام بوون بەرەو (تۆرس و بۆردۆ)، لەسەر پێکهاتەی سوپای رۆنشتد پێویست بوو پێشڕەوی بکات بە ئاراستەی هێلی دیگۆن و دۆلی (رۆن) بەرەو (لیۆن )و(مەرسیلیا). ئەرکی پێکهاتەی سوپای (ج) بریتی بوو لە داگیر کردنی لۆرین و ئەلزاس بوو لە باکوور و رۆژهەڵات. هەمان رۆژیش خشین و پێشڕەوی لەم بەرە مەزن و فراوانە رووینەدا. بەڵکو بڕیاردرا پێکهاتەی سوپای (ب) رۆژی (٥) حوزەیران و پێکهاتەی سوپای(رۆنشتد) رۆژی (٩) حوزەیران و هەروەها پێکهاتەی سوپای(ج) رۆژی (١٤) ی حوزەیران هێرشەکانیان دە ستپێکەن، بەم شێوەیە شەڕ زۆر توند بوو بە درێژایی بەرەکانی جەنگ لەماوەی رۆژانی یەکەمی دا. زۆریش پێویست بوو هێلی (خیگان ) ی بەرگری تێکبشکێندرێ کە لە ناوچەی (سوم ) بۆ نزیك (سیدان ) درێژ بووبووەوە کە پشت ئەستوور بوو بە هەردوو رووباری (سوم ) و (ئاسین) و ئەو قەڵابەندیە کۆنانەی لەوێ هەبوون، بەهەمان شێوە پێویست بوو بە سەر هەردوو هێلی (ماجینۆ )و(راین) ی سەرووی (سیران ) زاڵ بن تاوەکو سنوری سویسرا.بەڵام (بێگ) نەیدەتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لەپەرینەوەی بە (سوم) تەنها پاش شەڕێکی زۆر سەخت نەبێت. هەروەها شەڕەکانی سەرەتا کە (لیب) لە ئەستۆی گرتبوو لە دژی هێلی (ماجینۆ ) زۆر توند بەڕێوەدەچوو. هەرچۆنێك بێت پاش ٤٨ سەعات لە جەنگێکی توندو سەخت بە هاوکاری هێزی ئاسمانی توانرا گشت قەڵابەندیە مەیدانیەکانی سوپای فەڕەنسا تێکبشکێنرێ. لەلایەکی دیکەوە سوپای رۆنشتد رووبەڕووی بەرگریەکی توند بووەوە بە تایبەتی

له ئایسن، بەڵام ڕۆنشتد لەماوەیەکی کورتدا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لە سەرانسەری بەرەی جەنگدا. لەلایەکی ترەوە بەشی دووەمی هێرشەکان سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا بە تایبەتی پاش ئەوەی سوپای ئەڵمانی توانیبووی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە پرۆسەی باشوور.

سوپای فەڕەنساش لە باشوور هیچ هیوایەکی نەمابوو لە بەرگری و ململانێکردندا، نەشیدەتوانی بەشێك لەسوپاکەی بەهێلی (ماجینۆ) بکشێنیتەوە، چونکە دەبووە هۆی بێ هێز بوونی بەرگری کردن لەم هێلە. هەروەها نەشیدەتوانی بەرگری لەم هێلەبکات، چونکە پێکهاتەی سوپای ڕۆنشتد بەتەواوەتی دەستی گرتبوو بەسەر هێلی (ماجینۆ) و پشتەوەی هێلەکە بە ئاراستەی (سیران).

دەتوانین پێشڕەوی هەرسێ پێکهاتەی سوپا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: لەرۆژی ١١ ی حوزەیران هێزەکانی ڕۆنشتد گەیشتنە (ریمس) هەروەها لە ١٢ حوزەیران گەیشتنە ( شالۆن –سیر– مارن ) ،بەڵام پێکهاتەی سوپای (کۆدریان) ی زرێپۆش پێشڕەوی کرد بەرەو باشووری رۆژئاوا. ڕۆنشتد رازی بوو سێ وشەی ڕەمزی بەکاربهێنێت، کە لە زاراوەکانی تۆپی پێ وەرگیرابوون، بۆ نموونە : وشەی (نیوەی کات)، ئەم وشانەش بە ئامێری بێتەل درایە کودریان لەو کاتەی هێزە زرێپۆشەکانی دەگەیشتنە ناوچەی ( لانکرس)

وشەی ڕەمزیی یەکەم ئەو مانایەی دەدا: " بۆ لای رۆژهەڵات بسوڕێوە بەرەو (بەلفۆرت) بۆ ڕێگەگرتن لە پاشەکشێی فەرەنسیەکان لە ئەلزاس". هەروەها وشەی ڕەمزیی دووەمیش بەمانای " بەردەوامبە لەپێشڕەوی

لەسەر هێڵێکی راست بە ئاراستەی باشوور بەرەو (لیۆن – مارسیلیا) بۆ وردوخاش کردنی بەرەی ئەڵپی فەرەنسی لەدواوە، بەمەبەستی بەرگری دژی ئیتاڵیا" دەهات. وشەی رەمزیی سێیەمیش بەم مانایە دەهات: "بەرەو باشووری رۆژئاوا بسوڕێوە بە ئاراستەی بۆردۆ بۆ لەناوبردنی پاشەکشێی فەرەنسیەکان بەرامبەر پێکهاتەی سوپای –ب. بەمجۆرە رۆنشتد توانی هێزەکانی زرێپۆش بەکەمترین بەکارهێنانی بێتەل بەگوێرەی ستراتیژ ئاراستە بکات. کاتێ کۆدریان گەیشتە لانکرس بەم شێوازە فرمانی پێگەیشت بەپێشڕەوی کردن بەرەو باشوور بۆ لیۆن، بەڵام بەرەو ( بیسان کۆن) ئەوا تەنها چەند مەفرەزەیەکی سەربەخۆ ئاراستە کران بۆ داخستنی رێی بیرکاندی لەبەردەم پاشەکشەی فەرەنسیەکان لە بەلفۆرت. ئەم هێزانە گەیشتنە سنووری سویسرا، هەمان رۆژیش فەیلەقی زرێپۆش بەفەرماندەیی فۆن(کلیست) شاری (دیجۆن) ی داگیر کرد. دەتوانین بە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە لەو خێرایی ورەبەرزییە بگەین کە ئەم پێشڕەویە بەخۆیەوە بینی:

شەمەندەفەرێکی خێرای مەزن لەو سەردەمدا بەئاراستەی لیۆن دەڕۆیشت کە ئەفسەری مۆڵەتپێدراوی فەرەنسی تیابوو لەگەڵ ئافرەتەکانیان، ئەم شەمەندەفەرە وەستا بەهۆی خێرایی پێشڕەوی کردنی یەکە پەی پێبردنەکانی ئەڵمانی، بەشێوەیەك کە گەشتیارەکانی سەرسام کرد.

پێکهاتەی هەر سێ سوپاکە لە پاڵ یەکتر پێشڕەویان دەکرد بەدرێژایی بەرەکە بۆ ئەوەی بتوانن رۆژی (٩) ی حوزەیران بگەنە (روین) و رۆژی (١٢) ی حوزەیران بگەنە (دیب) و(١١ ) ی حوزەیران (ریمس) و، رۆژی (١٢) ی حوزەیران (شاسۆن –سیر–مارن )و، هەروەهارۆژی (١٣) ی

حوزەیران (هاڤەر)، هەروەها (١٤) ی حوزەیران بگەنە پاریس و،(کۆڵمار) و(فەردۆن ) یش رۆژی (١٥) ی حوزەیران، بەلاّم لە بەرامبەر دا فەرەنسیەکان نەیانتوانی ریزەکانیان ریکخەنەوە بۆ بەرگری کردن لە (لەوار ) بەهۆی نەبوونی کات. بەم شێوەیە پرۆسەکە بە شێوەیەکی تەدریجی بەرێوەدەچوو، بەلاّم بەشێوەیەکی پچڕپچڕ لێرەو لەوێ پێکدادانی بچووك روویدەدا. بەم جۆرە سوپای فەرەنسی بەرەبەرە بەرەو کزی دەچوو، بەشێوەی هێزێکی لێکترازاو دەهاتە بەرچاو، لە بەرامبەریشیدا یەکە زرێپۆشەکانی سوپای ئەڵمانی بەرەبەرە پێشرەوی دەکرد. بەم جۆرە سوپای ئەڵمانی توانی لە (لەوار) بپەڕێتەوە و لە (١٨) ی حوزەیرانیش هەریەکە لە (شاربۆغ و لیمانس و نانس ) داگیر بکات، لە (١٩) ی حوزەیرانیشدا هەریەکە لە (برێست)و(ئابینال) و(تۆل ) و(لوناڤیل )و(ستراسبۆرگ ) . هەروەها (لیۆن )یش لە (٢٠) ی حوزەیران و (ئەلزاس ) و(لۆرین )یش لە (٢٢) ی حوزەیران. هەروەها هیچ بەرگریەك نەما لە پاش کاتژمێر سێ و پێنج دەقیقە دوای نیوەرۆی رۆژی (٢٥) ی حوزەیران. لە لایەکی دیکەوە ئیتاڵیەکان هێزەکانیان لە ئەلپ لە نزیك سنوری فەرەنسی —ئیتالّی کۆکردەوە بە مەبەستی بەرەو پێشچوون بە ئاراستەی ناوچەی (مۆنت بلانك —مینتۆن ) بەرەو (سافۆی ) و تاوەکو (رون )، بەلاّم ئەم هەوڵە شکستی هێنا بەهۆی ئەوبەرگریەی کەلە بەرزاییەکانی ئەلّپ بۆیان دروست بوو، هەروەها بەهۆی ئەو رووبەڕوو بوونەوە پاڵەوانیەی یەکەکانی ئەلّپی فەرەنسی " فەیلەقی هەلّبژاردە" بەرامبەر ئیتاڵیەکان نواندیان، هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو ئیتاڵیەکان پێشنیازی دابەزاندنی یەکەی کۆماندۆیان کرد لە ئەلّپ بۆ ئاسانکاری کردنی ئەم هێرشە. بەلاّم لە ساڵی ١٩٤٠ دەبووایە جەنگ سیفەتی

سوارەی شەریف لەدەست نەدات، بۆیە ئەم پێشنیارە لەلایەن فەرماندەی گشــتی ئــەڵمانیایی و ئیتاڵیــایی رەتکرایــەوە، بــەبیانووی ئــەوەی جێبەجێکردنی ئەم پێشنیارە ناشەریفانەیەو لەگەڵ جەنگی ئەسپ سواری ناگونجێ،هەرچەندە دواتر ئەم کارە بووە شتێکی ئاسایی لە جەنگدا. لە لایەن خۆیەوە رۆنشتد فەرمانی لە سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا پێگەیشت بەدروستی کردنی چەند یەکەیەکی چیایی لە(رون) بە ئاراستەی شکانی هەیبــەتی ئەوبەرگریــەی فەرەنســییەکان لەئــەلپ، بــەلام پێویســت بــوو لەســەری بەخێراییــەکی زۆر پێشــڕەوی نــەکات. تــا ئــەو ســاتیش لــەوێ بەیەکدادانی بچووك هەر مابوو، بەلام مەغاویرە ئازاکانی ئەلپ وازیان لـەم بەرەیەش هێنا.

کلیســت و چــەند تەشــکیلاتی بــە هێــزی زرێپۆشــی دیکــە لــە پێکهاتــەی سوپای(ب) گواسترانەوە بۆ پێکهاتــەی ســوپای رۆنشــتد کــەپێش کۆتــایی هــاتنی پرۆســەکانی، دووبــارە یەکــە پیــادەو زرێپۆشــەکانی هێنایــە ژێــر ئەســتۆی خــۆی، هــەروەها بارەگــای رۆنشــتد یەکــەم جــار گواســتراوە بــۆ (شالۆن–سیر–مــارن) دواتــریش لــە کۆتــایی هەڵمەتەکــەدا بــۆ (ئۆکســیر). بــەمجۆرە شــەڕ لــە (١٠) ی مــارس دەســتی پێکــرد لــە (٢٥) ی حــوزەیران کۆتایی پێهات، بە شێوەیەك کــە لــەم ماوەیــەدا ســوپای فەڕەنســا بــەرەو توانــەوەو لــە ناوچــوون هــات، چــونکە پلانــی کــۆنی بــەکار دەهێنــا لــە ئامادەباشــی و رێکخســتنەکانی، ســەرباری هــەموو ئەمانــەش رۆنشــتد و هەموو کەرتەکانی سوپاکەی دانیــان بــە ئــازایی رکابــەرە کۆنەکەیانــدا نــا. هــەر لــەو ماوەیــەدا لــە بارەگــای رۆنشــتد لــە (ئۆکســیر) کۆمــەڵێك رووداو روویاندا کە هیواو ئاواتی کۆتایی هاتنی جەنگی لە لایــەن ســەربازەکانەوە زیندوو کردەوە، لەوانە : خۆنیشاندانێکی گەورەی سەربازی لە شــانزلیزیە

له پاریس بەڕێوەدەچوو، لەسەر رۆنشتد پێویست بوو ئەفسەری روکنی بارەگاو چەند کەسێك بنێریّ بۆ ئامادەبوون لەم خۆنیشاندانە سەربازیە، بەهەمان شێوە ژمارەیەك تیمی زرێپۆش لە باشووری فەڕەنسا فەرمانیان پێکرابوو بۆ ئامادەبوون و کۆبوونەوە لەم ئاهەنگەدا، لەم کاتەدا فەرماندەی سوپای ئەڵمانیا لە بەرلین فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی خزمەتی سەربازی ژمارەیەك تیپی پیادەی دا کەلە سەرەتای جەنگەکە دا دروست کرا بوون و ،پاشان ژمارەیەکی زۆر تیپی پیادە و ئالی بانگکرانەوە بۆ ئەڵمانیا. ئەم راستییانەش وادەردەخەن کە (هیتلەر) چارەسەری ئاشتیانەی دەخواست، وشەی نهێنی ( شێری دەریا لەلایەن سوپای ئەڵمانیاوە مانای داگیرکردنی بەریتانیای دەگەیاند. بەڵام چۆن دەکرا لەنێوان ئەو پلانەو ئاواتی ئاشتی گونجان بکرایە؟ ئەوانەی شارەزای هیتلەر بوون و باشیان دەناسی، دەیانزانی کە هیتلەر دەیەویست کاریگەری دەرەکی دروست بکات بۆ ئەم پلانە، چونکە ئەگەر هیتلەر بەڕاستی بیویستایە ئەم پلانە جێبەجیّ بکات، ئەوا پێویست بوو خۆئامادەکردنی پێویستی ئەنجان دابووایە پێش دەستپێکردنی پرۆسەکە لە رۆژئاوا. هیچ شتێك بۆ پراکتیك کردنی ئەم پلانە لەگۆڕیّ دانەبوو، هەروەها هیتلەریش لەمبارەیەوە هیچ شتێکی بۆ رۆنشتد باس نەکردبوو لەکاتی شەڕی فەرەڕەنسا.

ئەگەر (هیتلەر) نیازی هێرشکردنی سەر بەریتانیای هەبوایە ئەوا رێگەی خۆ دزینەوەی سوپای بەریتانی نەدەدا لە (دانکرك ) بۆ دوورگە بەریتانیەکان لە کۆتایی مایس، بۆ ئەوەی دواتر سوپای بەریتانیا بەرگری بکات. ئەوکاتیش چەند هێزێك هەبوون لەتوانایادا بوو بپەڕنەوە ئینگلتەرا لەکۆتایی مانگی مایس، هەروەها لە هەمانکاتیش چەندین تیپی دیکەش

هەبوون کە دەتوانرا بەکاربهێنرێن لە بەشی دووەمی پرۆسەی فەڕەنسا. چونکە ١٠ تاکو ١٢ تیپ لە پێکهاتەی سوپای (أ) بەشداریان لە جەنگ نەکردبوو، بەڵکو وەکو یەدەکێك بوون بۆ هێزەکانی دیکەی پێشەوەی بەرەی شەڕ.

بۆیە رۆنشتد وایدەزانی کە ئەو فرمانە نوێیەی دەرکراوە سەبارەت بە پرۆسەی (شێری دەریا) لە فێڵێکی سیاسی زیاتر هیچی دیکە نەبوو، دواتر دەبینین کە چۆن ئەم کێشەیە گەشە دەکات.

فەرمان ئاراستەی رۆنشتد و دەستەی روکنی پێکهاتەی سوپا(أ) کرا بۆ بیرکردنەوە لە جێبەجێ کردنی پلانی ( شێری دەریا). پاشان دەستەی ئەرکان لە ئۆکسێرەوە گواسترایەوە بۆ (سانت جرمان ) ی نزیك پاریس، هەروەها لە فەرمانی دەستەی ئەرکانی سوپا (براو شتش ) و(هیلدەر ) دا هاتبوو کە: کە سوپا دابەزیتە ئینگلتەرا لە رووبەرێکی فراوان لە نێوان (دۆڤەر) تاوەکو کۆتایی دوورگەی باشووری بەریتانی، لێوارەکانی فەرەنسی —بەلجیکی لە (ئەنتویرب ) بۆ (بریست ) بە چاك زانرا بۆ دانانی وەکو بنکەیەك بۆ پرۆسەی دابەزینەکە (الانزال). فەرمانیش درا بە دروست کردنی پردی گەورە بۆ دەست پێکردنی دابەزاندن لەلێواری بەریتانیای باشوور، هەروەها بەهەمان شێوە پێشڕەوی بکرێت بەرەو پێشەوە بە ئاراستەی باکوور،هەروەها بڕیاریش درا لەندەنی پایتەخت داگیر بکرێت بە چەند هێزێکی لاوەکی و بچوك، بەڵام لەبەرامبەر دا هەڵمەتە سەرەکیەکە بەردەوام بێت بۆ سەر رۆژئاوای بەریتانیا و پایتەختیش فەرامۆش بکرێت.

بەڵام لەڕاستیدا سوپاگەلی ئەڵمانیا لەوە بێهێزتر بوو کە بتوانێت ئەم بارە هەڵبگرێت. هێزە دەریاوانەکانی ئەڵمانی بچووك بوو، بەڵام چوست و چالاك بوون، لەگەڵ ئەمەش لەلایەنی هێزەوە هەرگیز لەتوانایاندا نەبوو شان لەشانی دەریاوانی بەریتانی بدەن.گەر ئەم پلانە جێبەجێ بکرابا ئەو پێویستی دەکرد کەناڵی (دۆڤەر) تاوەکو (کالیە) دابخرایە و، لە رۆژئاواش لە نێوان کۆتایی زەویەکانی دوورگەی بەریتانی لە باشووری رۆژئاوای و لەنێوان (بریست ) دابحەسێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانن تەگەرە بخەنە بەردەم کەشتی گەلی بەریتانیا بۆ پەڕینەوە لەم دوولایە. بۆیە پێویست بوو لەم دوو شوێنە لەدەریادا مین بچێنرێت، بەڵام لەم کاتە ئەو ژمارە زۆرە مینە دەست نەدەکەوت، هەروەها ژمارەیەکیش لەو مینانە بەکەڵکی بەکارهێنان نەمابوو. ئینجا نۆرەی پلانی دووەم بوو، کە خۆی دەبینیەوە لە کورتکردنەوەی هێڵی دابەزینی سوپا لە باکووری هێڵی (دۆڤەر —بۆرت سمۆس) بۆ دابینکردنی پارێزگاری توند بۆ ئەو دوو لاباڵە. لەلایەکی ترەوە هەردوو بەندەری (نۆتردام )و (دۆڤەر) هەڵبژێردران بۆ ئەوەی وەك بنکەیەك وا بن لەکاتی جێبەجێ کردنی ئەم پلانە، هەروەها بەندەرەکانی هۆلەنداو بەلجیکا بە گرنگ دانران بۆ دابەزینی تیمە خێراکانی زرێپۆش، هەروەها لەپێش پەڕینەوە لە (نۆتردام )و(ئەنتویرب ) بۆ (دۆڤەر ) پێویست بوو کەناری بەلجیکی لەلای راستەوە لە باوەش بکرێ، پاشان بەدەوری (دۆڤەر ) خولبکرێتەوە. سەرباری هەموو ئەمانە، هیچ یەکێك لە رۆنشتد و سەرۆك روکنەکەی گرنگیان بەو پرۆسەیە (شێری دەریا) نەدان هەروەها ئەفسەرەکنی دیکەش بەهەمان شێوە. ئەمەش لەوەوە بەدیار دەکەوێت کە رۆنشتد رازی نەبوو ئامادەی ئەو مەشقانە بێت کە هێزەکانی دەریاوانی ئەڵمانیا بە جدیەوە ئەنجامیان دەدا، هەتا

هیتلەریش لە رۆنشتدی نەپرسی لەبارەی ئامادەکارییەکانی بۆ ئەم پلانە، ئەمە لە کاتێکدا هیتلەر هەوڵی دەدا کە لە هەموو شتێك تێبگات.

بەم جۆرە سەرجەم مەشقەکان بە بەشداری ئەفسەرانی هێزە ئاسمانی و دەریاییەکان پلانی (شێری دەریا) بەڕێوە دەچوو، بەلاّم گشتیان باوەڕیان وابوو کەئەم پلانە جێبەجێ ناکرێت، بۆیە هیچ یەکێك لەدەستەی ئەرکانی سوپا هەولّ و کۆششی خۆی بەتەواوی بۆ ئەم پلانە نەخستەگەر. لەلایەکی دیکەوە لە مانگی تەمووز پلەی ژمارەیەك فەرماندە پێشکەوتووەکان بەرزکرایەوە، لەم نێوەندەدا رۆنشتد پلەی بەرزکرایەوە بۆ موشیر (فەریق). لەرۆژی (١٩) ی تەموزی ١٩٤٠ لە وتارێکی دا لە (رایخشتاگ) ژەنەراڵ (ئەدۆلف هیتلەر) دووبارە پێشنیاری ئاشتبوونەوەی کردەوە، هەروەها لە "پاریس" گوێبیستی گفتوگۆی ئاشتبوونەوە بووین لەڕێگەی وڵاتی سوید و دوقی ئەلّپا، بەلاّم هەروەك ئاشکرا بوو ناکۆکیەکی زۆر لەنێوان پیاوانی دەوری هیتلەر هەبوو لەم بارەیەوە، هەرچی هیتلەر بوو نەیدەویست شارەکانی بەریتانیا بۆردومان بکرێت و، بەلّکو بۆردومان کردنی ئامانجە سەربازییە گرنگەکانی وەکو لێوارو بەندەرەکانی (تایمس) بەس بێت. بەلاّم کۆرنك ویستی جەنگێکی ئاسمانی توند بێت بە هەموو مانای وشەوە.

کاتێك فەریق رۆنشتد لەمانگی تەمووز لەبەرلین گەڕایەوە، پێی راگەیاندین: کە هیتلەر لە گفتوگۆیەکی شەخصی پێی گوتووە کە ئەم پلانە (شێری دەریا) جێبەجێ ناکرێت. لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە کە رۆنشتد هەر لەسەرەتاوە خوێندنەوەی بۆ ئەم پلانە راست بوو. ئەنجامی هەموو ئەمانەش ئەوە بوو کە ئەفسەرەکان ئارەزووی کارکردنیان بۆ

جێبەجێ کردنی ئەم پلانە کەم بووبووەوە. لێرەدا دەتوانین ڕووداوەکان بەم شێوەیە وەسف بکەین کەپاشان ڕوویاندا بەم شێوە:

یاری جەنگ " جۆرە مەشقێکە بۆ جێبەجێ کردنی پلانی سەربازی-و" لەسەر نەخشەکان لەمانگی ئاب یاخود لەسەرەتای مانگی ئەیلوول لە (سانت جیرمان) دەستی پێکرد، لەگەڵ ئەوەی هیچ یەکێك باوەڕی نەدەکرد پلانی (شێری دەریا) پەیڕەوبکرێت.

لەڕاستی دا فەرمانەکان بەئاراستەی وازهێنان لەم پلانە خەیاڵیە دەڕۆیشتن، کەشتییەکانیش بەرە ئاراستەی جیاجیا ڕۆیشتەوە، بۆیە کارەکە سەرلەبەری بەتاڵ کرایەوە، لێرەدا پێویستە ئەوە دووپات بکەینەوە کە ڕۆنشتد وەك سەربازێك جێبەجێ کردنی ئەم پلانەی بە کارێکی مستەحیل دەزانی، ئەوانەی لەبارەی توانای هۆیەکانی گواستنەوە شارەزاییان هەبوو، کە بەتەمابوون هێزەکانی ئەڵمانی بگوازنەوە ئینگلتەرا، ئەوە باشیان دەزانی بەشی ئەم ئەرکە ناکات، هەتاوەکو گەر پرۆسەی دابەزاندنیش بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدرایە، ئەوا هێزە شەرکەرەکان و زرێپۆشەکانی ئەڵمانی لە کەناڵەوە لە کیوەر دادەبڕان. ئایا دەشکرا هێزە دەریاوانی و ئاسمانیەکانی بەریتانیا دەستەئەژنۆ دابنیشن؟ لە ڕاستیدا ڕۆنشتد لەسەر ڕاست بوو کاتێك پلانی شێری دەریای بە موجازەفە دادەنا، خودی هیتلەریش بە ڕۆنشتدی ڕاگەیاند بوو کە ئەو لە زەمین هەست بەهێزدەکات و لەدەریاش هەست بەبێ هێزی دەکات.هەروەها گوتی: تەنها پردێکیش لەسەر دەریا نییە. پوختەی قسەی هیتلەر ئەمە بوو: (من لەزەمین پاڵەوانم، بەڵام لەدەریا ترسنۆکم...).

مانگانی دوای ئاگربەستی (٢٥) ی حوزەیران بووە هۆی خاوبوونەوەی هەموو کەرتەکان و دەستەی ئەرکەکان، فەڕەنسا و هیواو ئاواتی ئاشتی ماوەیەکی ئارامی دڵخۆشی بۆ هەمووان دەستەبەر کرد، هەتاکو بۆ بارەگای رۆنشتدیش لە سانت جیرمان. هەروەك پێشتریش باسمان کرد دەستەی ئەرکەکان لە هوتێلی (هێنری چوارەم ) لە سانت جیرمان بوو، کە شوێنەکەیان دەکەوتە کۆتایی رێگای دوورو درێژی بەناوبانگی سانت جیرمان. لەوێوەش شاری پاریس بەجوانی دیار بوو. زۆربەی فەرمانگەکانی دەستەی روکن دەیانڕوانیە سەر رووباری "سین" و شاری "نور". ئەوکات ئێمە هەموومان دڵخۆش بووین بە هودنە و بە بوونمان لە پاریس و هەروەها بە ئاواتی ئەوەبووین کە چاراسەری ئاشتیانە سەربگرێت. بەڵام ئەم بارە وەکو خۆی نەمایەوە لەوکاتەی فەرماندەی گشتی رایگەیاند کەوا شوێنی نیشتەجێبوونمان باش نییەو، پێویستە شوێنی نیشتەجێبوونی دەستەی ئەرکان بگوازرێتەوە بۆ دارستانەکانی نزیك (ئەمیانس) بۆ ئەوەی لەکەنار دەریا نزیك بن. لەسەر رۆنشتد پێویست بوو ئەم فەرمانە لەماوەی (٢٤) کاتژمێر جێبەجێبکات. هەرچۆنێك بوو سەربازگەکە لەسەر شێوەی کوخێك لەدارستانێکی بچووك لە نزیك ئەمیانس دروستکراو، کەرەستەی پێویستی گەیاندنیشی بۆ دابین کرا، بۆ ئەوەی ببێتە بارەگای دەستەی روکن،لەکاتی بەجێهێشتنی پاریس، بەمەش لەوانەبوو لەهەر ستێك بێت بچنە ئەمیانس. لەمانگی تەمووزیش هیچ ئومێێك نەمایەوە بۆ جێبەجێ کردنی پلانی دەریای شێر. بەم شێوەیە بارەگا لە سانت جیرمان مایەوە.

هەر لەوماوەیەدا رۆنشتد بەشێوەیەکی کەم سەردانی پاریسی دەکرد، بەشێوەیەك زۆربەی کاتەکانی لە ڤیلاکەی لەنزیك هۆتێلی (هێنری

چوارەم) بوو، ڕۆژانەش لە سەعات چوارو نیوی ئێوارە بۆ خواردنەوەی چایە لەگەڵ فەرماندەی گشتی و سەرۆکی دەستەی روکنەکەی و سەرۆکی بەشی حەرەکات لە بارەگا دادەنیشت. خاوەنی ڤیلاکە لەوێ نەبوو، بەڵام وەکیلەکەی هەموو پێداویستیە سەرەکیەکانی دابین کردبوو،

لەو ڕۆژە خۆشانەی کە هەموومانی بەیەکەوە کۆکردبۆوە، زۆربەی ئەفسەرە گەنجەکان ئەو فیکرەیەیان پێڕەو دەکرد: دوو نەخشەی فەرەنسا بە دیواری ژووری ئەفسەری ئێشکگرەوە بوو، پێویست بوو هەرکەسێك کە بچووبایە پاریس ئەزموونەکانی لەسەر ئەم نەخشانە دیاری بکات. نەخشەی یەکەم خاڵی شینی لەسەر بوو، هی دووەمیش خاڵی سووری لەسەر بوو، هەروەها لەسەر هەردوو نەخشەش خاڵی بە ژمارە هەبوو، خاڵە شینەکان ئاماژە بوون بە شوێنە بەناوبانگەکانی خواردن، خاڵە سوورەکانیش ئاماژەبوون بە شوێنی رابواردن. ڕۆژێك ڕۆنشتد سەردانی ئەم ژوورە کردو سەیرێکی ئەو دوو نەخشەیەی کرد، لەوکاتەش ئەفسەرەکان لە تەنیشتیەوە وەستابوون. ڕۆنشتد تەنها ئەم قسەیەی کرد: وای نابینن کە نەخشە سوورەکە خەریکە بە تەواوی پڕ ببێتەوە.

ئەو گەنجانە دووربینێکی گەورەی مەدفەعیان لەسەربان دانابوو، کە دەتوانرا بە دووربینەکە تەواوی پاریس بە ١٨ جار بەگەورەکراوی ببینن.وای دەبینم کە گێڕانەوەی ڕووداوێکی بچووك لە کەنیسەی ریمس شتێکی دڵخۆش بێت، دکتۆری مێژوونووس تاکە کوڕی ڕۆنشتد کە جێی داخی هەمووان بوو لەساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کرد، کە زابت سەف بوو لە سوپای ئەڵمانی و زۆر جار لەکاتی هودنەکە سەردانی باوکی دەکرد، بەهۆی ئەوەی زۆر حەزی بە گشت جۆرەکانی هونەر دەکرد، ویستی سەردانی هەردوو کەنیسەی (کارترس و ریمس) بکات، ڕۆنشتدیش بڕوای

وا بوو کە ئۆتۆمبێلە سەربازیەکان تەنها بۆ کاروباری سەربازیە نەك بۆ سەردانی شوێنی هونەری. بەلام دکتۆری فەلسەفەو کوری رۆنشتد دەیزانی چۆن باوکی رازی بکات، بەم شێوەیە رۆژێك لە رۆژان سواری ئۆتۆمبێل بووین و لە سانت جیرمانەوە چووینە ریمس، کاتی گەیشتنمان رۆنشتد ئەوکیسە قومانەی پشکنی کە لە بەردەم دەرگای سەرەکی کەنیسە دانرابوون، چونکە دەسەلاتی ئەلمانیەکان گشت شێوازێکی بەرگری بۆ پاراستنی ئەو توحفە هونەریانە دانا بوو بۆ پاراستنیان لە هێرشی ئاسمانی. دوای ئەوە چووینە ناو کەنیسە کە پەیکەرێکی جان دارکی بەناوبانگی لێبوو، کوری رۆنشتد بە دەنگێکی کزەوە وەسفی جوانی ئەو پەیکەرەی کرد، هەروەها لەدەرەوەی کەنیسەش پەیکەرێك هەبوو کە ئافرەتێك بوو بەسەر پشتی ئەسپێکەوە، رۆنشتدی باوك پێش ئەوەی هیچ کەسێك ورتەی لە دەمەوە بێت، سەبارەت بە پەیکەرەکەی دەرەوەی کەنیسە گوتی: " تاکە پەیکەری بەنرخ ئەوەیە کە لە ژووری کەنیسەیە" ئەمەش ئەوە دەردەخات کە رۆنشتد بە تیلە چاوێك توانی جیاوازیە زۆرەکانی ئەم دوو پەیکەرە بزانێت.

لەنێوان (٢٥) ی حوزەیران تا مانگی ئاب ئاواتی هەموان بەئاراستەی ئاشتی بوو، بەلام زۆربەی شتەکان نادیار بوو لەلای سەربازەکان، بەلام ئەمانیش هیوایان بەئاشتی هەبوو، هەروەها زۆربەی تەدابیرە توندەکان کە سەرەتا لە پاریس جێبەجێ دەکران خاوبوونەوە، شتێکی روونیش بوو کە سەربازەکان بە پەرۆش بوون بۆ بینینی پاریس لەدوای راگەیاندنی هودنەو ئاگربەست. بۆیە دلەراوکێ بالی بەسەر سەرکردایەتی کێشابوو سەبارەت بە هەلسوکەوتی توند لە پاریس، بۆیە فەرماندرا (بریسن) ی بەناوبانگ بە توندوتیژی و رەقی، بکرێتە فەرماندەی سەربازی لەپاریس،

پێشتر ئەو لیوایە لەشەڕی پۆڵەندا برینداریش بوو بـوو، دوای ئەمـە زیـاتر بەوە بەناوبانگ بوو کە فەرماندەیەکی تیپی زۆر تونوتیژو ڕەقە. هەروەها تەدابیری زۆر توندیشی خستە سەر دەستەی ڕوکـن و هێزەکـانی دیکـەش بەمەبەسـتی گێڕانـەوەی یاسـاو ڕێکخسـتن، بـەجۆرێك هـیچ ئەفسـەرێك نەیدەتوانی بەبێ پرس و ڕێگەپێدانی ئـەو بچینە پـاریس، ئەگـەر یـەکێك بیویستایە بۆ کارێك بچێتە پـاریس تـەنها دەبـوو پێشـتر بـە تایبـەت ڕێـی پێبدرابووایـە، ئینجـا دەیتـوانی بچـێتە پـاریس ، هـەروەها دەبووایـە بـۆ ماوەیەکی کەمیش بێت و پێش تاریك داهاتن بگەڕێتەوە سەربازگە. بەڵام ئەم ئیجرائاتانـە بەرەوخاوبوونـەوە دەڕۆیشـت، دوای مـانگی تـەمووزیش زۆربـەی ئـەو تـەدابیر و فەرمانانـە گۆڕانکاریـان تیـادا کـرا، پاشـانیش بەخێراییەکی زۆرەوە پەیوەندیەکی توندوتۆل لەنێوان دانیشتوانی پاریس و سـەربازە ئەڵمانیـەکان دروسـت بووبـوو، ئەمـەش بـەبیری کـەس دا نـەدەهات کـە بـەم مـاوە کورتـە ئەوپەیوەندیـە بـە تینـە لـە نێـوان دانیشتووانی فەڕەنسـاو هێزەکـانی ئـەڵمانی دروسـت ببێـت، بـەخێراییش عاشـقانی وەرزش هـاوڕێی فەڕەنسـیان دۆزیـەوەو، داوەتکردنـی یـەکتر دەستی پێکرد، هونەردۆستانیش لەگەڵ ڕۆشنبیرانی فەڕەنسی لە لۆڤەر و سیڤرس یەکتریان ناسی. هەروەها ئەفسەرو سـەربازانیش دۆسـتی کچیـان پەیدا کرد. چەند هەفتەیەکیش دوای ئاگربەست سەردانی کردنی باخچەی ئـاژەڵان دەسـتی پێکـرد لـە فینسـنس،کە تـازە ( هـاکن بـێگ) دروسـتی کردبوو، ناوی بەڕێوەبەری ئەم باخچەیە لە یادەوەریەکان ون بووە، بەڵام ئەفسـەرێکی مەدفـەعی لـە بارەگـای ڕۆنشـتد پەیوەندیـەکی پتـەوی بـە خێزانی هاکن بێگ هەبوو، هەر لەگەڵ گەیشتنی ئـەو ئەفسـەرە بـۆ سـانت جیرمـان دانوسـتانێکی زۆری لەگـەڵ بەڕێوەبـەرە فەرەنسـیەکە کـرد

دەربارەی گۆڕینـەوەی دوو جـۆری دەگمـەنی کەرکـەدەن، ڕۆنشـتد بـەم مامەڵەیە زۆر دڵخۆش بوو. هەروەها لـەنێوان ئەنـدامانی دەسـتەی روکـنی ڕۆنشتد بە ئەفسەر و زابت سەف و سـەربازەوە گونجـانێکی بـاش هـەبوو، ئەمگونجانـەش بەڵگەیـە لەسـەر تگەیشـتنی قـووڵی ڕۆنشـتد لـە بـاری دەروونی مرۆڤ. مانگ دوای مانگ هەستکردن زیاتر دەبوو کە ئاشتی دوای ڕۆژگـارێکی زۆر دەگاتـە جـێ. هـەروەها لـەمانگی ئابـەوە، گەنگەشـە بڵاوکرایەوە کە ئاماژەیان دەکرد بەناوبژیوانی سوید و ئیسپانیا بـۆ دابـین کردنـی ئاشـتی، لەهـەمانکاتیش شـەڕی ئاسمـانی لـەدژی ئامانجـە سەربازیەکانی بەریتانیا لەبرەودابوو، هەروەها زیانی ئەڵمانیاش لە لایەنی فڕۆکەوە لە زیـادی دابـوو. ئـەو فڕۆکەوانانـەی لـە جەنگـەوە دەگەڕانـەوە ئاماژەیان بە بەرگرییەکی بەهێزی دژەفڕۆکەکانی سوپای بەریتانی دەکرد و ،بەهەمان شـێوە تەقـەی بـەرگری ئاسمـانی بـەریتانیا ڕۆژ بـەڕۆژ زیـاتر دەبوو، هـەروەها ئاماژەیـان بەشـەڕێکی تونـدی ئاسمـانی دەکـرد لەگـەڵ فڕۆکەکانی دوژمن. بەڵام ئەو پلانەی کـە هیتلـەر ئامـادەی کـرد بـوو هـیچ یـەکێك لەڕۆنشـتد و دەسـتەی ئەرکـەکانی سـوپاش پێیـان نـەدەزانی، هەروەها وا بڵاوکرایەوە کە قسـە گۆڕینەوەیـەکی تونـد لـەنێوان هیتلـەر و کۆرنك دەربارەی شێوازی شەڕی ئاسمانی دروست بوو، کۆرنك دەیەویست بۆردومانی شارەکانی بەریتانی بکرێت، چونکە بەریتانیا پێشتر شارەکانی ئەڵمانی بۆردومان کردبوو بەڵام هیتلەر ئەمەی نەدەویست، ئەمەش مانای وایـە نیـازی هاوکـاری ئینگلتـەرا تـا ئـەو کاتـە لـە مێشـکی هیتلـەر دەخولایەوە. تا ئەوکاتیش هیچ ڕێوشوێنێك نەگیرابووەبـەر بـۆ پاراسـتنی (سـانت جیرمـان) لەهێرشـی ئاسمـانی، بۆیـە ڕۆنشـتد مکـوڕ بـوو لەسـەر جێهێشتنی ڤیلاکـە، ئـەوە بـوو دوو ژووری پاشـکۆی لـە ئوتێلەکـە دابـین

کرد، بەشێوەیەك دەیتوانی لە شوێنە نوێیەکەیەوە بەپێیان لەدارستانی سانت جیرمان بە تەنهاو بەبێ پاسەوان بسورێتەوە. بەڵام کاریگەری ئیستیتلاعی دوژمن مانگ دوای مانگ زیاتر دەبوو، فرۆکەوانەکانی بەریتانی بە بەردەوامی چاودێری سانت جیرمانیان دەکرد، بۆیە دەستەی روکنی رۆنشتد بیری لەدابینکردنی پاراستنی زیاتر دەکردەوە، بە کردەنیش رێوشوێنی پاراستن لە باخچەی تەنیشت ئوتێر وەرگیراو، رەبیەی قوولّ لەنزیك بەرزاییەك لێدران، رێوشوێنی رۆنشتد بۆ پاراستنی خۆی زۆر ئاسایی بوو، هەروەها لە کاتی لێدانی سافیرەی ئاگادارکردنەوە ئارەزووی چوونەناو ژێرزەمینی نەدەکرد، ئەگەر بەریتانیەکان ئارەزوویان بکردایە ئەوکات دەیانتوانی بارەگاکە بەتەواوی وێران بکەن. هەرچۆنێك بێت دواجار سوودی ئەم رێوشوێنانە بەدیار کەوت، کاتێك فرۆکە بەریتانیەکان بەتوندی ئوتێلی (هێنری چوارەم ) یان بۆردومان کرد، بەشێوەیەك کە کەم بینایە بۆ نیشتەجێبوون مابووەوە، بەڵام بەخت و رێکەوت بوونە هۆی مانەوەی دەستەی روکن، چونکە لەگەڵ ئەم بۆردومانە وێرانکەرە تەنها زیانێکی کەم هەبوو. رۆنشتد لەوکاتەدا پاسەوانێکی کەمی هەبوو دژی دژی ئاژاوەو هەڵمەتی زەمینی، هەروەها دەستەی روکنیش دابەش نەکرابوون و لەیەکتری جودا نەکرابوونەوە. لە بارەگاش هیچ کۆسپ یان تێلدڕ نەبوو، تاوەکولە دوو سەبازی بەتەمەن زیاتر لە بارەگا نەبوون کەتەنها شەوان بەدەوریە دەسورانەوە.

لەم کاتەدا ئەڵمانی و فەرەنسییەکان بە ئاشتی دەژیان، هەروەك پێشتر باسکرا پەیوندیەکی توندو تۆڵیان لەنێوان هەبوو، بەجۆرێك هەر فەرەنسییەك لەهەر کاتێك نیازی بوایە دەیتوانی سەردانی ئوتێلی (هێنری چوارەم ) بکات کەدەستەی ئەرکانی سوپای ئەڵمانی لێبوو، هیچ شتێك

گۆڕانی بەسەردا نەهات لەنێوان سالآنی (١٩٤٢-١٩٤٤)، لەگەڵ بوونی ترس و دڵەڕاوکێی زیاتر لەولآت بە شێوەیەکی تەدریجی بەهۆی گۆڕانی هەڵوێست. کەبووە هۆی مەترسی سەبارەت بە ئەڵمانەکان، هەرچەند وەرزی هاوین لەکۆتاییەکەی نزیك دەبووەوە، رۆنشتد یش زیاتر بڕوای بەوە دەکرد کەوا هیتلەر ناتوانێت ئاشتی دەستەبەر بکات. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە سوپای ئەڵمانی لەرۆژئاوا هەڵوێستی سیاسی لا دیار نەبوو، هەتاکو ئاگاداری پێشهاتە سەربازییەکانیش نەبوو لە رۆژهەلآت.

پێشتر وازمان هێنابوو لەقسەکردن دەربارەی پۆڵەندا، پاش کۆتایی هاتنی شەڕ لە پۆڵەندا لە کۆتایی تشرینی دووەمی سالّی ١٩٣٩. دوای ئەوە کەس نەیدەزانی شێوەی پەیوەندیەکانی رووسیاو ئەڵمانیا لە دوای دابەشکردنی پۆڵەندا لەنێوان هەردوولادا چۆنە. ئەزموونیشەڕی دووەمی پۆڵەندا فێری کردین کە مامەڵەکردن لەگەڵ رووسیا زەحمەتە، چونکە لەسەر کێشەو گرفتی لاوەکی وهیچ و پووچ جیاوازی و بەیەکدادان دروست دەبوو، وەك بوونی خالّێکی سەربازی لەسەر زێی بێگ یاخود بەکارهێنانی پردێك لەسەر زێی ئەسان نزیك بریز نیسل. کەسێك لەرۆژئاوا نازانێت چی روویداوە لەسەر سنووری رۆژهەلآت لە تشرینی دووەمی ١٩٣٩ تاکو هاوینی سالّی ١٩٤٠ ؟.

لە بەهاری سالّی ١٩٤٠ ، هەروەها لەسەرەتای شەڕی بروسك ئاسا لەنەرویج لە ٩ی نیسان و، پێش ئەومێژووەش، رۆنشتد تێبینی دوو تیپی چیایی نەمساوی (٢ و ٣) ی دەکرد لەناوچەکەی خۆی، بەلآم نەیدەزانی بۆچی و بۆ کوێ دەچن! !نە دەستەی روکن و نە هێزەکانیش نەیاندەزانی کە هێزەکانی هاوپەیمانان لەدوای داگیرکردنی نەرویج یەکسەر بۆ یارمەتی فنلەندا بەڕێ کەوتبوون کە رووسیا بۆ جاری دووەم لەگەڵی

گەیشتبووە رێککەوتنێك لە رۆژی ٢ی مارتی ١٩٤٠ تەنها لە رۆژنامەکان و کەنکەشەکان نەبێت. چەندین جار هێزەکانی ئەڵمانی لەگەڵ هێزەکانی بەریتانی لەنەرویج توشی پێکدادان بووبوون، وەك ئەوەی لە (ئەندالسنس) و (هارستان) روویدا، بەڵام هەروەکو پێشتر فەرماندە سەربازیەکان زانیاریەکی ئەوتۆیان لەم بارەیەوە لەلانەبوو، زانیاریەکانیشیان تەنها بەقەد زانیاری جەنگی نێوان رووسیا و فنلەندا دەبوو،ئەو جەنگەی کە سەربازە ئەڵمانیەکان سۆ زیان بەلای فنلەندیەکانداکەوت.

ئەو بارودۆخە شازەی کە بەکورتی باسمان کرد، لە وڵاتانی دیموکراتی کەسێك بڕوا ناکا کە چۆن لەوڵاتانی دیکتاتۆری گەورەترین سەرکردەش ئاگاداری هەڵوێستە سیاسیەکان نییەو لێی بێبەش کراوە. نەبوونی زانیاری تەنانەت فەرماندەی گشتی و سەرۆك ئەرکانی سوپاشی گرتبووەوە، کەوای لێکردبوون چەندین پێشنیاری ستراتیژی بدەن، بەڵام زۆربەی پێشنیارەکانیان لەلایەن هیتلەرەوە رەتدەکرانەوە. چونکە ئەوان لەوەهم دەژیان و نیازە سیاسیەکان لایان نامۆ بوو کەهێڵەکانی ستراتیژی تا رادەیەکی زۆر پشتی پێ دەبەستێ. باسی مەسەلەی رووسیا لە مانگەکانی هاوینی ساڵی ١٩٤٠ نەدەکرا مەگەر بەدەگمەن نەبێ، بەهەمان شێوەش هەڵوێستی رۆژهەڵاتیشمان نەدەزانی، بۆیە هەر بۆ خۆمان وامان دانابوو کەوا هەموو شتەکان بەگوێرەی سیستەم و رێککەوتننامە مۆرکراوەکان دەڕوات، هەر بۆیەش لەم کاتەدا لەناو دەستەی ئەرکان و هێزەکانی دیکە کەسێك پێشبینی جەنگی لەگەڵ رووسیادا نەدەکرد.

ئەو جەنگەی کە ڕەنگە هەر لەزووەوە هیتلەر سور بووبێ لەسەر ئەنجامدانی، یاخود لەوانەیە (ئەدۆلف هیتلەر) نیەتی ویستی خۆی لەم

بارەیەوە بەسەرۆك ئەركانی سوپاو دەستەی ئەركانی تایبەت بەخۆی راگەیاند بێ، بەڵام رۆنشتد هیچی لەمبارەیەوە نەدركاند. لەگەڵ هەموو ئەمانەش وا بەدیار دەكەوت كە شتێك هەیە سەبارەت بە شەڕ دژی رووسیا بەتایبەتیش لای ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی و دەریاوانی. هەروەها روونیش بووەوە كە (كۆرنك) فەرماندەی گشتی هێزی ئاسمانی لەهەموو فەرماندەكانی سوپا زیاتر پەیوەندی پتەوی بە هیتلەرەوە هەبووە. ئەمەش وای كرد هەر ئەفسەرێك لەهێزی ئاسمانی یان دەریایی دەیتوانی لەمانگی ئاب و ئەیلوولی ساڵی (١٩٤٠) ی ئاماژە بەو پێشهاتانەبدات كەلە (١٩٤١) لە رۆژهەڵات روودەدات.

بارەگای سوپای چواری فۆن (كلوكا) لەرۆژئاوا گواستراوە بۆ رۆژهەڵات و، پاشان بۆ (وارشۆ ) بەجۆرێك فۆن (كلوكا) پێش رۆیشتنی سەردانی پێكهاتەی سوپای (أ) ی كرد لە (سانت جیرمان) و لەگەڵ سەرۆك ئەركانی سوپا ماوەیەكی زۆر گفتوگۆی كرد، ئەمەش دەریدەخست كە شتێك روودەدات لە رۆژهەڵات.

لەم رۆژانەدا ژمارەیەك راپۆرت لە رۆژنامەكان بڵاوكرانەوە، كە ئاماژەیان بە گۆڕانی ئاراستەی روسیا دەدا دژی ئەڵمانیەكان و ، گرفتەكان زیاد دەكەن و، هەنگاو بە هەنگاویش ژمارەی هێزەكانیان لە رۆژهەڵاتی هێڵی دابەشبوونی پۆڵەندا زیاددەكەن. بەهەمان شێوەش ئاماژەیان بە تێكچوونی پەیوەندی لەنێوان روسیا بەریتانیا دەدا، بەهۆی مەسەلەی فنلەندا، هەندی كەسیش پێشبینی هەڵگیرسانی جەنگیان لەنێوان رووسیا و بەریتانیا دەكرد، لەلایەكی دیكەشەوە جگە لە ئەفسەرانی بارەگای تایبەتی هیتلەر هەموو فەرماندە سەربازییەكان لە شك و گومان دەژیان دەربارەی ئەم پێشهاتانە، هەتا رۆنشتد هیچ شتێكی گرنگی لەم باریەوە

نەدەزانی چونکە ئەو تەها سەربازێك بوو و، رووداوە سیاسیەکان کاری ئەونەبوون. هەروەها رۆنشتد هیچ پەیوەندیەکی تەلەفۆنی بە هیتلەرەوە نەدەکرد، وەك هەر یەکە لە (رۆمل ) و( کلوکا) و ژمارەیەك فەرماندەی سەربازی کەپەیوەندی تەلەفۆنیان لەگەڵ هیتلەر دەکرد و تیایدا زیاتر گفتوگۆی تایبەتیان لەگەڵ هیتلەر دەکرد، هەر بۆیە هیچ جار هیتلەر لەتەلەفۆن داوای رۆنشتدی نەدەکرد، بێگومان گفتوگۆی شەخصی لەنێوانیان هەبوو، بەلاّم ئەم جۆرە گفتوگۆیانەش تەنها ئەوکاتانە بوو کە هیتلەر دەیویست. بەلاّم لە هیچ بارودۆخێکدا رۆنشتد پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ هیتلەر نەبەستی، تەنها پەیوەندیشیان لەرێگای هەریەکە لە (کایتل) و (جودل) ەوە هەبوو.

## بەشی حەوتەم

### شەڕ لە رووسیا

هەروەکو پێشتر باسمانکرد سەرکردەی پێکهاتەکانی سوپاو سەرکردەکانی سوپا بە هیچ جۆرێك زانیاری روون و ئاشکرایان دەربارەی ئەرکەکانی داهاتوویان لە بەرەی رۆژهەلات لە هیتلەر وەرنەگرتبوو، ئەم بێدەنگیەش رێبازی بنەڕەتی هەموو دیکاتۆرێکە، بەلام هەروەکو زانراوە پیاوانی سیاسی و دەولەت لەولاتانی دیمۆکراتیدا هەموو زانیاریەکانیان دەربارەی پلانەکانیان ناگەیەنن بە سەرکردە سەربازیەکان، تەنها لە قۆناغی کۆتاییدا نە بێت. هەتا لەو کاتیشدا مەبەستە شاراوەکانیان دەرنەدەبڕی. یان بە شێوازێکی تر سەربازەکان وەکو ئامێرێك وابوون بە دەستی سیاسیەکان، چونکە هەر ئەوان لایان وایە سەرکردایەتی دەکەن و زالْ دەبن، نەك سەرکردە ژێرەکانی سوپا کە خۆیان بە سەربازێکی کەمتەرخەم دەزانن بەرامبەر ئەرکەکانیان لە رووی سەربازییەوە، چونکە لە ولاتی دیمۆکراتیدا سەرۆکی وەزیران و پەرلەمان زۆرتر زانیاری پێشکەش بە سوپا دەکات و، وەك ئەو دۆخە نییە کە لە ولاتی دیکتاتۆریدا هەیە، چونکە بیرو بۆچوونەکانی سەربازی تایبەتمەندیەکی خۆی هەیە، ئەگەر پێشوو بیرو بۆچوونەکانیان بە وردی سەیر بکرێت، لەبەر ئەوە پەیوەندی نێوان سەرکردە سیاسیەکان و سەرکردە سەربازیەکان لە ولاتی دیمۆکراتیدا بە هێزترە. بەم جۆرە ژیان لە ژێر سەرکردایەتی هیتلەر بە تەواوی جیاواز بوو وەك ئەوەی لە ولاتی دیمۆکراتدا هەیە. لە سالّی ١٩٤٠ راپۆرتەکان زیاتر بوون کە ئاماژەیان بە شەڕێکی بە کۆمەلْ دەکرد لە دژی رووسیا، هەروەکو ئاماژەم بۆ کرد لە

پێشەکی ئەو فەرمانانەی کە لەدەستەی ئەرکانی بارەگای سوپا دەرچوو، ئامادەییەکە بەرگری کردنە لە دژی رووسیا ، بەهۆی ئەگەری هەستانی رووسەکان بە هێرشێك بۆ سەر ئەڵمانەکان.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٠ چەند تیپێکی دیکە بۆ رۆژهەڵات گواسترایەوە بە تایبەتی بۆ برووسیای رۆژهەڵات و پۆڵەندا و کەرتەکانی بوزنان.

ئەم یەکانە بە هیچ شێوەیەك ئەوەندە رێکوپێك نەبوون کە بۆ هێرشکردن بەکاربهێنرێت، هەروەها بە ماوەیەکی دوور لە ناوچە فراوانەکانی پشتەوە بڵاو کرابوونەوەو خەریکی مەشق و ڕاهێنان بوون، لەوێدا مۆڵەتی سەربازی ئاسایی بوو چونکە دۆخەکەی خزمەتکردنی نیمچە ئاشتی بوو، لەوپەڕی بەرەی شەڕەوە لەسەر هێڵی دابەشبوونی رووسیا- ئەڵمانیا سێ یان چوار تیپ هەبوون جگە لە تیپێکی سوارەی یەکەم کە لە نێوان کەرەبات و بەلتیقدا هەبوو.

ئەم بەرەیە بە سەرکردایەتی فۆن کلوکا بوو کە بارەگای سوپای چوارەم لە وارشۆ بوو. زستانی ١٩٤٠-١٩٤١ هێمنیەکی تەواو باڵی بە سەر سنووردا داکێشابوو تا سەرەتای شەڕی لە ٢٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ خایاندو هێشتا رووسیا هاوڕێیەکی ئەڵمانیا بوو، شەمەندەفەرەکان بە شێوەیەکی ئاسایی کەلوپەلەکانیان هەڵگرتبوو بە رێکوپێکی بە وێستگەکانی سەر سنوودا تێدەپەڕین هیچ ئاستەنگێك نەهاتە بەردەم فەرمانبەرەکانی هێڵی ئاسنی تەنیا چەند ئاسەنگێکی کەم نەبێت شەمەندەفەری نێودەوڵەتی بە بەردەوامی لە بەرلینەوە بۆ مۆسکۆ لە هاتووچۆدا بوو و بە هیچ شێوەیەك نەوەستا تا چوار کاتژمێر بەر لە دەسپێکردنی جووڵانەوەی دوژمنکاری. لە مانگی کانوونی دووەمی

ساڵی١٩٤١ چەند تیپێکی تر لە ڕۆژئاواوە هات، بەڵام بە ماوەیەکی دوور لە پشتەوە ئۆقرەیان گرت و وەك بەرگریکەر لەم شوێنەدا مانەوە، هیچ سەرکردەیەکی باڵا لەم شوێنەدا نەبوو جگە لە بارەگای چواری فۆن کاوکا دوای ئەویش بە پێی فەرمانێك کە بە دەست ڕۆنشتد گەیشت بۆ ڕۆیشتنی بۆ برسلاو لە سیلزیا دەستەیەکی بچووکی تایبەتی لە ئەرکانی خۆی لەگەڵ خۆ برد، ئەم ڕۆیشتنەش بە پێی فەرمانێکی نهێنی هیتلەر بوو.

ساڵی ١٩٤١ هەواڵەکان بڵاوبوونەوە گوایە ڕووسیەکان دەتوانن بە هێرش هەڵستن نەك هەر بۆ سەر ئەڵمانیا بەڵکو بۆ سەر هەموو ئەوروپا بەتەواوی ... هەروەکو هیتلەر ئاماژەی بە ڕووسیا و چاکسازی چەند ژمارەیەك تیپی گەورەی ڕووسیا کرد هەروەك ئاماژەی بەشەڕی فنلەندا کردو بەڵگەی هێنایەوە گوایە ئەو ئامادە باشیە گەورەیان نییە مەگەر هەڵستانی هێرشێك نەبێت لە دژی ئەڵمانیا، هیتلەر لە مێشکی خۆیدا گەڕایەوە بۆ پلانێکی لینین و ڕایگەیاند کە ئامانجی بیری شوعیەت سەرەوژێر بوونی جیهانە، ئەم ئامانجەی نایەتەدی مەگەر بەهێز نەبێت، بۆ ئەم مەبەستە بەشێوەیەکی شێتانە هەستا بەپێکهێنانی سوپای سوور، هیتلەر گوتی: ئەو ناتوانێ زۆر چاوەڕوان بکات نەوەك ڕووسیەکان لێکۆڵینەوەکانی تەواوبن بۆیە ئاماژەی بە مەترسیەکی گەورە کرد لە ڕۆژهەڵات و دژی ئاسایشی ئەڵمانیاو ئەوروپا، هەروەها ساڵی ١٩٤١ پێشنیاری هێرشی ڕووسیای کرد لە بەهاردا، سوپای چوارەم هەندێك زانیاری نهێنی لە ئەفسەرێکی پێشووی لیتوانی لە کفنو بە دەست گەیشت کە گوایە ڕووسیەکان هەڵدەسن بە ئەنجامدانی ڕاهێنانێك بەمەبەستی داگیرکردنی برووسیای ڕۆژهەڵات لە دوو لاوە، لەگەڵ ئەوەشدا

له چێشتخانەی ئەفسەرەکانی رووسیا بە شێوەیەکی ئاشکرا باسی شەڕ لە نێوان ئەفسەرەکان لە دژی ئەڵمانیا دەکرا، رووسیەکان بە ئاشکرا لە دژی ئەڵمانیا سەبرو ئارامیان هەبوو هەروەکو لە فیلمەکانیاندا دیارە، هەروەها ئەم ئارامیەش لە راپۆرتەکانی ئەڵمانیا باسی لێوەکراوەو سەرچاوەکانیش ئەم شتە دەسەلمێنێ، هەروەها نەخشەی هەڵوێستەکانی سەربازی ئاماژە بە زانیاریەکانی هاتوو دەکەن، کە رووسیا مانگ لە دوای مانگ ژمارەی یەکەکانی خۆی لە گالیسیا زیاد دەکات

هەر لە یەکەم جارەوە رۆنشتد دژی شەڕکردن بوو لەگەڵ رووسیا، هەر چەند زانیاریشی دەربارەی رۆژهەلات بە تایبەتی ولاتی رووسیا وەرگرتبوو. بەلام بەسووکی تەماشای ئەو زانیاریانەی کرد وەك: سروشتی ولات، سەربازی رووسی، کێشەی ئاوهەوا، دووری بێ کۆتایی خراپی رێگا، لەبەر ئەوە هیتلەر پرسیاری کرد ئەگەر بێت و هێرش بکاتە سەر رووسیا دەبێت ژیر و جەربەز بێت؟.

بۆیە براوشتشی سەرکردەی گشتی و هیتلەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا دوو دلی و بێزاری خۆیان لەم کارەی روتشد دەربڕی کە ئەنجامیدا، هیتلەر بە هیچ شێوەیەك لە بەرەی رۆژهەلات بەشداری شەڕی یەکەمی جیهانی نەکردبوو، رۆنشتد لەو باوەڕەدابووو ئەگەر رووسیەکان مەبەستیانبووایە رووبەڕووی ئەڵمانیا ببنەوە، ئەم کارەیان ئەو کاتە جێبەجێ دەکرد کاتێك سوپای ئەڵمانیا بە گشتی لە دژی رۆژئاوا شەڕی دەکرد. لەبەر ئەوە رۆنشتد لەو باوەڕەدا بوو بۆ زامن کردن و سەلامەتی ئەڵمانیا باشتروایە هێزەکانی سنوور بەهێز بکرێت و بوار بدرێت بە رووسیەکان ئەگەر ویستیان هێرش بکەن..

چونکە زۆربەی ئەفسەرەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانی شارەزای رابردووی رووسیا بوون، بۆیان دەرکەتبوو هێزی سەرکەش و ئامادەباشییان بۆ قوربانیدان هەیە، هەروەها دەیانزانی ئەم ولاتە دەتوانێ بە ملیۆنان سەرباز ئامادە بکات، هەروەها لە سالی ١٩١٤-١٩١٨ ئاگادارکرانەوە لە سنوورە بەرفراوانەکەی ماوە بێ پێوانەکەی و سروشتە دژوارەکەی و خاکە لیماویەکەی و رێگا لیتەییەکەی و داستانە چرو زۆنگاوەکانی. راستە یەك سەربازی ئەلمانی لە شەڕی جیهانی یەکەم بەرامبەر ٥ تا ١٠ سەربازی رووسیا بوو لەگەڵ ئەوەش سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو، سەرباری مەترسیە گەورەکانی ئەلمانیەکان رووبەڕوویان دەبۆوە کە زۆر چاك دەیانزانی کەوا پلەی سەرکەوتن هێشتان بە تەواوی نەکەوتۆتە ژێر دەسەلاتی رۆژئاواییەکان، دوایش ئەم پرسیارە زۆر گرنگە: ئایا سوپای رووسی ئێستا چاکترە یان لە سالی ١٩١٤-١٩١٨ لەو کاتەی کە لەژێر دەستی قەیسەریدا بوو؟

ئاشکراشە کە رژێمی ئێستای مۆسکۆی سیاسی زۆر توندو چەسپاوە بووە، چونکە شتێکی ئاشکرابوو کە سوپای رووسیای نوێ بە تازەترین چەك و تفاقی شەڕ پڕ چەك کراوە نەوەك لەسەردەمی قەیسەری. راپۆرتی پاشکۆ سەربازیەکانی ئەلمانی لە مۆسکۆ سالانێکی زۆر بوو دەیانزانی کەوا رووس لایەنێکی گەورە و گرنگە، بەلام هیتلەر لەبەر سستی خۆی زۆر گرنگی بەم راپۆرتە نەدەدا شیاوی باسکردن بێت، بەلکو هەر باوەڕیان پێ نەبوو، هەروەکو ناپلیۆن لە رووسیا گەیشتبوو، بۆیە وێکچوونەوەکی زۆر و دیار هەبوو لە نێوان ناپلیۆنی یەکەم و هیتلەر کە هەردووکیان لە نێوان ململانێی هێرشکردندا بوون، هیتلەر لە هێرشی بەریتانی ترسا کە لە یۆنانەوە بە ئاراستەی باکوور و بەرەو دانوب

بکرێت، هەروەکو هاوپەیمانەکان لە ساڵی ١٩١٨ لە بەلقان ئەنجامیاندا، چونکە پێشڕەوی ئەو جۆرە هێرشە لە کۆتاییدا دەبێتە چاوڵێ سوورکردنەوە لە بەرەی رۆژهەڵاتی ئەڵمانی لە باشوور، لەبەر ئەوە نیازی داگیرکردنی بەلقان و هەموو یۆنانی هەبوو بۆ دامرکاندنەوەی مەبەستی بەریتانیەکان،بۆ ئەم مەبەستەش مارشاڵ کلیستی نارد بۆ ئەوێ، هەر لەو کاتیشدا زۆر لە یۆگسلافیەکانیش ئاڵای یاخیبوونیان لە دژی هێزەکانی ئەم تەوەرە لە کۆتایی مارتی ساڵی ١٩٤١ بەرزکردەوە، ئەم یاخیبوونەش بۆ هیتلەر کاریکی لە ناکاو بوو، ئەمەش چەند کورتە شەڕێکی خێرایی بە دوا داهات لە بەلقان بە سەرکردایەتی لیست و فۆن کلیست، لەم شەڕەشدا تیپی زرێپۆش سەرباری لەشکری پیادە و پێکهاتە چیاییەکان بەشداریان کرد، بەمەش شەر پاش چەند هەفتەیەك بە سەرکەوتن کۆتایی هات. ئەو یەکە ئەڵمانیانە و پێکهاتەی فۆن کلیستی زرێپۆش کە هەمووی تەرخانکرا بوو بۆ شەڕ لە رووسیا، بۆیە بە شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپاوە گوێزارانەوە بۆ باکوور لە دوای سنووری رووسیا، ئەم گوێزرانەوەش پێویستی بە کاتێکی زۆر هەبوو ئەمەش زەرووره‌تێکی گرنگ بوو سەرباری هەڵسان بە بشکنین و چارەسەری زرێپۆشەکان لە کارگەکان و چاکردنەوەیان بۆ ئەوەی دووبارە بخرێنەوە خزمەت،

هیتلەر لە ناوەندی مایسی ساڵی ١٩٤١ بڕیاریدا شەڕ لە دژی رووسیا بکات، لە دواییدا ئەم کاتە مانگێکی تەواو دواخراو شەڕی بەلقانیش هۆیەکی سەرەکی نەبوو بۆ ئەم دواخستنە، بەڵکو هۆیەکەی لەلای هیتلەر ئەو کودەتایە بوو کەوا لە بلگراد دژی حکوومەت روویدا، چونکە هاتووچۆی لەگەڵ رۆمانیای هاوپەیمان کەوا لە یوغسلافیاوە رەت دەبوو

هاتووچـۆی زینـدووبوون بـۆ دابینکـردن و تێپەڕینـەکانی ئـەڵمانیا و بنکـەکانی تـر بـۆ باشـووری بـەرەی ڕۆژهـەڵات. هـەر چۆنی بـوو لـەوێ هۆکارێك هەبوو کە کاریگەریەکەی کەمتر نەبوو کە باسمانکرد کە ئـەویش باری راپی کەش و هەوای ساڵی ١٩٤١ بوو. ئەو هۆکارەش وایکرد شـەڕی رووسیا دوابخرێت.

هەروەك شتێکی ئاشکرایە جوولـەی سـەربازی گـەورەو خێـرا بەربەسـتی زۆری رووبەڕوو دەبۆوە لە رۆژهەڵاتی هێڵی سان- بك تـا کۆتـایی مـایس، ئەم خاکەش بـە پانـایی لافـاو داپۆشـیبوو، فڕۆکـەکانی زانیـاری توانیـان دوورگە گەورەو پڕ لە ئاوەکان لە رۆژهەڵاتی وڵات ببینن، زەویـە شـلەکان پڕببوون لە زۆنگاو هەروەها رێگاکانیش داپۆشرابوون بـە قـوڕو لیتـە، لـە مانگی مایس وا باوە کەوا گۆڕانکاری لە سروشتدا روو دەدات ، واش باوە کـە هاتووچـۆ سـەختتر دەبێـت، سـاڵی ١٩٤١ سـاڵێکی ناهـەموار بـوو، لـە کۆتایی حوزەیران رووباری بـك کـە رووبـارێکی پۆڵەندیـە لـە نزیـك برسـت لوتفسك لە باری لافاودا لـە بـەرزی و نزمیـدا بـوو، دواتـر هیتلـەر بڕیاریـدا پێش هێرشەکەی رووسیا بکەوین، کە هەروەکو خۆی لێکـی دەدایـەوە بـە هێرشکردن دژی رووسیا، سەرباری ئاگادارکردنـەوەی رۆنشـتدو سـەرکردە سەربازیە کۆنەکان و کەسانی تر، لەو کاتەدا سەرکردایەتی ئەڵمانیا بـیری لە هەندێك راستی و تیشك خستنە سەریان کردەوە،هەروەکو:

دڵەراوکێ بەشێوەیەکی سەرەکی لەسـەر بـوونی هێـزی گـەورەی هـەردوو لایەنی رووسیاو ئەڵمانیا بوو.

ئـەڵمانیا نزیکـەی ١٢٠ تیپـی هەمـەجۆرەی لـە هـەموو بەشـەکان هـەبوو، رووسـیاش نزیکـەی ١٥٠ تیپـی هـەبوو، گەرچـی ئـەو زانیاریانـەی کـە

پەیوەست بوون بە رووس زۆر دیاریکراو و کەم بوون، چونکە هیچ بەسەرکردنەوەیەکی ئاسمانی نەکراو نەشیان دەتوانی بڕی یەکەی هێزەکانی رووسیا دیاری بکەن، بە بەراوردکردنی هەڵوێستی ئەڵمانیا لەبەرەی رووسیا بەرامبەر هەڵوێستی ئەڵمانیا لە رۆژئاوا لەساڵی ١٩٤٠ بۆمان روون دەبێتەوە کەوا ئەڵمانیا و هێزی تەوەر لە رۆژهەڵات وەکو لە رۆژئاوای نێوان دەریای باکوورو سنووری سویسرا باڵادەست نەبوون، چونکە لە رۆژئاوا چەند تیپێکی چڕی لە پشتەوە هەبوو کە هێزێکی یەدەگ و تا بڵێی بەهێزبوو کە لە قووڵایی بەرەیەکی فراواندا دابەشکرابوون، بەڵام لە رۆژهەڵات ئەم بەرەیە لە ساڵی ١٩٤١ لە رۆژهەڵاتی دەریای رەشەوە درێژ دەبۆوە تاکو دەریای بەلتیق. بەچاو خشاندنێك لە نەخشەی ئەوروپا بە دیار دەکەوێت کە بەرەی ئەڵمانیا پانیەکەی زیاد دەبوو بە زیاتر بوونی هێرشەکانی بەرەو رۆژهەڵات، ئەمەش شتێکی ئاشکرابوو کە جوولەکانی پێویستە نەخشەیان بۆ بکێشرێت لەسەر شێوەی پلانەکانی ناپلیۆنی یەکەم لە ساڵی ١٨١٢ . ئەوکات رووسەکان بەردەوام بوون لە پاشەکشەکردن، بۆیە ناپلیۆن زۆری هەوڵدا لە شەڕێکی یەکلاکەرەوە روبەڕوویان ببێتەوە، ناپلیۆن لەسەرەتادا لەشەڕەکانی سمولنك و بورودینۆ سەرکەوتبوو، بەڵام سەرکەوتنێکی یەکجارەکی نەبوو، کە زستانیش داهات سوپاکەی چوونە شوێنە بزرو نادیارەکانی رووسیاو لە زستاندا سوپاکەی تەخت و وێران بوو، هەموو سەرکردە ئەڵمانیەکانی باسی ئەو دۆڕاندنەی فەرەنسا دەکەن لە ساڵی ١٩٤١. بۆ هەڵسان بە پێکان و دانانی پلانێك بۆ لە ناو بردنی تواناکانی رووسیا بە یەکجارەکی لە رۆژئاوای دنیبر و دفینا بۆ کۆتایی هێنانی ئەو شەڕە بە خێرایی. هەروەها باش تێگەیشتن کەوا ئەم

شەڕە دەبێتە شەرمەزاریەکی بێ کۆتایی گەرهاتوو رووسیا لە هێڵی ڕۆژئاوا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان هەڵدەستن بە کشانەوە بەرەو ڕۆژهەلاَت، سەرباری ئەوانە دوورترین هێڵ کەوا ئازووقەی پێ بگات ئەوا هێڵی دنیبر و دفینا یە

بەشێوەیەکی بەردەوام دەتوانرا کەرستەیان بۆ دابین بکرێت، بەلاَم پاش گەیشتن بەم هێڵە دەبێت هەڵسیت بە وەستانی سەربازی بەمەبەستی چاککردنی هێڵەکانی بە یەك گەیشتن، بۆیە پلانی تیپی زرێپۆش دەبوایە زۆر بە خێرایی بەری ڕۆژهەلاَتی ببڕیبایەو هێزی پیادەش بە دوایەوە بەرەو پێش هەنگاویان بنایە، ئەمەش وایکرد کە پەیوەندییەکی پتەو دروست بێت لە نێوان تیپی زرێپۆش و پیادە، بۆ ئەوەی هێزی رووسیا گەمارۆ بدەن لە هەر شوێنێك کەوا پێیان بگەن، هەروەها بۆ ئەوەی هێڵی گەڕانەوەیان بەرەو ڕۆژهەلاَت لێ ببڕن، هەر چەندە نەشیان دەتوانی ئەم پلانە بە شێوەیەکی سەرکەوتوو ئەنجام بدەن، بەلاَم رووسیەکان هەر لە مۆڵگەکانی ڕۆژئاوای دنیبر مانەوە کە پێویست بوو بەشی هەرە زۆری سوپای رووسیا لە نێوان دنیبر و دنیفیا بێت، بەلاَم چۆن سەرکەوتن لەم پلانە بە دەست دێت ، کە سوپای رووسیا سەرژمێری هێزەکەی چەند ملیۆنێك دەبوو، تا ئەو کاتەش هیچ بڕیارێکی شەڕیشی نەدابوو، سنووری رووسیای ڕۆژئاوا مەگەر بەشێکی کەمی نەبێت بۆی هەیە بتوانێ بەسەر ئەو بەشە کەمەی سوپای سووردا زاڵبێت کەوا لەشکرکێشیان لە ڕۆژئاوای دنیبر کردبوو بەلاَم هێندە ئاسان نییە بۆ لە ناو بردنی بەشی هەرە گەورەی سوپای سوور پاش لەشکرکێشیەکە، بەلاَم لە دواتر بەناچاری پلانێکی ستراتیژی بۆ شەڕی رووسیا لە بەرەیەکی بەرفراوان دارێژرا کەوا لە دەریای سوورەوە درێژ دەبێتەوە تاکو دەریای بەلتیق.

ئایا بۆچوونی ئابووری سیاسی چییە؟

هیتلەر وای دەبینی کە مۆسکۆ گەورەترین دوژمنی جیهانە، هەروەها وای دادەنا کە ئەو شارە بنکەیەکە بۆ سیاسەت و فەلسەفەو بازرگانی و هونەریی هێزی شیوعیەتە. هەروەکو مۆسکۆ کە بنکەیەکی سیاسیە، بەرژەوەندی ئابووریش لەبەر چەند هۆیەکی دیار سەری خستبووە سەر بەشە بە پیتەکەی رووسیا کە کەوتبووە باشووری رووسیاوە، ئەمیش کەرتی ئۆکرینە کە دەوڵەمەندە بە ناوچەیەکی بە پیت بۆ دانەوێڵە، هەروەها ناوچەیەکی زەوی ڕەشیش لەوێدا هەیە، لە باشووریشی چاڵی دونیتز پیشەسازی دروستکردنی چەکە قورسەکانی رووسیا کەوتبوونە ئەو ناوچەیە، لەمەش زیاتر لە باشووریشی بەرزاییەکانی قەفقاس و بیرە نەوتەکانی لێ بوو، گومانی تێدانییە کەوا پسپۆرە ئابووریەکانی ئەڵمانیا هیتلەریان ئاگادار کردەوە لەو سامانە زۆرەی لە باشووری رووسیادا هەیە، ئەمەش بوو بە ناوچەیەکی نیشانکراو هەروەها پێشیان گوت کە ناتوانێ لەم شەڕەدا بەردەوام بێ تاکو ئۆکرین و چاڵی دونیتر و نەوتی قەوقاس دەست بەسەردا نەگرێت، ئێمە دەزانن کەوا سیاسەتی ئابووری کاریگەریەکی لەسەر پلانی وڵاتدا هەیە، ئەمەش لە سەدەی ئێستادا روو دەدات.

ئەی تێڕوانینی سەربازی دەبێت چی بێ؟چەندان بیروبۆچوون بە دیارکەوتن، هەریەکە چاکە و خراپی خۆی هەبوو، لەو کتێبەشدا گرنگی دەدەین بە تێڕوانینی رۆنشتد، ئەو هیچ کاتێك وای بۆ نەدەچوو کەوا بنکەی قورسایی لە پێکهاتەی سوپاکەی لە باشووردا بێت، هەروەکو کەسانێك وای بۆچووبوون، بەڵکو ئەو وای بۆ دەچوو کەوا بنکەی

قورسایی دەبێت لە باکوور بێت. واتە لە پێکهاتەی سوپای باکووری فۆن لیب دابێت، هەروەها ئەو وای دادەنا ناوچەی لینینگراد ئامانجی یەکەمە، چونکە پێشڕەوی کردن بەو ئاراستەیە دەبێتە هۆی پەیوەندی کردن بە فنلەندیە ئازاکان لەلایەنی سیاسی و ئابووری و سەربازیەوە، هەروەها ئەم پێشڕەویەش دەبێتە هۆی بێبەشبوونی رووسیا لە دەریای بەلتیق. رۆنشتد لەو باوەڕەدا بوو پەڕەی دووەمی پێشووەچوونەکەی دەبێ هێرشێکی سەرەکی بێت لە باشووری رۆژهەلات بەرەو مۆسکۆ، لێرەدا پرسیار دەکەین؟ سوودی ئەم لێکۆڵینەوە سەربازیە چییە؟

ئەمانە هەندێك راوبۆچوونی سەربازی دەخەنە روو کە دوورن لە کاریگەری ئابووری و سیاسی، ئەم هۆکارانەش بوون لە زۆربەی کاتدا وایانکرد کە پیاوانی سوپا نەتوانن ئەو شتانەی کە دەیانتوانی جێبەجێی بکەن بیکەن، چونکە ناچاری کردوون ببن بە ئامێرێك لە دەستی سیاسیەکان و ئابووریناسەکان، رۆنشتد بەە ناسرا کە توندترین دوژمنی هێرشە بۆ سەر رووسیا، و پاڵپشتی لە بیرۆچکەی مانەوەی باری بەرگریکردن لە مۆڵگەکاندا دەکرد، بەڵام خۆی یەکلایی کردەوە بە دڵسۆزی کاتێك کەوا سیاسەتی باڵا بڕیاری خۆی دەکرد، دیاریش بوو کەوا شەڕی دژی رووسیا شەڕێکی درێژخایەنەو، ململانێیەکی وا کۆتایی نایە تەنها بە شەڕی بروسك ئاسا لە چەند مانگێکی کەمدا، بەڵکو بەپێی کات بۆی هەیە چەند ساڵێك بخایەنێ. رۆنشتد زانیاریەکی چاکی هەبوو لەسەر رۆژهەلات بۆیە دڵنیا بوو لەوەی ئەم ئەرکانە ناتوانرێ جێبەجێ بکرێ تەنها لە باکوورەوە بۆ باشوور نەبێت، واتە لە لینینگرادەوە بۆ مۆسکۆ، دواتریش بۆ باشوور. وە ئەم پلانەش هیچ کەڵکێکی نەدەبوو ئەگەر قۆناغی یەکەم بە سەرکەوتووی جێبەجێ نەکرابووایە،ئەگەر هەر لە

سالّی یەکەم بەدەرکەوت کەوا جەربەزەکان زیاد لە پێویست چووبوونە قوڵایی و لەشکرکێشیان کردبوو، ئەوا رۆنشتد وای دەبینی لەو کاتەدا کەوا دەست هەڵگیرێ و پاشەکشێ بکرێ بۆ گەڕانەوە بۆ مۆڵگە ئامادە کراوەکان دوور لە رۆژئاوا.

رێکخستنی یەکەکانیش بەم شێوازەی خوارەوە بوو کەوا سەرکردایەتی باڵا نەخشەی کێشابوو:

سێ پێکهاتەی سوپا پێکهێنرا:

١- پێکهاتەی سوپای باشوور: بەسەرکردایەتی فۆن رۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکانی لیوای پیادە فۆن سودنستیرن کە پێکهاتبوو لە نزیکەی پێنج تیپی زرێپۆش و سێ تیپی ئالی و سی و پێنج تیپی پیادە، وە کۆی گشتی زرێپۆشی ئەو هێزە گەیشتە نزیکەی ٦٠٠ ئۆتۆمبێل، دوژمن لە رووی زرێپۆشەوە زۆر سەرکەوتووتر بوو هەروەکو ئۆتۆمبێلە زرێپۆشەکانی دەگەیشتە نزیکەی ٢٠٠٠ ئۆتۆمبێل بە گوێرەی مەزندەکانی ئەڵمانیا، بەڵام ئەم زرێپۆشانە لە مۆدیلە کۆنەکان بوون، ئامانجی ستراتیژیی رۆنشتد هێڵی (ئۆدیسا) و (کییف) بوو، دواییش ناوچەی (دونیتز) و پاشتریش (قەوقاس) بوو. باڵی راستی پاڵپشت بوو بۆ بەرەی باکووری چیای (کەربات) لە رۆژئاوای (برزمیسل) و باڵی چەپەشی پاڵپشت بوو لەلای (بك) لە ناوچەی (كلودوا) لەبەرەی باشووری رۆژئاوا لە ناوچەی (بربیت) سوپای حەوت بە سەرکردایەتی فۆن ستون یناکل کە پێکهاتەی باڵی ڕاستی هەمە چەشنی سوپا بوو سوپای شەش لە ژێر فەرمانی فۆن رۆشناو کە لە پێکهاتەی باڵی چەپی هەمە جۆری سوپا بووە، پێکهاتەی زرێپۆشی یەکەم بەسەرکردایەتی فۆن کلیست بوو.

٢- پێکهاتەی سوپای ناوەندی بە سەرکردایەتی مارشاڵ فۆن بوو کە وە سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی لیوا فۆن کریفن برك بوو ئەم تێکەڵەش مەڵبەندی قودسایی بوو بۆیە نزیکی ٥٠ تیپی بەخۆیەوە گرتبوو لە نێوەندیشیان ٩ میپیان زرێپۆش و ٧ تریان ئالی بوون، تیپی زرێپۆش و ئالی دابەشکرابوون بۆ دوو سوپای پێکهاتەی زرێپۆش پێکهاتەی دووەم بەسەرکردایەتی کودریان پێکهاتەی سێیەم بە سەرکردایەتی هوپ مۆسکۆیش نیشانەیەکی دیاری ئەم پێکهاتە بوون، پێکهاتەی سوپای مەڵبەندی پێکهاتبوون لە دوو سوپا و سەرەڕای زرێپۆشیش سوپای چوار بە سەرکردایەتی فۆن کلوکا لەلای راست سوپای نۆ بە سەرکردایەتی سترووس لەلای چەپ.

٣- پێکهاتەی سوپای باکوور بە سەرکردایەتی مارشاڵ فۆن لیب و سەرۆکی دەستەی ئەرکانی لیوا برنیك هەروەها پێکهاتەی زرێپۆش چوارەم بە سەرکردایەتی هۆبنەر و سێ تیپی زرێپۆشیش و لەگەڵ سێ تیپی ئالی وە کۆی ئەم تیپانەی بە پێکهاتەوە دەبوون بە ٣٠ تیپ و، هێزی دوژمنیش لەو ناوچانە یەکسان بوون لەگەڵ هێزی ئەڵمانیا. سوپای شانزەش بە سەرکردایەتی (بوج) لەلای دەستە راست و سوپای هەژدەش لەلای راست بە سەرکردایەتی کۆهلەر بوو، لینینگرادیش لە باکووردا نیشانەیەکی سەربازی ئەم پێکهاتانە بوو وامان بۆ روون دەبێتەوە کە سوپای ئەڵمانی لە بەشی رۆژهەڵات ئامادەباشی کرابوو لە تەك یەك لەسەر شێوەی چەند چینێکی گەورە کە درێژ دەبۆوە لە کەربات تاکو دەریای بەلتیق، بۆی هەیە ئەم ژمارە تیپانەی کە ئێمە ناومان بردن لەو رۆژانە گەلێ زۆربن، بەڵام پێویستە کەوا بخەینەوە بیرمان کەوا ١٠٠ تیپ لە ساڵی ١٩٤١ شتێکی زۆر نەبوو دژی دوژمنێکی وەکو رووسیا، کەوا

سەرژمێریان دەگەڕایەوە بۆ چەند ملیۆن سەربازێك. بیری ژمارە لە ڕۆژهەڵاتی جیاوازی هەیە زۆر لەوەی کەوا لە ڕۆژئاوا هەیە کە ژمارەی هەزاری ژمارەیەکی بچووك بوو، یەکەکانی هاوپەیمانی لە ڕۆمانیا بە سەرکردایەتی سەرۆکی دەوڵەتی ڕۆمانیا مارشاڵ ئەنتۆنیۆسکۆ لە باشووری پێکهاتەی ڕۆنشتد بوو، هەروەها ئەگەر ئەم یەکانەی سوپای ئەڵمانی یانزەهەم بە سەرکردایەتی فۆن ئەسکوبرت بوو ئەم یەکە ڕۆمانیانەش لەگەڵ یەکە ئەڵمانیەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەژێر سەرکردایەتی فۆن ڕۆنشتددا نەنران وەك ڕێزێك بۆ ئەنتۆنیۆسکۆ، ڕۆمانیا لە ڕۆژهەڵات هاوپەیمانێکی گرنگ بوو، مارشاڵ ئەنتۆنیۆسکۆ سەرۆکی باڵای دەوڵەتی ڕۆمانیا بوو، بۆیە ڕێککەوتنێك لە نێوان بەرلین و بۆخارست مۆرکرا، بەو پێیە ئەنتۆنیۆسکۆ سەرکردایەتیی لە دوورترین شوێنی باشوور لە بەرەی ڕۆژهەلات وەرگرت، بەڵام دەبێت سەر بە ڕێنماییەکانی ستراتیژی ڕۆنشتدی بێت، لە سەرەتای شەڕی دژ بە رووسیا ئەم کەرتانەی خوارەوە لە ژێر فەرمانی ڕۆنشتد دابوون: هەردوو سوپای حەوت و شەش و پێکهاتەی زرێپۆشی یەکەم، هەروەها ئەم کەرتانەی خوارەوەی ئیتاڵیاش لە ژێر فەرمانی ڕۆنشتد دابوون، ئەوانیش فەیلەقی سێیەمی ئیتاڵیا لەگەڵ هەردوو تیپی پیادەو سووك بە سەرکردایەتی لیوا میس بوو، هەروەها فەیلەقێکی هەنگاریش هەر لە ژێر سەرکردایەتی ئەودابوون، سلۆڤاکییەکانیش لە دوو تویێی تیپێکی ئالیدا و لەگەڵ کەتیبەیەکی کەرواتی هەر لە ژێر سەرکردایەتی ئەودابوون. لە دوورترین شوێنی باشووریش هەردوو سەرکردەی سوپای ئەڵمانی یانزەو سوپای ڕۆمانی بەڵێنیان دابوو کە لە ژێر فەرمانی مارشاڵ فۆن ڕۆنشتد دابن، ئەمەش لە توانای هیچ سەرکردەیەکی تری ئەڵمانیدا نەبوو کە ئەم هەموو

کێشــە دەروونیــەی هــەموو نەتــەوەکان بــە باشــی چارەســەر بکــات، جگــە لەوەی کە رۆنشتد ئەنجامیدا. ئەو پیــاوە جیهانیــەی کــە خــاوەنی ژیــری و تێگەیشتنێکی گەورە بوو لە بەڕێوەبەردنی نەتەوەکان، چەند نموونەیــەك بــیر دێنینــەوە، زۆر زەروورەت بــوو کــە کەرتــەکانی رۆمانیــا تێکــەڵ بــە یەکەکانی هەنگاریا نەبێت، لە بــەر ئــەوەی ئــەم دوو گەلــە ئــەو کاتــە دژی یــەکتربوون، چــونکە پێکهاتــەکانی ســوپای باشــوور ئاشــکراو دیــاربوون، هەروەکو لە پێشــوودا و بــەر دەســتپێکردنی شــەڕ رۆنشــتد ئامــاژەی بــەو مەترســیە کــرد. لەســـەر ســوپای حــەوت پێویســت بــوو لــە باشــوورەوە پێشـــڕەوی بکـــات بـــە بـــڕینی گالیســـیا لـــە رۆژئـــاواوە بـــە ئاراســـتەی رۆژهەلات،بەلام لەوێ لە دوورترین شوێنی باشــووریش لــە ســەر ســنووری کەربات لە رۆژئاوای هەنگاریا لە بیست و پێــنج تیپــی رووســیایی کــەمتری لێ نەبوو، ئەی دەبێت ئەم هەموو تیپە رووسیانە کاریان چی بێت؟؟ لەسەر رۆنشتد پێویست بوو وا بکات کە ئەو تیپانە بۆ لای راســتی بــەرەی ئەو هێرش بکەن، لــە کاتێکــدا لــە چیاوە هێــرش بــەرەو بــاکوور دەکــات، لەبەر ئەوەی داوای کرد کە سەرکردەکان لە رۆمانیا یەکتر بگرن، هەروەها داوای لەو هێزە زۆرانــەی کــە لــە باشــووری کــەرتی خــۆی بــوون کــرد، بــۆ ئەوەی چواردەوری هێزەکانی رووسیا بگرن، هەروەکو زانیمان کە سوپای یازدەی ئەڵمانی لــە رۆمانیــا بــوو بــۆ یارمەتیــدانی رۆمانیــەکان، بــەلام بــە یەکترلکانی ئەو تیپانە بە رۆنشتد بە رێژەیەك لەبەر هۆکاری سیاسی بوو. رۆنشتد بۆ سەرکردەی بالا پێشنیاری ئەوەی کرد کــە یەکــە بــە هێزەکــان بەکاربهێنرێن بەتایبەتی ئەو تیپە چیاییانەی لە کەربات بوون لە دژی ئەو بیســـت و پێـــنج تیپـــەی رووســـیا، بـــەلام ئـــەو پێشـــنیارەی رۆنشـــتد رەتکرایــەوە، لەبــەر ئــەوە رۆنشــتد رۆنشــتد نامەیــەکی درۆی بــە خێرایــی

دەرکرد بۆ لاوازبوونی رووسیا، ئەو کارەش کاریگەریەکی توندی هەبوو لە کێشانەوەی هێزەکانی رووسیا بەرەو رۆژهەلات بەشێوەیەکی چاوەڕان نەکراو. ناوچەی زۆنگاوەکانی روکنتو لە باکووری پێکهاتەی سوپای باشوور بوو ئەم ناوچەیەش ناسرابوو بە ناوچەی (بربیت) ئەم ناوچەیە لە رۆژهەلاتی رووباری (بك) بوو لە نێوان سەرچاوەکانی بریست لیتوفسك تاکو (دنیبر) لە هەردوو لای (کییف) و دواوەی. رووبەری ئەم ناوچەیە نزیکەی بە قەد رووبەری باڤاریا دەبوو، پانیەکەشی لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات نزیکەی ۳۰۰ میل دەبوو.

باوەڕی باو تاکو پێش ساڵی ١٩١٤ بەم جۆرە بوو کە هەموو جوولەی کەرتەکانی رۆژئاوای لەو ناوچەیە بە دوور دەزانی، لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە بە دارستان و زۆنگاو داپۆشرابوو، بۆیە کەرتەکان ناتوانن رەتبن، بۆیە هەموو جۆرە پلانێکی هێرشکردن بۆ سەر ئەم ناوچەیە بە دوور دەزانی، چونکە وەك پەرژینێکی سروشتی بۆ ئەم بەشە وابوو.

—ئەم جۆرە زانیارییانەش کە لە رووی جواگرفیای سەربازیەوە تەواو نەبوون، لە شەڕی جیهانی یەکەمدا ئەم زانیاریانە پوچەڵ بوونەوە، بۆیە هەر یەك لە کەرتەکانی ئەڵمانیا و رووسیا لەو ناوچەیەدا لە ساڵی ١٩١٥ را بە دواوە دەستی بە جوولەو شەڕکرد، بەم جۆرە بەرەی شەڕ لە باکوورەوە درێژ بۆوە بەرەو باشوور و بە تێپەڕبوون بە ناوەڕاستی زۆنگاوەکاندا، ئەم ناوچەیەش نە تەنها زەویەکانی نزمایی بوو و کۆسپی خستبووە بەردەم هاتووچۆ،بەڵکو دارستانی گەورەو رووباری لێبوو کە بە بربیت دا بە هەردوو لای تێدەپەڕی و ژمارەیەکی کەمی دانیشتوان لەم ناوچەیەدا هەبوون، هیچ شتێکی لێ نەبوو تەنها چەند شوێنێکی بچووك نەبێت کە بە کەلوپەلی سادەی خراپ دروست کرابوون.

شەمەندەفەری خراپ لە جوولە دابوو لە بریست لیتوفسکەوە بۆ کۆمل ، لە کۆملیشەوە بۆ کییف. شەمەندەفەرێکی تریش لە باکووورەوە بەرەو باشوور لە برانوویس بە تێپەڕبوون بە لومییز تا دەگاتە راونوا لە جوولە دابوو، ئەم جۆرە کەلوپەش بۆ ناوچەیەك کە رووبەرەکەی ٣٠ هەزار میل چوار گۆشە بوو زۆر کەم بوون، کەچی تۆڕی ڕێگاکان کەمتر خەراپ بوون، زۆربەی پردەکانیش لە دار دروستکرابوون لەبەر ئەوە بۆ هاتووچۆی زرێپۆش و ئۆتۆمبێلە قورسەکانی سەربازی باش نەبوون، لەوێدا دەشتێکی زۆر زۆر هەبوو کە پڕی بوو لە زۆنگاو، بەتایبەتی دەشتەکانی نزیك ئاو، لە تەك ئەمانەش رووبەرێکی فرەوان و بە تاڵ هەبوو کە دارستان و زۆنگاوی لێ نەبوو، هەموو ئەمانە رێگر بوون لە بەردەم جوولانەوەی خێرا لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە لە بەردەم کەرتەکانی رووسیا رێگرێکی ترسناك نەبوون، لەبەر ئەوە فەیلەقەکانیان بە تەواوی دەیانتوانی زۆر بە ئاسانی بۆ شوێنێکی تر بچن، ئەمەش لەلایەن هێزەکانی رووسیاوە وەك بەرگرییەکی نایاب وابوو، هۆکارێکیش بوو بۆ هێرشکردنە سەر کەرتەکانی پێشەوە لەبەرەی رۆژهەلات و، بۆ هەر لایەك کە دەیانویست لە شەڕی رووسیاو پۆڵەندە لە ساڵی ١٩٢٠ هێزەکانی رووسیاو پۆڵەندە بەسەر ئەم شوێنانەدا رەتدەبوون و دەم نا دەمێك لە هەموو لایەکەوە بەرەو پێشەوە دەچوون، رۆنشتد هەر لە شەڕی جیهانی یەکەمەوە شارەزای ئەو ناوچانە بوو و دەیزانی لە دەورووپشتی ئەم ناوچانەدا چ هەیە، لەبەر ئەوە ئەو کارەی تاوتوێ کردو ئاگاداری سەرکردایەتی بالای ئەلمانیای کردەوە کە ئەم ناوچانە بە هەند وەربگرن، تاکو بتوانن پیایدا بڕۆن، بۆیە دەبوایە سەرکردایەتی ئەلمانیا ئەم ئاژاوەیە لەم ناوچەیە بە هەند وەربگرێت کە شایەنی ئەمە بوو، لە

ئەنجامیشدا سوپای شەشی ئەڵمانیا توانی هێرش بکات کە بریتی بوو لە بەشێکی لای راستی سوپای رونشتد بەرامبەر هێزێکی گەورەی رووسیا دوای دەرچوونی لەو ناوچەیەدا و گەمارۆدانی بۆ ماوەیەکی دوورو و درێژ. لێرەدا لە توانادا نەبوو زۆر بە ئاسانی پێناسەیەکی ئۆتۆمبێل وەرگەڕاوەکان بکەین، بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ گێڕانەوەی رووداوە سەرەکییەکان بە کورتی.

لە رۆژەکانی یەکەمی پەڕینەوە لەسنووری جیاکەرەوە شەڕی توند تەنیا لە چەند خاڵێکی دابڕاو روویدا، بە شێوەیەکی گشتی جووڵانەوەکان خێرا بوون، هێزەکانی رووسیا بەرگرییەکی توندیان نەکرد هەروەکو پێشبینیمان دەکرد، ئەوەش رۆنشتد بۆی دەرکەوت کە رووسیەکان لە ساڵی ١٩٤١ خۆیان بۆ ئەم هێرشە ئامادە نەکردبوو، لەوێدا بەڵگەی زۆر لە دەست دابوون، لەنێو ئەوانە چەند برووسکەیەکی کەم بوو کە بۆ هەردوو پێکهاتەی سوپای باکوور دەیسەلماند کە رووسیەکان هەر لە یەکەم رۆژانی شەڕدا هەڵخەڵەتابوون، بەڵام هەڵوێستەکان زۆر بە خێرایی لە ئالوگۆڕدابوون و شەڕێکی سەخت بە درێژایی بەرەکان هەفتەیەکی تری خایاند. دوو دڵی رۆنشتد دەربارەی باشوور لە شوێنی خۆی نەبوو، چونکە کشانەوەی تیپی ژمارە ٢٥ ی رووسیا لە کەربات بەرەو رۆژهەڵات و لە جیاتی ئەوەی پێکهاتەی سوپاکەی لە بەشی باشوور تێك بشكێ، بۆیە کشانەوەی سوپای رووسیا بوو بە جێگای سەرسوڕمانی رۆنشتد و وای لێکدایەوە کە کێشانەوەی هێزەکان شتێکی سەر سوڕهێنەرە، شەڕ لە بەرەی سوپای شەشی ئەڵمانی زۆر توندو سەخت بوو، هەروەها ئەرکی ئەو پێشڕەویە بۆ باشووری زۆنگاوەکانی بربیت بە ئاراستەی کییف بوو، کەرتەکانی رووسیاش بە توندی هێرشیان بۆ باکوور کرد، لە کاتی ئەم

جوولانەوەیەشدا رۆژ لە دوای رۆژیش هەڵمەتی رووسەکان زیاتر دەبوو، بۆیە ناچار بوو هەموو کات کەرتە بەهێزەکانی تێکەڵاو بکات، بەم جۆرە لای راستی بوو بە بەریەکی درێژو بە بەرەوام بێ هێز دەبوو، ئەمەش بووە هۆی کەمبوونەوەی هێزەکانی بەرەو رۆژهەڵات، لە دوایشدا سوپای رۆنشتد بۆ ماوەیەکی زۆر بەراوەستاوەیی لە لێوارەکانی باشوور لە بربیت مایەوە بۆ ئەوەی رووداوەکان زیاتر روون و ئاشکرابن، پێویستە ئەوە وەبیر بێنینەوە کە بەشی راستی سوپای چوارەم کە فۆن کلوکا سەرکردایەتی ئەو سوپایەی دەکردو پێکهاتبوو لە یەکە تێکەڵاوەکانی سوپای مەڵبەندی بەبێ گومان کەرتەکانی لە پێشکەوتن دابوون و سەرکەوتن لە ناوچەی زۆنگاوەکانی کنتو، بەڵام ئەم کەرتانەش بێ هێز بوون، هەروەها تیپی سوارەی ئەڵمانیا لەو ناوچەیەدا بەڵام هێزەکە وەکو پێویست تەواو نەبوو دوای چەند رۆژێك دووبارە لەسەر رێگای برست لیتوفیسك – برانویسی گشتی بەرەو باکوور کێشایەوە.سوپای چواریش لە جیاتی ئەو فەیلەقەی کە پێکهاتبوو لە دووتیپ پێشرەوی کرد، لە سەرەتاشدا تیپێکی تری خرایە سەرو بوو بە سێ تیپ، بۆیە ئەم فەیلەقە پێشرەوی کردو بۆ کشانەوەی لەم ناوچەیە فرەوانەو بە تێپەربوون لە منسك بۆ کومل و موستیر بەتەنها ئەوەی نەخشەکان پیشانی دەدەن کە سێ تیپ شایانی باسکردن نین دەربارەی ئەو درێژە بوونەوە فرەوانەی لە وڵاتدا، هەر چەندە ئەم پاڵەپەستۆیەی ئەڵمانیا رووسیەکانی بێزارنەکرد لە دارستانەکانی باشوور، لەبەر ئەوەی ماوە لە نێوان فەیلەقی ئەڵمانی ناوبراو لەگەڵ هێزەکانی رووسیا زۆر دوور بوو، هەروەها رووباری بربیت هەردوو لای لە یەکتر جیا دەکردەوە. لە ناوەڕاستی تەمموزی ساڵی ١٩٤١ یەکەکانی پێشەوە لە پێکهاتەکانی

سوپای باشوور گەیشتە ناوچەی رۆژئاوای کییف، هەروەها لە سەرەتای ئاب سوپای رووسیا بە تەواوی شکستی هێنا لە شەڕی ئومان، زەرەرو زیانەکانیشی بریتی بوو لە نزیکەی ١٠٠,٠٠٠ سەربازی بە دیل گیراو، لە باشووریش سوپای یانزەی ئەڵمانیاو سوپاکانی رۆمانیا لەگەڵ پێکهاتەکانی سوپای رونشتد توانیان دەست بەسەر بسرابیا دابگرن و دەورەی ئۆدیساش بگرن کە ناوەڕاستی تشرینی یەکەم بە دەستی کەرتەکانی هاوپەیمانان رووخا. دووژمن تەنها سەری چەند پردێکی لە دەستدا مابوو کە دەیویست پارێزگاری لێبکات و دەستبەرداری نەبێ ، لە لێواری رۆژئاوا یەکێك لەو شوێنە گرنگانەش دنیبر و تبروفسك بوو کە لە کۆتایی مانگی ئاب داگیرکرا.

رووداوەکانی شەڕی گەورەی کییف کە بەشێکی زۆر لە پێکهاتەکانی سوپای مەڵبەندی و باشوور بەشداریان تێداکردو توانیان سەرکەوتووبن لە گەمارۆدانی چوار هێزی رووسیا، ئەم شەڕە گەورەیەش تا کۆتایی مانگی ئەیلوولی سێپتەمەبەر بەردەوام بوو پێکهاتەکانی سوپای باشوور توانیان ٦٠٠,٠٠٠ شەش سەد هەزار سەربازی رووسی بە دیل بگرن، لە دوای شەڕێکی قوریسش توانیان شاری کییف لە رۆژی ١٩ی تشرینی دووەمدا داگیر بکەن. بەڵام رووسیەکان بۆمبێکی زۆری چێنراویان لە نێو ئەم شارەدا بڵاوکردبۆوە بۆیە بە بەردەوامی ئەم بۆمبانە بۆ ماوەیەکی زۆریش لە دوای رووخانی شاری کییف بە رووی ئەڵمانەکان دەتەقینەوەو بووە هۆی تێکدانی هێزەکانی ئەڵمانیاو زەرەوزیانێکی زۆریش لە ئەنجامی تەقینەوەی ئەم بۆمبانە بە سەربازەکانی ئەڵمانیا کەوت...

ئەم شەڕە بەردەوام بوو تا بە کۆتایی گەیشت و رۆنشتد درێژەی بە هێرشەکەیدا بۆ سەر دنیبری خواروو کە کەرتەکانی توانیان خاڵێکی زۆری

سەربازی بە دوای خۆیانەوە جێ بهێلن. لە شەڕێکی تردا کە لە باکوری دەریای ئازوف لە نیوەی مانگی تشرینی یەکەمدا هەڵگیرساو، لە ئەنجامدا توانرا گەمارۆی هێزێکی گەورەی رووسیا بدەن و ١٠٠ هەزار سەربازیان لێ بەدیل بگرن، هەروەها لە ٢٥ی تشرینی یەکەم کەرتەکانی رۆنشتد توانیان دەست بە سەر شاری خارکوف گرنگ دابگرن و ناوچەی دونیتز داگیر بکەن کە شارێکی گرنگ بوو لە یارمەتیدانی شەڕەکانی رووسیا، باشووری ئەم ناوچەیەش لیوا فۆن مانشتاین توانی داگیری بکات کە لە دوای مردنی لیوا سیوبیرت بوو بەسەرکردەی سوپای یانزەهەم بە بەشداری لەگەڵ کەرتەکانی رۆمانیا توانیان بچنە ناو دوورگەی قرم لە تەنیشت بری کوب هەروەها توانیان دەست بەسەر سمر بول لە سەرەتای تشرینی دووەمدا بگرن، کە نزیکبوون لە قەڵای سواستبولی گرنگ ئیتر ئامادەباشیەکان بۆ گەمارۆدانی ئەم شارە تەواو بوون. لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی ئەڵمانیا دوای شەڕێکی سەخت لەگەڵ هێزەکانی رووسیا ناچار بوو نیمچە جەزیرەی الکرج و شاری رووستوف بەجێ بهێڵێ، دوای ئەوەی هێزەکانی رووسیا هێرشیان کردوو رووبەڕوویان بوونەوەو سەرکەوتوو بوون بە سەرکەوتنێکی توند بەلام پێویستە کە بیر بکەینەوە کە جوولەکەکان دەستیان پێکرد بێ ئەوەی هیچ رووداو کێشەیەك لە ناوچەی رۆنشتد رووبدات، بەلام لەوێدا لێکدانەوەیەکی توند لە بیروڕا هەبوو لەنێوان هیتلەرو سەرکردە گەورەکان و پێکهاتە و سێ سوپایەکەی ئەڵمانیا لە هەموو بەرەی رۆژهەلات، کە لە نێوان رووباری ئازوف و دەریای بەلتیق بوو، ئەم جۆرە بیروڕاجیاوازانەش شتێکی سەیر نەبوو، چونکە ناتوانرێ ئەم جیاوازیانە فەرامۆش بکرێن کە بریتی بوون لە بیروبۆچوونی ستراتیژی، ئەم بیرو بۆچوونە دژ بە یەکانەش لە هەموو شەڕێکدا هەیەو

چارەیەك نییە بۆ لێ دەربازبوونیان، چونکە سەرکردایەتی سیستەمێکی ژمێریاری نییە تاکو ملکەچی ڕێسایەکی جێگیربێت.
لەوێدا پەیوەندیەکی بەتین لە نێوان پێکهاتەکانی هەر سێ سوپادا لە شەڕە بەرفرەوانەکاندا هەبوو، بۆیە چارەسەرکردنی هەر کەرتێك بە تەنیا دەبێتە هۆی پیشاندانی وێنەیەکی هەڵە: بۆنموونە پێکهاتەی سوپای مەڵبەندی لە مانگە گرنگەکانی تەمووز و ئەیلوول بەبێ ئەرك مابۆوە، بۆیە ئاستەنگەکانیش هەر کەلوپەل و ئازووقە نەبوون، بەڵکو ئاستەنگەکان جیاوازی بیروبۆچوون بوو دەربارەی دواخستنی هێرشکردن، بۆیە هەندێك پێیان وابوو بەرەو مۆسکۆ هێرش بکەن، بیروبۆچوونی تریش هەبوو کە دەیانگوت مەڵبەندی قورسایی بۆ بەرەی ڕۆنشتد بگوازرێتەوە لە باشوور، لە پێش هاتنی زستاندا کاتێکی زۆر بە فیرۆچوو، چونکە دەبوایە لەو چەند مانگەدا ڕۆنشتد دوای ئەوەی لەسەر ئەوە بڕیاریاندا هێرش بەرەو چەقی قورسایی مۆسکۆ بکرێت چەند یەکەیەك حەرەکە پێ بکات بە ئاراستەی سوپای دوو، ئەم ئەرکەش لە ئەستۆی پێکهاتەی سوپای مەڵبەندی بوو، ڕۆنشتد لەگەڵ فەرمانەکانی سەرکردایەتی باڵا کۆك نەبوون کە داوای دەکرد هێرش بۆ سەر کریسك لە باکوورو بولتافا لە باکووری ڕۆژهەڵات و رووستوف لە باشوور بکرێت، چونکە ئەوانە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی کەرتەکانی، هیتلەر زۆر داوای دەکرد لە کات و ساتدا خێرابن، لەلایەکی دیکەوەش سەرکەوتنی سەربازی داوا دەکردو دەیویست دەست بەسەر ناوچە پیشەسازیە گرنگەکاندا بگرێت، بۆیە نەدەتوانرا ئەم دوو داواکاریەش پێکەوە کۆببنەوە، لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤١ کێشەی یەکەم لە نێوان ڕۆنشتد و هیتلەر درووستبوو، تیپی زرێپۆشی فۆن کلیست

رووبەڕووی هێرشەکانی رووسیا بووەوە لە ناوچەی رووستوف هەروەکو لە پێشوودا باسمانکرد، لەو کاتیشدا زستانی رووسیا بەڕێوەبوو رۆنشتد رووی خۆی وەرگێرا بۆ دەربڕینەکانی دەربارەی مەترسیەکانی هەڵوێست لە (دونیتز)، بۆیە داوای کرد بۆ هەڵبژاردن و کورتکردنەوەی ئەم بەرەیەو پاشەکشەکردن بۆ پشتەوەی رووباری میوس، دواتریش هەستا بە نووسینی راپۆرتێك بۆ هیتلەرو تیایدا ئاگاداری کردەوە ئەگەر بیروڕایەکی تر هەبێت ئەوا با لە سەرکردەیەکی تر بۆ ئەم بەرەیە بگەڕێ،
هەر ئەم بیروڕایە جیاوازەش بوو کە بووە هۆی وازهێنانی رۆنشتد، رۆنشتد بە فشاری دڵ نەخۆش دەکەوێت لە کاتێکدا بە شەقامێکی شاری بولتافا دا دەڕۆیشت لە سەرەتای تشرینی یەکەم، هەر لەم رۆژەوەش نەخۆشیەکەی دەستپێکرد، لە رۆژی ١٢ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١ بەرەی رۆژهەڵاتی بە جێهێشت و گەڕایەوە بۆ شاری کاسل و ژیانێکی شارستانی، لە جێگای ئەویش مارشاڵ فۆن ریشناو یان بە شێوەیەکی کاتی لە شوێنی رۆنشتد دانا، لیوا فۆن سودنستیرن کە سەرۆکی دەستەی ئەرکانی پێکهاتەی باشوور بووە لەو کاتیدا کە ئەم کێشەیە روویداوەو بۆتە هۆی وازهێنانی رۆنشتدی زۆر ژیرو شارەزا، بەم جۆرە ئەم کێشەیە دەگێڕێتەوە: پێکهاتەکانی سوپای باشوور بە هەموو یەکەکانی لە مانگی تشرینی یەکەم و تشرینی دووەم تووشی رووبەڕووبوونەوە هاتن، هێزی زرێپۆشی کلیست بەرەو رووستوف بۆ (دون) هێرشی کرد، هەروەکو هیتلەر فەرمانی پێدابوو. هەروەکو زانراوە هێرش کرا بەرەو رووستوف بەڵام ئەنجامەکەی بەپێی ئەو ئاگادارکردنەوەیە کە پێکهاتەی سوپا بە دروستی دایرشتبوو دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەی یەکەم کە بووە هۆی داگیرکردنی رووستۆف بۆیە رووسیا سوپا بەهێزەکانی توندوکردو

گواستەوە بۆ ئـەوەی هێرشـی دژ بـە بەشـی ئاشـکرای بـاکوور بکـاتن کـە مەبەسـتی ئـەو شـوێنە نـەبوو، لەبـەر ئـەوە ئـەڵمانیا کـە چـواردەوری رووستۆف گرتبوو هێڵی گەڕانەوەش بڕاو کەوتـە مەترسـیەوە. لـەو کاتیـدا لەلایەکـەوە کێشـە لـە نێـوان رۆنشـتد و دەسـتەی ئەرکانەکـەی درووسـت بوو،لە لایەکی دیکەشەوە کێشە لەگەڵ بارەگای هیتلەریش هاتە کایـەوە، لەسەر دیاریکردنی کاتێکی گونجاو بۆ پاشەکشـەی ئـەو یەکانـە کـە پـاڵ نرابوون بەرەو پێشەوە، بەبێ بوونی هیچ زانیاریەك، ئینجا هەر راپـۆرت و پەیوەندی و برووسـکەو تەلـەفۆن بـوو دەکـرا بـەلام هـەمووی بـێ سـوود بوون،

من خۆم بە تەلەفۆن چەند جارێك قسـەم لەگـەڵ کایتـل کـردو ئامۆژگـاریم کرد بۆ فەرمانەکانی سـەرکردەی گشـتی ئـەویش دوو دڵ بـوو لـە سـەختی زستانی رووسـیا، بـەلام ئـەو خـۆی ئـەو بارودۆخـە بـاوەی بـەرەی شـەڕی نـەدەزانی، ئـەو خـۆی لـەو بـاوەڕەدا بـوو کـە کەرتـەکانی دەتـوانن ئەرکەکانیان جێبەجێ بکـەن، لەسـەر ئەمـەش متمانـەی بـە ئامـادەکردنی سەربازی سەیر هەبوو،،،

لە ئێوارەیەکی کۆتایی مانگی تشرینی دووەمدا رۆنشتد بـە دەسـتی خـۆی لە راپۆرتێکی رۆژانە دەربـارەی کشـانەوەی کەرتـەکانی لـە رۆسـتۆف کـە بەم شێوەیە بوو:

داوا دەکـەم بـە دوای سـەرکردەیەکی تـردا بگـەڕێن کـە جێگـای بـاوەڕو متمانە بێت کە پێویستە بۆ سەرکردایەتی کردنی بالا،

لە راستیدا مارشاڵ فۆن کلیست سەرکردەی زرێپۆشەکان بوو ئەو کات کە بواری بۆ ڕەخسا و کشانەوەی هێزەکانی پەسـەندکرد بـۆ دواوەی بـەرەی شەڕ لە میوس.

کاتێك بە ڕۆنشتدم گوت: من دوو دڵم کە هیتلەر لەسەر ئەم بە یەك گەیشتنە لەم کەشوهەوا ئاڵۆزەدا رازی بێت. بەڵام ڕۆنشتد هەر لەسەر بڕیارەکەی سوور بوو کە لەنێو راپۆرتەکەیدا نووسیبووی.
کاتژمێر یەکی بەیانی بڕیاری پەسەندکردنی لادانی ڕۆنشتد لە سەرکردەیی و سپاردنی سەرکردایەتی پێکهاتەی سوپاکەی بە شێوەیەکی کاتی سپاردرا بە ڕۆنشتد فۆن رشناو، بەڵام رشناو نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی بە تەلەفۆن گوتی: ئەو هیچ پێشنیارێکی نییە دەربارەی بەردەوامبوونی نییە زیاتر لەوەی هاوڕێکەی (ڕۆنشتد) پێشکەشی کردووە، بەم جۆرە بڕیاری کێشانەوەی کەرتەکانی رووستۆڤی وەرگرت بۆ بەرەی میوس. دوای چەند ڕۆژێك وابزانم ئەو ڕۆژە ٣ی کانوونی یەکەم بوو هیتلەر بە فڕۆکە بەرەو بارەگای کلیست لە (تاکان روك) فڕی لە ڕێگای گەڕانەوەشی کەشوهەوا ناچاری کرد کە لە بولتافا بنیشێتەوەو ئەو شەوە لە بارەگای پێکهاتەی سوپا بباتە سەر، کاتژمێر پێنج یان پێنج و نیوی ئێوارە کاتم بۆ گونجا تاکو هەڵوێست و باسی ڕووداوەکانی بۆ بگێڕمەوە کە ماوەی هەفتەکەی پێشوو بە شێوەیەکی تەواو پیاچوونەوەم لەسەر کردبوو، لە کاتی قسەکرنمدا لەسەر ئەو گفتوگۆ تەلەفۆنیە جۆر بە جۆرانە وەستام کە لەگەڵ کایتل کردوومانە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرکردەی گشتی هەروەها لەسەر ئەو برووسکانە وەستاین کە بۆ (جودل)م ناردووە "هەموو دانیشتوەکان، لە نێوانیان رشناو سەرۆکی هۆبەی جوولە لە پێکهاتەی سوپای شمندل و انکل ئەوانی تر سەریان سوڕما لە سستی هیتلەر، هیتلەر بەم وشانە وەڵامی دایەوە: ئەی سەرکردە باوەڕ بکە من توڕەم، بەداخەوە کە هیچ زانیاریەکەم لەسەر ئەم ڕووداوە نییەو هیچ کەسێك بۆی باس نەکردوومە، وەڵامەکەم بەم جۆرە دایەوە: باوەڕبکە

ئەی سەرۆك كە تۆ گوێ لە هیچ شتێك لەمبارەیەوە ناگریت. هیتلەر وەڵامی دایەوە مارشاڵ فۆن رۆنشتد لە كوێیە؟ لە ژوورێكی تردا چاوەڕانی دەكات بەپێی رێنماییەكان. هەر لەم ژوورەشدا هەردووكیان ئاشتبوونەوە، دوای كۆتایی هاتن، رۆنشتد ئەم بەشەی بۆ گێڕامەوە، هیتلەر بیانووی هێنایەوە گوایە شارەزایی لەسەر راستیەكان نەبووە، دواتریش لە رونشتد پاڕایەوە بۆ ئەوەی گرنگی بە نەخۆشیەكەی بدات تا لە دوای تەواوبوونی مۆڵەتی نەخۆشیەكەی جارێكی تر لە ژێر فەرمانەكانی بتوانێ خزمەتێكی باش پێشكەش بكات...

لە رۆژی ٥ كانوونی یەكەم دیسمبر لە نێو ئاهو حەسرەتەكانی بەشەمەندەفەرێكی تایبەت و لەنێو دەنگی مۆسیقای سەربازی و بە ئامادەبوونی هەموو ئەو سەربازانەی كە لە بولتافا بوون و پاسەوانانی شەرەف بەڕێیانكرد. رۆنشتد ئەو ماوەیە زۆر لەسەر ئەم رووداوە قسەی دەكرد، ئەمە یەكێكە لە باسە تایبەتیەكانی:

" دوای داگیركردنی ئۆكرین ئەوەی لە تواناماندا بوو كردمان بۆ ئەوەی بتوانین كەنیسەكە بگەڕێنینەوە دەست خەڵككە چونكە پێشتر شیوعیەكان پیرۆزی ئەم شوێنەیان پێشێل كردبوو و كردبوویان بە مۆزەخانەیەكی هونەری نەك خواپەرستی" هەروەها توانیمان جوانكارییەكانی ئەو كەنیسەیە بگەڕێنینەوە كە رووسیەكان لەبەر چاوی خەڵككە بردبوویان و خواپەرستیش گەڕایەوە بۆ ناو كەنیسەكە، هەروەها راهاتم كەلە كەنیسەی بچووكی ئاڵتانا ئامادەبم كە لە ساڵی ١٧٠٩ بەترۆسی گەورە نوێژی سوپاسی كردووە سەبارەت بە سەركەوتنی بەسەر چارلسی حەوتەمی سوێد.

" هەروەها لە رۆژهەڵات راهاتم بسوڕێمەوە بەبێ چەك هەروەكو بڵێی لە

بەرەی رۆژئاوابم و هیچ کەسێك لەگەڵماندا نەبوو تەنها یەك ئەفسەری ئێشکگری سەرۆك فۆن سلفیاتی نەبێت، هیچ کەسێك بێزاری نەکردووم... هەروەکو دڵی دانیشتوانی ئۆکرین خۆش بوو بەرامبەر قەڵەبالغی سەربازەکانمان.
شوێنەکەی من ئەوە وابوو حزبیەکانی سەر بە پارتی نازی ئەو کاتەی هەر لێ نەبێت، دانیشتوانەکە بە شێوەیەك سەیری ئێمەیان دەکرد وەکو بڵێی رزگارکەری ئەوانین، جارێکیان بە شەقام ئۆمان دادەرۆیشتم ئافرەتێك لە پێش خۆی دانەواندو ساقۆکەی ماچ کردم، وەلامی چەند پرسیارێکی دامەوە کە پێیانەوە خەریکبووم:
ئەو ئافرەتە کچێکی تەمەن پانزە ساڵانی هەبوو لەگەڵ ئەفسەرێکی ئەڵمانی یەکتریان خۆشویستووە، ئەم خۆشەویستیە وای لێکردووە کە بە دوای ئەفسەرەکە بکەوێت و دایکی خۆی بەجێ بهێڵێت یەکەی ئەفسەرەکەش لە ناوچەیەکی دوور بوو لە بەرەی رۆژهەلات، ئەو ئافرەتە وای تێگەیاندم کە کچەکەی بۆ بگێرمەوە، ئەم داواکاریەی لە شوێنێك بوو کە زۆر فروان و ژمارەیەکی زۆری لە سوپا تێدا بوو هەروەها ئەو ئافرەتە ئەو یەکەی نەدەناسی کە ئەفسەرەکەی تیا بوو، منیش داوای پێکهێنانی لێکۆڵینەوەیەکی بە پەلەم لەنێو هەموو یەکەکانی سوپادا کرد،لە راستیدا ئینزیباتی سەربازی سەر بە سەرکردایەتی توانیان ئەم کچە بە ساغ و سەلامەتی بدۆزنەوە بیگەڕێننەوە بۆ دایکی، ئەم دایکە ئافرەتێکی خوێندەوەواربوو، زانکۆی خوێندبوو بڕوانامەی دکتۆرای هەبوو، کاتێك لە کانوونی یەکەم دەستم لە کارکێشایەوەو ئۆمان بەجێ هێشت ئەم ئافرەتە کچەکەی خۆی بە چەپکە گوڵێکەوە لە ئیستگەی شەمەندەفەر ئامادە کردبوو بۆ خوداحافیزم، دایکیشی بەرگێکی سەرمێزی نان

خواردنی کـه بـه دەسـتی خـۆی چـنیبووی پێشـکەش کـردم. لـه ئۆکرانیـا ئاهــەنگی زۆر گــەورە لەبــەردەم هاتووچــۆدا هــەبوو، هــەموو ڕێگــا سەرەکیەکان زۆر خەراپ بوون تەنها کەمێکیان نەبێ زەویەکانی ئۆکرانیـا زەوی رەش و بەپیت بوون، هەروەها نـەرم و قووڵبـوون چـونکه لـه کـاتی باران باریندا ئەو ئاوانه گـۆمی قووڵیـان درووسـت دەکـرد، ئۆتۆمبێلـەکان دەچەقین بە تانکەکانیشەوه کە نەیدەتوانی رێگـای خـۆی ببڕێـت، مەگـەر پـاش ماندووبوونێکی زۆرو بـه فێرۆدانـی سـوتەمەنیەکی زۆر نـەبێت، لـه هاوینی ساڵی ١٩٤١ هیتلەر داوای لە مۆسۆلینی کـرد بـۆ ئـەوەی لەگەڵیـدا ســەردانی بــەرەی رۆژهــەڵات بکـات ســەرۆکی دەوڵــەتی ئیتاڵیـا کــەرتی مەڵبەندی لە لبریست لتوفیسك پشکنی لە دواییدا بـەرەو باشـوور رۆیشـت بۆ لای رۆنشتد. لەوێدا هیتلەر و مۆسـۆلینی دەیانویسـت هەرچـۆنی بێـت سەردانی فەیلەقی ئیتاڵیا بکەن کە لەگەڵ پێکهاتـەی سـوپای باشـوور لـه نێو بەرەی شـەڕدابوو، هـەردوو دیکتـاتۆر بـه هاوڕێیـەتی رۆنشـتد بـەرەو بەرەی شەڕ بەڕێکەوتن، لەم کاتیشدا بـارانێکی بـەخوڕ بـاری کـه هێشـتا ئەوەنـدەی نەخایانـدبوو، بــوو بــەهۆی وەسـتانی گۆمـاو لەسـەر ئـەو رێگایانـەی کەئـەوان دەیـان ویست پیایـدا بـڕۆن، بۆیـە ئۆتۆمبێڵـەکانیان نەیاندەتوانی لەماوەی هەشت کاتژمێردا زیاتر لەبیست میل ببڕن، چـونکه ئوتۆمبێلـەکانیان تـا زیـاتر دەچـوونه پـێش زیـاتر دەچـەقین، تیپـەکانی ئیتاڵیا پێشڕەویان لەسەرخۆ بوو، هەروەها ماوەکەشیان درێژتر بوو،

هیتلـەر ومۆسـۆلینی و رۆنشـتد ئـەم یەکانـەیان بـڕی و هـەردوو سـەرۆك گەیشـتنه بیروڕایـەکی راسـت دەربـارەی بـەرەی رۆژهـەڵات، کـەزانیان دەرکردنـی ئـەمجۆرە فەرمانـە لەسـەر نەخشـەو لەدووریـەکی فـراوان

لەپشتەوە بۆ پێشڕەوی خێرا، زۆر ئاسانترە لەجێبەجێکردنی لە بەرەیەك کە قوڕ و گۆماو بێت.

ئەمە کاریگەریەکی زۆر قوولّی لەهیتلەر کرد، هەروەها لەمۆسۆلینش، هیتلەر بەمۆسۆلینی گوت: "ئا لێرەدا گۆماوەکانی ولاّتەکەت لەناوچەی (بۆنتین) دەبینین!!"

لەبەر ئەم هۆیەو هەروەها لەبەرئەوەی هیتلەر هەمووکاتێك دژی پاکشەکشێ بووئینجا بەهەر شێوازێك بێت، گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بە هیچ جۆرێك بیر لە پێشنیارەکانی ڕۆنشتدی کودەتاچی نەکاتەوە. بەلاّم زۆر بەزحمەت دەتوانرا دەست بەسەر ئەو ولاّتانە دابگرێت کە سنووریان پانو بەرینە و بەسەریەکەوەیە، وەك رووسیا لەماوەی چەند مانگێکی کەمدا بەبێ گوێدان بەماوە و ئەو ئاستەنگانەی هاتوچۆو زستان و..هتد کەتووشیان دەبێت. لە کاتێکیشدا هیچ چارەیەك نەما بۆ گرتنی ولاّتە فراوانەکە لەسالّی ١٩٤١ هیچ رێگایەکی بەدەستەوە نەما تەنها پاشەکشە نەبێت بۆمۆلّگەیەکی بەهێزو باش، بۆ دووبارە خۆکۆکردنەوەو دەستپێکردنەوەی جموجۆلّ سەرلەنوێ لەسالّی ١٩٤٢هەروەها بۆگەڕان بەدوای ریگەچارەی سیاسی بۆ دەرچوون لەم نەهامەتیە.

خاکی بەرفراوان و، گۆڕەپانە لەیەکتر نزیکەکان و، رێگەوبانە ناخۆشەکان و، زستانی سەخت ودژوار بوون بوون بەیارمەتیدەرو باشترین هاوپەیمانی رووسیا.

ئەوەی گرینگە و کە لە بیرمان ناچێتەوە ئەوەبوو کەسوپای ئەلّمانیا لەسالّی ١٩٤١ بەشێوەیەکی سەرەکی لەتیپەکانی پیادە پێکهاتبوو، واتە تیپەکانی لەجۆرەکانی کۆن بوون، لەکاتی گواستنەوەدا سەربازەکانی

بەپێ دەڕۆیشتن، تیپی ئۆتۆمبێلەکانیش بەشێکی بچووکیان لەکۆی ئەو تیپانە پێك دەهێنا، چونکە بۆ بڕینی ئەوماوە زۆرەی نێوان (بریست لتوفیسك) تاکو مۆسکۆ بەپێ و شەڕکردن رۆژ لەدوای رۆژ دەبێتە هۆی ئەوی گەیشتن کارێکی زەحمەت و دژوار بێت.

هاوپەیمانەکانی تەوەرە بەتایبەتی ئیتالیەکان و هەنگاریەکان بەچاکی درکیان بەم هەلۆێستە کردو ئەم هەلۆێستەیان بۆ حکومەتەکانی خۆیان لەرۆمانیا و بودابیست روونکردەوە، بۆیە تێگەیشتن لەگەڵ رۆمانیا ئاسنتربوو لەوەی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی تر، لەبەر ئەوەی گیروگرفتەکانی رێگاو بان لەرۆژهەلات بەباشی دەزانن بەتایبەتی لەنێوان ئەوان و لەنێوان خۆیان، بەتایبەتیش کە ئەنتۆنیسکۆ ئەوکاتە خۆی سەرۆکی رۆمانیابوو.

دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە تا چەند تێگەیشتن و زانینی هەلۆێستی سەربازیی هیتلەر و فەرمانگە پیشەسازییەکان هەڵە بوون، لەکاتێك دا هیتلەر لەساڵی ١٩٤١ یەکە سەربازیە شەڕکەرەکانی ئەڵمانیای داوا کرد کە (لیوای زەیت) بوو کە دەستەیەکی هونەری تایبەت بوو مەبەستیشی لەم لیوایە وەبەرهێنانی یەکەم ناوچەی نەوتی بوو، بەپێی لێکدانەوەیان سوپا سەرکەوتوو دەبێت لەماوەی نێوان ٢٢ ی حوزەیران و سەرەتای هاتنی زستان بۆگەیشتن بە باکۆ لە قەفقاسیای رۆژهەلات !!

ئەمەش داوایەکی زەحمەت و گران بوو.

رۆنشتد لەکاسل مایەوە تا ئەوکاتەی هیتلەر تکای لێکرد بۆئەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوەو سەرکردایەتی بەرەی رۆژئاوا وەربگرێتەوە.

## بەشی هەشتەم

### گەڕانەوە بۆ ڕۆژئاوا

دووبارە هیتلەر ڕۆنشتدی بە سەرکردەی ڕۆژئاوا دامەزراندەوە و هەرلەو پلەیەدا مایەوە، تاکو ئاداری ساڵی ۱۹٤۲جارێکی تر لەسەرەتای تەمووزی ساڵی ۱۹٤٤خانەنشین دەبێتەوە

ئەم ماوەیەش بۆ ڕۆنشتد زۆر سەخت ودژوار بوو، چونکە شەڕەکە چەندی بڵێی ناخۆش و دژواربوو، هەروەها شەڕەکەش گەیشتبووە بارێکی ناخۆش وئاڵۆز، بۆئەوەی ڕۆڵی ڕۆنشتدی سەرکردەی گشتی لەڕۆژئاوا بەتەواوی بزانین لەدوای ئەوەی لەرووسیا خانەنشین کرا، پێویستە ئاماژە بە راپۆرتێکی فەریق (زمرمان) بکەین کەئەوکاتە سەرۆکی دەستەی ئەرکانی حەرەکاتی سەرکردایەتی گشتی بوو لەرۆژئاوا، دوای داواکردنەوەی ڕۆنشتد بۆ وەرگرتنەوەی پلەو پایە سەرکردایەتیە نوێیەکەی. فەریق (زمرمان) لەسەر داوای هۆبەی ئەمەریکی بۆ مێژوو و بەهاوکاری هەندێ لەیاریدەدەرەکانی هەڵسان بەپۆلێن کردنی ناوی پیاوەکانی کە لەڕیزی سوپادا بەناوبانگ بوون لەمێژووی سەرکردایەتی کردنی ڕۆژئاوا لەدووتوێی کتێبێکی گەورە کەبریتی بوو لە ۲۳۰۰ لاپەڕە، ئەمەشی لەساڵی ۱۹٤٥-۱۹٤٨ئەنجامدا، فەریق (زمرمان) ئەفسەرێکی ئەرکانی بەرزبوو: ناسراو بووبە موکوڕ و کردەوەی بەبەرهەم، تالەساڵی ۱۹۱۸و دوای کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی خانەنشین کرا، هەر لەوکاتەوە توانی بەتێکۆشانی خودی خۆی و لەژێر ئەو بارە نالەبارە دەزگایەکی سەربازی مانگانە بۆبڵاوکردنەوە بەناوی (ئۆفین ورت)

دابمـەزرێنیَ و ئەمـەش وایکـرد ببێتـە خـاوەن ناوبـانگێکی بـاش لەسـالّی ١٩٣٩.

لەسالّی ١٩٣٩ لەکاتی راگەیانـدنی بـاری نائاسـایی دووبـارە بانگکرایـەوە بۆخزمەتی سەربازی و، بوو بەسەرۆکی روکـنی حـەرەکات و هـەر لەسـالّی ١٩٤٠ تـا مایسـی سـالّی١٩٤٥ لـەم پلەیـەدا مایـەوە، لـەم ماوەیـەدا پلـەی سەرۆکی ئەرکانی حەرەکاتی سوپای یەکەمی وەرگرت کە بەسەرکردایەتی فـون (ویتـزلبن) بـوو، پاشـانیش بـوو بـە سـەرۆکی ئـەرکانی حـەرەکاتی سـەرکردایەتی گشـتی لەبـەرەی رۆژئـاوا، هـەر لەسـەردەمانێکی زوودا لەبارەگای سەرکردایەتی گشتی رۆژئاوا شتێکی زانراوبـوو، کەسـەرکردەی گشتی بـەم نزیکانـە دەگۆڕێت، چـونکە فـون (ویتـزلبن) جەسـتەی بـەهێز نـەبوو، لەبـەر خراپـی بـاری تەندروسـتییەکەی، بیرۆکەیـەکیش لەفەرمانگـەکانی بـالاّ بـاوبوو، بیرۆکەکـەش ئـەوە بـوو کـە پێویسـتە رێوشـوێنی ئاشـتی بگۆڕێـت بـۆ رێوشـوێنی شـەڕ، ئـەوماوە درێـژەش کەئاگربەستی تیادا ئەنجامدرا کە لـەرۆژی ٢٥ حـوزیرانی سـالّی ١٩٤٠ بـوو تادەگاتە سەرەتای سالّ ١٩٤٢، بەمەش پێی نایە بارودۆخێکی تر لـەژیان کەجیاوازبوو لەگەلّ بارودۆخی بەرەی رۆژهەلاّت.

بێگومـان بـەهۆی زیـادبوونی چـالاّکی هێـزی ئاسمـانی بـەریتانی و کۆماندۆکانی بەریتانی، باری شەڕ دروست ببوو، بەلاّم بەگشـتیش هێشـتا هەر ئاشتی بوو، بەرهەلّستکارە فەڕەنسیەکان دەستیان بەبلاّوبوون کـرد لێـرەو لـەویَ، بـەلاّم ئەمـە سـەرەتایابوو، لەرووسـیاش نـەتوانرا سەرکەوتنێکی خێرا بەدیبێت، وەك چاوەڕوان دەکرا، بەلاّم بەپێچەوانەوە سەرکردایەتیە سەربازی و سیاسیەکان هەستیان بەترسناکی بارودۆخەکـە دەکرد لەرۆژهەلاّتدا و، رووسیەکانیش کۆلّیان نەدا.

هیوای بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی خێراو بەدیهاتنی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتدا هەڵەیەکی گەورەبوو، چونکە هێزی رووسیا زیادی دەکردو ورەی بەرزببووەوە بۆشەڕکردن، لەگەڵ ئەمەشدا داوایانکرد چۆك بەرووسیەکان دابدەن لەساڵی ١٩٤٢. پێویست بوو ئەم داواکاریە جێبەجێ بکرایە بە هەڵمەتی نوێ لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانی لەبەرەی باشووری رۆژئاوا بەئاراستەی (دۆن) و قەفقاس، بەڵام ئایا ئینگلیزەکان دەستەوەستان دەوەستن کاتێك رووسیا لەناو دەبرێت، یان هەڵدەستن بەدابەزاندنی هێزەکانیان لەبەرەی رۆژئاواو هێرش دەکەن لەبەر ئەوەی هاوپەیمانی رووسیایە؟ هەروەها ئایا بەرەی رۆژئاوا ئامادەیە بۆبەرگری کردن لەدژی دابەزاندن و هێرشی بەریتانیەکان.

رەنگە هەر ئەو هۆیانەش بێت وای لە هیتلەرو راوێژکارەکانی کردبێت رۆنشتدی بە تواناو لێهاتوو دابمەزرێنێ بەفەرماندەی گشتی رۆژئاوا، هەروەها هیتلەر لیوا(زیتزلەر)ی دامەزراند بەسەرۆکی دەستەی ئەرکانی فەرماندەی گشتی رۆژئاوا.

لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٤٢ رۆنشتد گەیشتە پاریس، سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی بارودۆخە گشتیەکەی بۆ روونکردەوە، بۆیە لە دەستەی سەرکردایەتی هەستی بەشلەژان کرد! ئەوەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی بەرپرسیارەتی! بۆیە ئەمە وایکرد دەستەی ئەرکان خۆی رێك بخاتەوە، تاوەکو بگونجێت لەگەڵ خودی فەرماندەی گشتی نوێ.

لەو کاتە دا کە رۆنشتد راپۆرتی سەرۆکی هۆبەی گەورەکانی راستەوخۆ بەدەست دەگەیشت لەرێگای تایبەتی خۆیەوەش کاری پێدە کردن، هەروەها وای بەباش دەزانی کەکارەکانی خۆی بەتەنها ئەنجام بداو

سەرۆکی دەستەی ئەرکانیش بەشداری لەگەڵدا بکات، رۆنشتد مرۆڤێکی لەسەرخۆبوو، هەموو بڕیارەکانی بەکورتی و بەتوندی دەردەکرد، حەزی بەگفتوگۆی درێژ نەدەکرد، پێی خۆش بوو سەربەخۆیی تەواو بدات بەسەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی و ئەفسەرەکانی روکن، بەگەیاندنی ئەو فەرمانانەی کە دەریدەکرد: زۆر هەوڵیدەدا بەهیچ جۆرێك دەستبەرداری بیرۆکە گشتییەکانی خۆی نەبێت بەبێ ئەوەی خۆی بێزار بکات بەناوەرۆکی دوورو درێژ.

رۆنشتد سەر بەقوتابخانەی (مۆلتکە-شلیڤن) ی کۆن بوو، ئەم قوتابخانەیە سەربەخۆیی و ئازادی تەواوی دەدا بە دەستەکانی روکن و ئازادی لەکارەکاندا بۆ دابین دەکردن، لەوکاتەی رۆنشتد لەرۆژئاواوە دەستەی ئەرکانەکانی نوێی نەناسراوی دەبینیێ، شتێکی ئاساییە چەند گۆڕانکاریەکی تیادابکات، سەرۆکی دەستەی ئەرکانی نوێ لە بەرەی رۆژهەڵات گەیشت، تائەم کاتەش سەرۆکی دەستەی ئەرکانی سوپای فون(کلیست) ی زرپۆش بوو، هەروەها لەوپەڕی چوست و چالاکیدا بوو. لەوکاتەی موشیر رۆنشتد لەئاداری ساڵی ١٩٤٢ گەیشتە رۆژئاوا خۆی پەردەی لەسەر بۆچوونەکانی یەکەم هەڵماڵی، کە دەتوانرێ بە هەڵوێستێکی بنەڕەتی دادەنرێت بۆلێکۆڵینەوەکان لەوکاتە. لێرەدا خاڵە گرینگەکانی ئەم هەڵوێستە چڕدەکەینەوە کەئەمانەن:

١-شەڕ لەبەرەی رۆژهەڵات لەنێوبەفرو بەستەلەکدا توندبوو، پلەی گەرما بە (٣٥-٤١)پلەی سەدی لەژێر سفردابوو، ئەوەش زیاد دەکەین کە ماندووبوون و مەینەتیەکی زۆر سەبازەکانی هیلاك کردبوو بە هۆی فراوانی بێ کۆتایی خاکی رووسیا، کە ئەمەش لەکۆتاییدا کاریگەری دەروونی بەسەر سەربازی سادەوە بەجێهێشت. کەچی بەرەی رۆژئاوا

هێمنی وئاشتی وخۆشی باڵی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیاندا کێشابوو، هەروەها شوێنی نیشتەجێی چاك بۆ هێزەکان و دەستەی ئەرکانەکان دابین کرابوون، هەروەها جۆرەها خۆشی و شادییان بۆ دابین کرابوو، لەگەڵ ئەمانەش مۆڵەتیشیان زۆربوو. ئێستاش ئەمەریکا بەشداری شەڕ دەکات وەك هاوپەیمانێکی رووسیا و بەریتانیا، واش چاوەڕوان دەکرێت بەم نزیکانە کاریگەری زۆری هەبێت.

٢-لەسەر تیپەکانی ئەڵمانیا لەرۆژئاوا پێویست بوو ئامادەبن بۆجوولەکردن بەرەو رۆژئاوا، بۆیە ئەویٚ بەبەردەوامی پێویسی بەیەکەی نویٚ هەبوو، بەلاٚم چۆن دەتوانریٚ ئەم یەکانە رابهێنرێت لەسەر دۆخی ژیانی پڕ مەینەتی رۆژهەلاٚت،

رۆنشتد چەند فەرمانێکی نوێی جێگری دەرکرد، بە مەبەستی گۆڕینی ئەو بارودۆخەی کە هەبوو، رۆنشتد بەراشکاوی رایگەیاند کە سەرزەنشتی کەرتەکان و دەستەی روکن ناکات، چونکە نەدەتوانرا بە شێوازی سروشتی بارودۆخەکە بۆ بارێکی ناخۆش بگۆڕێت، ئایادەتوانریٚ بە زۆرەملیٚ زستانی رووسیا بگوازرێتەوە بۆ شوێنە دلڕفێنەکانی پاریس و نیس؟

دیمەنی جوان و دلڕفێن لەهەموو لایەك دەوری کەرتەکانی دابوو لەرۆژئاواو نەدەتوانرا بگۆڕدرێنن.

٣- زۆر گرنگە هەندیٚ لەبیروڕاکانی رۆنشتد بخەینەوە یاد دەربارەی سیاسەتی ئەڵمانیا بەرامبەر فەڕەنسا لە وتە تایبەتەکانی خودی خۆی: "ئەگەر مارشاڵ بیتان کاری لەسەر وەستانی شەڕ نەکردبایە لە سالی

١٩٤٠، ئەوا هیتلەر فەڕەنسای بێبەش دەکرد لە سەربەخۆیی و دەیکردە کۆلۆنیەك، بەلاّم بە لایەنی کەم حکوومەتی فەڕەنسا مایەوە".

" بیروڕای من لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی، دەربارەی ئەوەی کە پێی دەڵێن (ئەورووپای نوێ) ئەوە بوو کە شتێکی کردەنی نابێت بەبێ حکوومەتێکی سەربەخۆی فەڕەنسی، لەبەرئەوە هەولّم دا بەهەموو تواناکانم یارمەتی مارشالّ بیتان بدەم کە ئەو پەڕی ڕێزم هەیە بۆی، هەروەها هەولّم دا هیتلەرو ئەوانی تر ناچارکەم کە لەکۆتاییدا رایبگەیەنن کە فەڕەنسا دەگاتە ئەوپلەیەی کە شایانی خۆیەتی پاش وەستانی شەڕ، بەلاّم ئەم هەولاّنەم هەمووی بەبادا چوو، سەرەڕای ئەوەش بەردەوام هەولّم دەدا لەبوارەکانی تر یارمەتی ئەو مارشالّە پیرە بدەم، بۆ نموونە هەولّم دەدا لەکاتی شەڕ کە دەست بکا بەبنیاتنانی هێزێکی فەڕەنسی نوێ، ئەوەی کەپالّی پێوەنام بۆ ئەمە هەست و سۆزم بوو بەرامبەر بەفەڕەنسا، بەلاّم ویستم ئەم هێزانە هەڵستن بە قەدەغەکردنی ئەو چەتانەی کە لە فەڕەنسا دروست دەبن، ئەم چەتانەی کە لەمپەری ترسناك بوون لەپێش هێزەکان لەکاتی هەلگیرسانی شەڕ. هەروەها دەستکردنی ئەم چەتانە بەشەڕ دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە دانیشتوانی فەڕەنسی، من دان دەنێم بەوەی کە هەموو هەولّەکانم بەداخەوە شکستیان خوارد بەهۆی هەندێك هۆ کە لەتوانای من بەدەر بوو، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە کۆمەلّێك ڕاپۆرتی زۆرو بروسکەو پێشنیارو پێشنیاز بکەم لەبەرژەوەندی فەڕەنسا کە پێشکەش بەهیتلەر کرابوون، ئەم بەلّگەنامانەش هەموویان لەلایەن هاوپەیمانانەوە دەستی بەسەرداگیرا پاش هەرەس هێنانی ئەلّمانیا.

ویستی رۆنشتد بەتایبەتی بەرامبەر فەڕەنسا لەهەستییەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئەو هەستەی کە لەخوێنی هەکەنوتییەوە هەڵقولا بوو. وە دەبینین کە رۆنشتد بیری لەکردەوەکان و لەو کارانەی دەکردەوە کە پێی دەکرا سەرەڕای ئەوەی کە ئەو سەربازێك بوو و هیچ پەیوەندییەکیشی بەسیاسەتەوە نەبوو.

٤- هەڵوێستی دەریاوانی ئەڵمانی لە رۆژئاوا لەساڵی ١٩٤٢بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

ئەگەر بەراشکاوی بدوێین کاری سوپا ئەوکات تەنها چاودێری کردنی کەنارەکان و پاسەوانی شوێنە دەریاوانە قەڵغانبەندەکان بوو، هەرشتێك لەدەریا رووبدات بەشەڕی دەریایی دادەنرێت، لێرەدا سوپا هیچ کارێکی نییە تەنها مەگەر دوژمن یەکەکانی خۆی دابەزێنێتە سەر کەنارەکان، بۆیە زۆربەی بەتاریەکانی کەنارەکان ئەوانەی کە لەناو سوپاش دابوون، بەڵام لەژێر دەستەڵاتی کەشتیگەل بوو شوێنەکانیان هەڵە بوو، چونکە بە جوانی نەشاردرابوونەوە بەڵکو ئاشکرا بوون، وەك ئەوەی مەدفەع لەسەر تاوەری پاپۆڕەکان دابنرێن کە هیچ کاریگەریەکی راستەوخۆی لەسەر کەنارەکان نەبێت، هەروەها نەیدەتوانی تۆپەکان جگەلە ئاڕاستەی دەریا زیاتر بهاوێژێ، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەم بەتاریانە نەیدەتوانی هێمنی کەنارەکانیش دەستەبەربکات. لەپێشدا رۆنشتد چەندین جار پێشنیاری راستکردنەوەی ئەم شوێنانەیدا، بەڵام هیتلەر رازی نەبوو ئەمە بکات.

پاش دەستلەکارهەڵگرتنی (براوشتش) لەکۆتاییەکانی ساڵی١٩٤١هیتلەر خۆی بوو بەسەرکردەی گشتی هێزەکانی ئەڵمانیای یەکگرتوو، بەم پێیە هیتلەر بوو بەسەرکردەی سوپاو دەریاوانی و هێزی ئاسمانی، بۆیە لەکاتی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریەکان بڕیارەکانی دژی

خۆی بووە، کەچی هێزی دەریایی و هێزی ئاسمانی هێشتا فەرماندەی گشتی خۆیان هەبوو، ئەم دووانەش بەردەوام لەهیتلەر نزیك بوون، بۆیەش کاریگەریان لەسەر هیتلەر زیاتر بوو وەك لەسوپا کەزۆربەی کات بێبەش بوون لە فەرماندەی گشتی.

رۆنشتد پێی وابوو نزیکبوونەوەی پاپۆڕەکانی دوژمن لەکەنارەکان بەمەبەستی دابەزاندن دەبێتە شەڕی پیادە نەك شەڕێکی دەریایی، ئەم شەڕەش لەگەڵ شەڕی ڕۆژهەلات بەراورد دەکات و دەڵێت:

هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ تانکەکانی رووسیادا نەبوو کاتێك لەدەشتەکان یەکسەر بەرەو مۆلگەکانمان شۆڕدەبوونەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەش هەروەکو باسمانکرد هیتلەر هیچ برپیارێکی تەواوی دەرنەکرد دەربارەی ئەم کێشەیە، جگە لەمە هاوکاریەکی بەهێز لەنێوان سوپاو هەردوو هێزی ئاسمانی و دەریاییدا هەبوو.

لێرەدا پرسیارێکی زیندوو لەگوێچکەماندا دەربارەی هێرشکردن لەکاتی ئێستادا خۆی دووبارە دەکاتەوە و دەبێتە جێگای گرنگیپێدان.

رۆنشتدیش وەلامێکی تایبەتی بۆئەم پرسیارە هەبوو، دەتوانرێ هێرشکردن لەهەر شوێنێکدا رووبدات، بەلام گەورەترین گومان هەبوو کە هێرشکردن بۆسەر کەناری (القنال) ڕووبدات، ڕاستە لێرەدا دابەزاندن دەبێتە هۆی رووبەڕووبوونەوەی دوژمن لەگەڵ مۆلگەکانمان، بەلام دوای سەرکەوتنی دابەزاندنەکان ڕێگا بۆ دوژمن کورت و خێرا دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەبێ ئاستەنگ بەرەو (الراین) ی خواروو و ناوچەی رۆر بچن کە ئامانجی روون و ئاشکرای هاوپەیمانان بوو.

ئەلمانیا لە سالی ١٩٤٢ هێزێکی گەورەی لە بەلجیکا و سنووری دیواری رۆژئاوا لە (الراین) لەوێشدا السین و النورماندی نەبوون، سەرەڕای

ئەوەش هێزی دەریایی پێی وابوو دابەزاندن لەم دووناوچەیەی ناومان بردن گونجاو نییە.

ئامانجی ئەو دابەزاندنەش پاریسە، ئەوەی کۆنترۆڵی پاریسیش بکات ئەوا کۆنترۆڵی هەموو فەڕەنسا دەکات، هەروەها دەتوانێ بەردەوام بێت لە پێشڕەوی کردن لە باڵی لای راستی (تریر) بەتێپەڕبوون بە (ئاخن) لە هەردوولادا بەئاراستەی ناوچەی (رۆر) بۆ ئەڵمانیای باکوور، لەم کاتەدا دەتوانین هەر قەلغانێکی کەناری ئەڵمانی لابدەین کە تاکوو ئێستا بەبێ دەنگی لە پشتەوەی (القنال) بەئاسانی ماوەتەوە، هەروەها دەتوانین بەم رێگایە بنکەکانی (چەکی سەرکەوتن) لەناوبەرین کە خەریك بوو دروست دەکرا.

هیتلەر بڕوای هێنابوو بە سوودە یەکلایی کەرەوەکەی قەڵابەندی هەمیشەیی کە لە ئاسن و چەمنتۆ دروستکرابوون، بۆیە زۆر دڵخۆش بوو بەدروستکردنی دیواری رۆژئاوا لەسەر سنووری ئەڵمانیا.

لەساڵی ١٩٤٢ دڵەڕاوکێی هیتلەر بەرامبەر رۆژئاوا دەستیپێکرد، دوای ئەوەی نەتوانرا دەست بەسەر رووسیادا بگرێت، لەبەر ئەوە بە چالاکیەکی بەگوڕو زۆرەوە هەوڵیدا بۆ دروستکردنی

(دیواری ئەتلەسی) کە نەخشەی بنەڕەتی و ئامادەکاری بۆ کێشرابوو بۆ بەرگریکردنی لەکەنارە بەهێزەکان لە هۆڵەندە و جەزیرەی (تسل) تاکوو (ئەنتویرب)، هەروەها لە قەڵابەندیەکانی ئۆستند درێژ دەبێتەوە بەتێپەڕبوونی بە (کالیە) و (بۆلون) و (دییب) و (هاڤر). هەروەها بڕیاردرا گرنگیەکی تایبەتی بە کەرتی (ئۆستند – کالیە– بیفیل) بدرێت، لێرەدا شەڕەکە تەنگی بە دوژمن هەڵچنی و ئینگلتەرەش لە نزیکەوە بوو. بۆیە

ئـەم كەرتــە بـەبیروڕای هیتلـەر لـە لایـەنی دابـەزینی هێـزەوە لەچـاو کەرتەکانی تر لە هەموویان مەترسیدارتر بوو.

لەسـالّی ١٩٤٢فـەرمان دەرچـوو بـۆ ئـەوەی دەسـتبکرێت بەچـاککردن و توونـدکردنی مۆلّگـەکان کـە ئەنجامـدانی کارەکـەش تـاکو هـاتنی پـاییز بەهێواشی بەڕێوە دەڕۆیشت، بۆ ئەمەش کۆنگرەیەکیان لە بەرلین بەست کـە ئەفسـەرەکانی ئـەرکان و ئەفسـەرەکانی ئەنـدازە و ئەنـدازیارەکانی ڕێکخـراوی تـود بەشـداریان تێـداکرد، ئـەم ڕێکخـراوەش پێکهـاتبوو لـە هاوولاّتی سڤیلی هونەریی کە ئەندازیاری (تـود) ڕێکیخسـتبوون، هـەروەها بریتیبوو لە دەزگایەك بۆ جێبەجێکردنی بەلّێندەرایەتیەکی گەورە.

کەسەکانیش جل و بەرگی تایبەتی خۆیـان هـەبوو وەك سـەرجەم دەزگـا مەدەنیەکانی تر. وانەبێت هیتلەر زۆر باوەڕی بە بەشـی ئەنـدازەی سـوپا هەبێت، ئەو لەو باوەڕەدابوو کە ئەندازیارەکانی سەربازی زۆر بەهێواشـی و زیاد لە پێویست بە بەوردی کاردەکەن. بۆیـە بـۆ دروسـتکردنی دیـواری ئەتلەسی ڕێکخراوی تودی راسپارد بۆ ئەم کارە.

هەروەها ڕێگاشـیدا بەسـەرکردەی گشـتی سـوپا و ئـەو سـەربازانەی کـە لەسـەر کـەنارەکان بـوو بـۆ دیـاریکردنی مۆلّگـەکان و هێلـەکان لـەرووی تەیارکردنەوە، بەلاّم بۆیان نەبوو لەڕووی هونەریـەوە هـیچ شـتێك بلـّێن. هێزەکانی دەریایی بەپلە یەك و هێزی ئاسمـانیش بـە پلـە دوو بۆچـوونی جیاوازیان هەبوو. هەر بۆیەش ئەم جیاوازیانـە بوونـە هـۆی ئـەوەی سـزاو ئەشـکەنجەیەکی زۆر دەوری ئـەو یەکانـەی سـوپا بگرێـت کـە لەسـەر کەنارەکان بوون، لە دواییدا قسە لەسەر هەندێك لە دیواری ئەتلەسی لە سالّی ١٩٤٣ و ١٩٤٤ دەکەم.

ناتوانین لە کارەکانی رۆنشتد لەرۆژئاوا لە ساڵی ١٩٤٢ بگەین بەبێ ئەوەی ئەو بنەمایانە بزانین کە کارەکانی رۆنشتدی لەسەر بنیات نرابوون، چونکە لە رۆژئاوا ژمارەیەك لەسەرکردە هەبوون کە هەریەکەو لەشوێنی خۆیەوە بەتەنها کاری دەکرد، لەبەر نەبوونی رێنمایی تایبەتی هیتلەر بۆیان، کە بەمجۆرەی خوارەوە بوو:

أ-سەرکردەی گشتی رۆژئاوا (فۆن رۆنشتد).

ب-سەرکردەی گشتی کەشتیگەلی ئاسمانی سێ (سبێرل).

ج-سەرکردەی گشتی پێکهاتەکانی دەریایی رۆژئاوا (کرانکل).

د-سەرکردەی سەربازی لە فەرەنسا (فۆن ستول بناگل).

ه- سەرکردەی سەربازی لە بەلجیکاو باکووری فەرەنسا (فۆن فۆلکنهاوسن).

سەرەرای ئەمانەش لەوێدا دەسەلاتی تر هەبوو کە ئەوانیش: دەسەلاتی رێکخراوی مەدەنی (تود) و، باڵیۆزخانەی ئەلمانیا لە پاریس و، حکومەتی فەرەنسی لە (فیشی). کۆی هەموو ئەمانەش تێکەڵ و پێکەڵیەکی گەورەی لە جۆرەکانی دەسەلات دروست کردبوو. بۆیە بۆ هەماهەنگی کارەکانی گشت بارەگاکان بەمەبەستی بەرگری کردن، لە بەهاری ساڵی ١٩٤٢ هیتلەر کە گەیشتە لای رۆنشتد رێنماییەکانی فوهرەری ژمارە (٤٠)ی دەرکرد، بۆ دیاریکردنی دەسەلاتە فەرمیەکان، بەلام مەبەستەکانی نەهاتەدی لە جێبەجێ کردنی رێنماییەکان بەتەواوی ، ئەی هۆکار چی بوو؟

أ-نەریتی دکتاتۆرەکان هەرگیز دەسەلاتی فراوان بە یەك پیاو نابەخشن، لەمەش مەبەستێکی خۆیان هەیە: وەك (فرق تسد) (پەرتکەو زاڵبە).

بۆیـه نـاوەڕۆکی ئـەم ڕێنماییانـە هـەر کەسـێکی دووردەخسـتەوە لـە دەسەڵاتی تەواو لە ڕۆژئاوادا، هەروەها پەیوەندیش لەنێوان سەرکردەکان دیاریکرا بەرستە و دەستەواژەی ئاڵۆز، بۆیە ئەرکەکانی سەرکردایەتی باڵا زۆر گران بوو.

ب- لە ساڵی ١٩٤٢ هیتلەر بوو بە سەرکردەی گشتی سوپا، (کورنك) یش بووە سەرکردەی گشتی هێزی ئاسمانی و (ریدەر)یـش سـەرکردەی گشـتی هێزی دەریـاوانی، کـە لەدواییـدا (دۆنـتس) شـوێنی گرتـەوە، ئـەم هـەموو سەرکردانەش هەموو کاتێك لـە پەیوەنـدی تونـد دابـوون بـە هیتلـەرەوە، بۆیە لـە تواناياندا هـەبوو تـەعبیر لـە سیاسـەت و داواکاریـەکانی خۆیـان بکەن بە پلەیەکی کاریگەرتر لە سوپا، چـونکە هیتلـەر خـۆی سـەرکردەی گشتی سەربازی بوو!

دەقـی ڕێنماییـەکانی بـەرگریکردن ژمـارە (٤٠) فـوهرەر بـەمجۆرەی خوارەوە بوو:

١-ڕۆنشـتد سـەرکردەی گشـتی لـە ڕۆژئـاوا، خـاوەنی تـەنها دەسـەڵاتی تـەیارکردن و سـتراتیژی دەبێـت. ئەرکەکانیشـی: بەرگریکردنـە دژی داگیرکردنی کەنارەکان، هەروەها لەدەسەڵاتیدا نییە فەرمان دەربکات بـۆ هێزەکانی دەریایی و هێزی ئاسمانی، تەنیا مەگـەر لـەژێر ئـەو دەسـەڵاتە تەسکەدا نەبێت. هەربۆیە هیچ مەڵبەندێك نییە کە هاوشـێوەی مەڵبەنـدی ئایزنهاوەر بێـت، لەبـەر ئـەوەی یـەکێك بـوو لـەو سـەرکردانەی کـە لـەنێو هاورێکانیدا لە ڕۆژئاوا لە دەسەڵاتەکانیان یەکسان بن.

٢-(سێبرل) کە سـەرکردەی گشـتی کەشـتیگەلی ئاسمـانی سـێ بـوو، کـە سەربەخۆییەکی تەواوی هەبوو، کە لەشـوێنی خۆیـدا دەسـەڵاتی بەرامبـەر

دەسەڵاتی ڕۆنشتدبوو، ئەرکی تەنها جێبەجێ کردنی فەرمانە ستراتیژیەکان بوو، بۆ بەرگری کردن لەکەنار، کەچی شەڕەکانی ئاسمانی لە دژی بەریتانیاو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دەریای ئەتلەسی و دەریای سپی ناوەڕاست ئەمەشیان مەسەلەیەکی تایبەتە بەهێزی ئاسمانی، کە ڕۆنشتدیش نەیدەتوانی هیچ فەرمانێك لەبارەی هێزی ئاسمانیەوە دەربکات.

٣-پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی هێزی دەریایی ڕۆژئاوا هاوشێوەی پەیوەندیەکانی بوو لەگەڵ هێزی ئاسمانیدا بە تەواوای، لەوەش زیاتر وا دادەنرا کە سەرکردەی گشتی لەشوێنی خۆیدا یەکسانە بە شوێنی سەرکردەی سەربازی و سەرکردەی هێزی ئاسمانی.

هەروەها لە توانای سەرکردەی گشتی ڕۆژئاوادا نەبوو فەرمان دەربکات، تەنها ئەو فەرمانانە نەبێت کە پەیوەندیان بە بەرگریکردنی کەنارەکانەوە هەبوو، چونکە هێزەکانی دەریایی دەیانتوانی فەرمان لەبەندەرەکان دەربکەن نەك سوپا، چونکە سەرکردەی دەریایەکان بەهەموو جۆرە هۆبەکانی بەندەرەکان لەژێر فەرمانی سوپادابوو لە کاتێکدا ئەگەر پێویستی بە بەرگریکردن بوایە لە کەنارەکان. هەروەها هێزی دەریایی و بەتاریەکان تایبەت بەکەنار کە ئەرکەکانی تۆپ هاویشتن بوو بە شێوەیەکی هونەری و جێببەجێ کردنی داگیرکردنی مۆڵگەکان بوو کە لەسەر شێوازی تۆپەکانی دەریا کە جیاواز بوو لەشێوازی تۆپەکانی سوپا.

تۆپەکانی دەریایی یان تۆپەکانی کەنار هەموو کات نیشانەن بۆ بۆردوومانکردنی لایەن تۆپەکان و باریجەکانی دوژمن. هەروەها ئەرکی

تۆپەکانی کەناریش بۆردمانکردنی باریجەکانی دوژمن بوو بە شێوەی ڕاستەوخۆ، بەڵام تۆپەکانی کەنار کە بۆ پارێزگاریکردن بوون لەسەر کەنارەکان بۆیە بەئاسانی دەتوانرا بەخێرایی لە ئاسمان و دەریاوە بۆ دەنگ بکرێت، بۆیە داوایکرد کە مۆڵگەکانی بە ئاسن و چەمەنتۆ چاکبکرێن.

ئەنجامی ئەمەش دروستکردنی مۆڵگەی گەورەبوو لە سەرووی (کریس — یەنن) کە بتوانێ بەرگەی هەموو جۆرە بۆردومانێك بگرێت.

بەڵام سوپا ڕێگایەکی تری هەبوو کە دەیتوانی لەشەڕی وشکانی دا بەکاربهێنێ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتارییەی تۆپەکان لەسەر یەك هێل نەبوون و یەکێك نزیکی ئەوی تربوو: بەڵکوچی پێشەوەو پشتەوەی بەقوولایی لەگەڵ زەوی دا گونجاو نەبوون، هەروەها لوولەی ئاگرەکانیان بە تێکەڵاوی بەکادەهێنا، هەروەها بەتارییەکانی سوپا بەشێوەیەك لە مۆڵگەکانیاندا دابندرێن کە بتوانن لەکاتی دابەزینی دوژمن لەسەر لێواری کەنارەکان و بەرەی دەریایی پێشەوە بەکاریان بهێنێ کە لەمبەرامبەریان بوو ماوەکەی دوورنەبوو، ئەمەش لەتوانایی بەتاریەکاندا هەبوو یان نەبوو بۆ پلەیەکی دیاریکراو دەربارەی بەتاریەکانی قورسی دەریایی، کەواتە ئەمەش لەتوانای ئەو بەتاریانەدا نەبوو تەنها بۆ بۆردومانکردنی ماوەی ناوەندو دوورەکان، هەموو ئەمانە بە ڕوون و ئاشکرا هۆکاربوون لە جیاوازی بیرو بۆچوونەکان لەنێوان سوپاو هێزەکانی دەریایی.

هێزەکانی دەریایی داوایانکرد کە باڵا دەست بن بەسەر ئەو بەتاریانەی کە سەر بە سوپا بوون، بەڵام سوپا دەیویست وەکو خۆی بمێنێتەوەو هیچ شتێکی نەکرد، لە ئەنجامیشدا سێ جۆرە تۆپ لەسەر کەنارەکان هەبوو:

بەتاریەی کەناری دەریا لە مۆڵگەکانی ئاسن و چەمەنتۆ دا دەبێت، بەیەتەریەکانی سوپا کە لەژێر فەرمانی هێزەکانی دەریادابوو لەگەڵ بەشێك لەوان لە مۆڵگەکانی شەڕدابوون، لە کۆتایی بەتاری سوپاکە مایەوە لەژێرفەرمانی سوپا دایە تەنها هەندێك لەوان لەناو مۆڵگەکانی چیمەنتۆو ئاسندا بێت.

هەروەها خاڵەکانی پشتگیریکردنی (ژێرئاویەکان) پێویستی بەچاککردنێکی بەهێز هەیە کە لەچیمەنتۆ دروست بکرێت بە ئەستووری دە یاخود پانزە تاکو ٣٠ مەتر بێت.

هەروەها پێویست بوو دەروی هەموو مۆڵگەی هێزەکانی دەریایی و هێزی ئاسمانی بە دارو پارچە چیمەنتۆ چاکبکرێن. بۆیە خەریك هیچ مادەیەك نەمێنێتەوە بۆ بەهێزکردنی مۆڵگەکانی پیادە.

٤-هەریەکێك لەو دوو سەرکردە سەربازیەی پاریس و برۆکسل شوێنێکی بەرزیان هەبوو، کە هەردووکیان دوو دادەوەری سەربازی بوون و دوو دەسەلاتداری ناوەخۆ بوون.

ئەرکەکانی ئەم دوو سەرکردەیە کاروباری بەڕێوەبردن بوو لەو ناوچانەی داگیر کرابوون لەگەڵ پەیوەندی کردن بە حکوومەتی فەڕەنسا یان لەگەڵ بەرپرسان لە ئاسایشی ناوەخۆو رێکخستنی پۆلیس و هەموو کاروباری سیاسی، هەروەها ئەوان لەبەرەی رۆژئاوا ملکەچی فەرمانەکانی فەرماندەی گشتی نەبوون لە رۆژئاوا، بەڵکو هەردووکیان راستەوخۆ سەر بەبارەگای سوپا ( هیتلەر) بوون. لەهەمان کاتیشدا فەرمانیان لەبەرێوەبەری میرەی سوپاو جێگرەکانی هیتلەر وەردەگرت، زۆر جاریش راستەوخۆ فەرمانیان لە هیتلەرەوە وەردەگرت، لە پێناوی خزمتکردنی

پۆلیس کە لەژێر فەرمانی ئەواندا بوون، ئەم فەرمانانەش سەرکردەی گشتی هیچی لەبارەیانەوە نەدەزانی.

بۆیە رۆنشتد نەیدەتوانی فەرمان بدات بەسەر ئەم دوو سەرکردەیە، تەنها ئەو فەرمانانە نەبێت کە پەیوەندی بە بەرگریکردنی ستراتیژی هەبوو لە کەنارەکان لە دژی داگیرکەران.

پێکهاتەکانی ئەم دووسەرکردەیە تایبەت بوون، دووبارە ئەم پێکهاتانەی لە بەرپرسی ناوچەکانی و جێگرەکانیان و لە پۆلیسەکانی تایبەتی و یەکەکانی ئاسایشی تایبەت و پێکهاتبوون، لەم پێکهاتانەش بە دەربوو لە سنووری دەسەڵاتداریەتی سەرکردەی گشتی لە بەرەی رۆژئاوا.
٥- هەروەها کەناری هۆڵەنداش لەژێر فەرماندەیی رۆنشتد دابوو، واتە خۆی بەرپرسی کارە ستراتیژیەکانی بوو. لەو جۆرە دۆخەدا جۆرە یاسایەك جێبەجێ دەکرێت کە جیاوازە لەوەی پێشوو، هیچ سەرکردەیەکی سەربازی لەهۆڵەندە نەبوو هەروەکو لە فەرەنساو بەلجیکا هەبوو، بەڵام لەوێدا جێگری رایخ هەبوو کە فەرمانەکانی راستەوخۆ لە هیتلەر وەردەگرت، هەروەها سەرکردەیەکی ئەڵمانیش لە زەویە نزمەکاندا هەبوو بە ناوی لیوای فرۆکەوان (کریستیان سن) کە هەموو کەرتەکانی وەکو هێزەکانی سوپاو دەریاوانی و هێزی ئاسمانی لەژێر فەرماندەیی ئەودابوون، ئەم سەرکردە سەر بە بارەگای گشتی سوپای ئەڵمانیا بوو، بەڵام سەرکردایەتی رۆژئاوا تەنها سەبارەت بە بەرگری کردن لە کەنارەکان سەر بە هەمان بارەگا بوو.
٦- هەروەها باڵوێزخانەی ئەڵمانیاو رێکخراوی تود بەرپرس بوون لە دروستکردنی مۆڵگەی کەنارەکان، هەروەها زۆر لەو هێزانەی تر کە لە ژێر فەرمانی رایخی باڵا دەست دابوون بێ ئەوەی ببەسترێنەوە بە رۆنشتد.

٧- هەروەها فەیلەقی زرێپۆشی بروسك فەرمانەکانی لەسەرکردەی گشتی لە رۆژئاوا وەردەگرت کە پەیوەندیان بە بەکارهێنان و ئامادەکردن هەبوو بەس، کەچی لە زۆر بواری تردا سەربەخۆ بوو، هەروەکو سەربەخۆیی کەرتەکانی پێشوو کە باسمان لێوەکرد.

٨- خراپترین دیاردەی ئەو دابەشکردنەی دەسەڵاتیش لە رۆژئاوا ئەوە بوو کە سەرکردایەتی گشتی رۆژئاوا ئەو تاکە دەسەڵاتە بوو کە بەرپرس بوو لە بەرگری کردن لە کەنارەکان، بەڵام دەسەڵاتێکی یاسایی نەبوو، بەڵکو پاشکۆیەك بوو لە دەستەی ئەرکان، بەڵام بەبێ دادگابوو. کەچی دەسەڵاتی قەزا تەنها لەنێو تیپەکان و فەیلەقەکان گەمارۆدرابوو، سوپا تواناو دەسەڵاتی دادگای باڵای بەرامبەر تیپ و فەیلەقەکانی هەبوو، کەچی پێکهاتەکانی سوپاو سەرکردایەتی گشتی رۆژئاوا دەسەڵاتی دادگایی نەبوو، هەروەها سەرکردە گشتیەکان لە پێکهاتەکانی سوپاو سەرکردایەتی گشتی رۆژئاوا سیفەتی قەزایان لێسەندرابۆوە، کاتێك زەروورەرت قسە دەکات لە وەرگرتنی رێوشوێنی ئینزیباتی لەو سوپایەی کە لە ژێر فەرمانی ئەودایە، ئەوا سەرکردایەتی رۆژئاوا بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی نییە بەسەر ئەو بابەتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە مەسەلەکە پەیوەندی بە سەرکردە کاراکانی سوپاوە هەیە، هەروەها رۆنشتد هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو بەسەر هێزی دەریاوانی و هێزی ئاسمانی و هێزە بروسك ئاساکان و هێزەکانی ئاسایشی سەر بە فەرماندە سەربازیەکان یاخود سەربە فەرماندەی گشتی سوپای ئەڵمانی لە هۆڵەندا، چونکە گشت ئەم هێزانە کە سەر بە پێکهاتەکانی سوپای ئەڵمانیان دەسەڵاتی قەزایی تایبەت بە خۆیان هەیە.

ئەمەش نموونەیەکی سەیرە لەم بارەیەوە: ئەگەر پێویست بوو لێکۆڵینەوەی ئینزبیاتی لە دەستەی ئەرکانی ڕۆنشتد خوێدا بکرێت، ئەوا ئەم جۆرە دادگاییکردنە تایبەتە بە دادگایەك کە لە دەرەوەی دەسەلاتی ڕۆنشتدە، ڕەنگە کارەکە وا پێویست بکات کە ڕەوانە بکرێت بۆ لای یەکێك لە سەرکردە سەربازییەکان، بۆیە ڕۆنشتد نەیدەتوانی دەسەلاتی ئینزبیاتی خۆی هەتا بەسەر دەستەی روکنی خۆشی جێبەجێ بکات.

ڕێنماییەکانی هیتلەری ژمارە ٤٠ هیچ کەسێك پێی رازی نەبوو، هەروەکو هەموو لایەك کەموکورتیەکانی دەزانی، بەلام تێکۆشانی هەموو سەرکردەکان لە دژی ڕوودان و مەترسیەکانی شەڕ بوو، هەمووشیان بە یەك دەست بۆ ئەم مەبەستە هەوڵیاندا، سەرەڕای ئەوەی هەندێك جار بۆچوونی جیاواز لەنێوانیاندا بەدی دەکرا، ئەمەش کە هەموو لایەك درکی پێ دەکەن چاکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆنشتد کە کاری دەکرد بۆ نەهێشتنی ئەم ناکۆکی و بۆچوونە جیاوازانە. لەوانەیە ئەم کارە بە هیچ سەرکردەیەکی تر نەکرابا، کەسەرەڕای بوونی بارودۆخی سەیرو دژوار کەچی ڕۆنشتد توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێ، هەروەها ئەمە روون دەبێتەوە کە چەندە بێزاری و ئاستەنگ رووی لە سەرکردایەتی گشتی ستراتیژی ڕۆژئاوا کردبوو لەو کاتدا.لەگەڵ ماوەی ئاسنگەکان و بێزاربوونە گەورەکان لە سەرکردایەتی گشتی سەربازی ئەو کاتەی ڕۆژئاوا. بە بەردەوامی دەمارەکان گرژبوون و دڵەڕاوکێ رووی تێکردبوون،لەوەش زیاتر دەسەلاتێکی زۆر هەبوو لە یەك جۆر، لەگەڵ بوونی دەسەلاتی تر کە فەرمانیان ڕاستەوخۆ لە ڕایخ وەردەگرت، زۆر جاریش دەسەلاتە دیاریکراوەکەی ڕۆنشتد فەرامۆش دەکراو، ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە هیتلەرەوە دەکرد.

کەرتی ڕۆنشتدی بەرگریکردن، هێڵی کەنارەکانی خوارەوە دەگرێتەوە: دورگەی تیسل (باکووری هیلدەر) فلوشنك ، ئوستەند، کالیە، بولون، دییب، هاڤەر، شاربۆرغ، سنت لو، بریست، لورنیت، لاروشیل، سنووری ئیسپانیا، ئەو کاتەی ڕۆنشتد لە ساڵی ١٩٤٢ گەیشتە ڕۆژئاوا، دەریای سپی ناوەڕاست نەکەوتبووە ناو هێڵی بەرگریکردنی ئەڵمانیا، بەڵکو هەر لەگەڵ ناوچەی حکوومەتی فەرنسیدا بوو لە فیشی، هێڵی بەرگریکردن لە دەریای باکوورو حەوزی دۆڤەر و ئەتلەسی لە ساڵی ١٩٤٢ بەم شێوەیە دابەشکرابوو:

ا-سەرکردایەتی گشتی سوپای ئەڵمانی لە هۆڵەندە، بە هێزەکانی سوپاو دەریاوانی و هێزی ئاسمانی بەرگری دەکات لە کەناری هۆڵەندە، هەر لە دورگەی تیسل (ناوەوە) بگرە تاکوو دەگاتە نزیك (فلوشنك) هەروەها لەباکووری ئەڵمانیا بەرگریەکانی کەشتیگەلی ئەڵمانیا لە (ولهلمسهافن) لە نزیك کەناری دەریای باکووربوو.

ب- بۆ ڕۆژئاواش، سوپای پانزدەهەم یەکەمین سوپابوو کە لە نزیك (زیبروك) و درێژدەبۆوە بەرەو باشووری هاڤەر، ئەم سوپایە بەرگری لە ڕێژگەی (سین) دەکرد، سوپای پانزدەهەم بەهێزترین سوپابوو، چونکە بەزۆری واچاوەڕوان دەکرا کە شەڕەکان لە نێوان (ئەوستەند) و ( هاڤەر) روو‌بدەن.

ج- هێزی حەوتەم لە دەوروبەری ناوچەی (کان) تاکوو ڕێژگەی لوار (ناوەوە) بە سوپای پانزدەهەم دەگەیشتنەوە، بۆیە ناوچەی نیمچە دورگە گرنگەکانی: (کوننتن) و (بریتانی) دەکەوتنە ئەوێوە.

-هەروەها سوپای لاوازی یەکەم لەباشووری نزیك (لاروش) بۆ سنووری ئەسپانیا بە سوپای حەوتەم دەگەیشتەوە.

هێزەکانی ئەم چوار سوپایەش لەژێر فەرماندەیی رۆنشتددا بوون، بەلام سەرکردەی سوپای ئەلمانی لە هۆلەندە سەری شۆڕ نەدەکرد بۆ فەرمانەکانی رۆنشتد، تەنها ئەوە نەبێت کە تایبەت بوو بە بەرگری کردن لە کەنارەکان.

بارەگای کەشتیگەلی ئاسمانی سێیەم لە کۆشکی (لۆکسمبۆرغ) لە پاریس بوو، پێکهاتەکانیشی دابەشکرابوون لەسەر فەڕەنسای داگیرکراو و بەلجیکاو هۆلەندە.

هەروەها بارەگای پێکهاتەی دەریاییش لە پاریس بوو، کە سوپایەکی بێ هێز بوو، هەروەها پێکهاتبوو لە تێکدەرەکان و هەلگرەوەی ئەلغام و بەلەمە هەلمیەکان کە لە بەندەرە جیاجیاکاندا پەرت و بلاوبوون.

کە بەشێوەیەکی تایبەتی چاودێری کردنی ئەو (ژێر ئاوانەیان) دەکرد کە لە نزیکەوەبوون و لە ئەرکەکانیان دەگەڕانەوەو، لە مۆلگەکانی کە لە چەمەنتۆ دروستکرابوون لە (لوریانت) و (سنت نازیر) و بەندەرەکانی تردا ئۆقرەیان دەگرت.

تا ئەو کاتە رۆژئاوا بەهێمنی مابۆوە کەچی رۆژهەلات بە بەردەوامی شەڕی دژواری تێدا بوو، تیپەکانی سوپاش بەشێوەیەکی گشتی لەو پێکهاتانە پێکدەهات کە لە نێو شەڕی رۆژهەلاتدا لاواز ببوون و گوازرابوونەوە بۆ رۆژئاوا تاسەر لەنوێ رێکبخرێنەوە، هەروەها لە یەکە بێ هێزەکانی تریش، بەمجۆرە تیپەکان لەنێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا لە ئالوگۆڕیدا بەردەوامدا بوون، بەتایبەتی تیپی زرێپۆشەکان، هەموو ئەم

ئاڵوگۆڕکردنـــه وایکـــرد کـــه دروســـت کردنـــی مۆڵگـــەکانی کـــەنار و بەرگریکردنـەکان زەحمـەت و نـاخۆش بێـت، بەشـێوەیەك وای لێهـاتبوو نزیکەی هەر دوو هەفتەی جارێك ئـاڵوگۆڕ دەکـران، کـە بـەم پێیـە دەبـوو کەرت و لقی نـوێ دروسـت بکـرێن، بـەبێ ئـەوەی بـوار بڕەخسـێت پلانـی هەمیشەیی بۆ بەرگریکردن دابنرێت، هەروەها نەتوانرا ئـەم بارودۆخـە لـە ساڵی ١٩٤٢ بگۆڕدرێن، چونکە ئەو کاتە وادەدانـرا رۆژئـاوا گۆڕەپـانێکی لاوەکـی شـەڕ بێـت لـە گۆڕەپانـەکانی شـەڕو، رۆژهـەڵاتیش پێویسـتی بەهەموو ئەو هێزانە هەبوو.

خوێنەری ئەمڕۆ ئارەزوو دەکات باسـی رووداوەکـانی رۆژ لـەدوای رۆژ بـۆ بکرێت کە لەو ماوەیەدا روویاندا، بۆیە هەندێك رووداوە دیارەکانتـان لـەو ساڵە بۆ باس دەکەم.

یەکێك لەو نموونانە هێرشکردن بوو بۆ سەر (دییب) کـە زۆر مشـت و مـڕو باسکردنی لێوەکرا، ئەو هێرشـکردنە هێرشـێکی تـەواو کتوپڕبـوو، کـە لـە شەوی ١٨/١٩ ئـاب روویـدا، کـاروانێکی دەریـایی ئـەڵمانیا هاقـەر بـەجێ دەهێڵێت و دەریا دەبڕێ بەرەو تەوەری کەنارو لەدواییدا بەرەو بـاکووری رۆژهەڵات، نزیکەی کاتژمێر پێنجی بـەیانی ئـەم کاروانـە دەگاتـە (دییـب) دەنگی بۆردوومان لە دەریاکردن بەرز دەبێتەوە لـەرۆژئاوای (دییـب) ئـەم دەنگانـە تـۆپ هاوێـژەکان کـەنار ئاگـادار دەکاتـەوەو، ئامـادە دەبـن بـۆ کارکردن، کەشتیگەلی بەریتانی کە لە رۆژئـاواوە دێـت لەگـەڵ کـاروانێکی ئەڵمانیا ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، کەواتـە بەریتانیـەکان کتـوپڕ هێـرش دەکەنـە سـەر کەشـتیگەلی ئـەڵمانی و بـە تـەواوی کـە شـتگەل لێـك جیادەبنـەوە، بـەڵام زۆربـەیان بەسـەلامەتی دەگەنـە بەنـدەری کـەناری رۆژئاوای فەرەنسا.

ئەمەش بەختێکی باشی ئەڵمانیا بوو کە کەشتیگەلەکانیان لە ڕۆژئاوای (دییب)بوو لە کاتێکی دیارییکراوی تەواو، ئەمەش زیانی بۆ هەوڵەکانی دوژمن هەبوو، ئاگادارکردنەوەش بوو بۆ بەرگریەکانی ئەڵمانیا.

ڕاپۆرتی یەکەم لەسەر ئەم هێرشە لە سوپای پانزدەهەمەوە دوای کاتژمێرێك گەیشتە بارەگای ڕۆنشتد ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەش بەمجۆرە بوو:

دوژمن هەوڵ دەدا لە نزیك (دییب) دابەزێ، دوژمن لەم دابەزینە سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی کە تاکو ئێستا گەیشتۆتە دەستمان.

فەریق (زمرمان) یەکسەر ئینزاری ڕاگەیاند بۆ هەموو یەکەکان، هەروەها لیوا (زیتزلر)ی سەرۆکی دەستەی ئەرکان ڕۆنشتدی ئاگادارکردەوەو، بەخێرایی فەرمانەکان بڵاوکرانەوەو، ڕاپۆرتیش بەرزکرایەوە بۆ بارەگای سوپای ئەڵمانیا، هەروەها زانیاری بۆ کەشتیگەلی ئاسمانی سێیەم و پێکهاتەی سوپای دەریایی ڕۆژئاوا نێردرا، جگە لە ئاگادارکردنەوەی هەردوو سەرکردەی پاریس و برۆکسل، هەموو سوپاکانیش کە لەنزیکەوە بوون ئاگادارکرانەوە، چونکە ڕۆنشتد زانیاری نەبوو لەسەر ئەوەی کە ئاخۆ دابەزینی دیکە لەشوێنی تردا دەبێت یان نا.

بەریتانیەکان لە بەرەیەکدا دابەزین کە ماوەکەی لەنێوان ١٠ تاکو ١٢ میل دەبوو، تیپێکی پیادەی ئەڵمانی ژمارە ٣٠٢ لەوێدا هەبوو و شەڕێکی ئازایانەی لەگەڵیان کرد، بەڵام ئەو تیپە بەچەکی نوێ پڕچەك نەکرابوو، چونکە تیپێکی کەناربوو و توانایەکی باشی نەبوو.

هەردوو کەشتیگەلی ئاسمانی سێیەم و پێکهاتەی سوپای دەریایی زۆر بەپەلە دەستیانکرد بە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی رێژەی هێزی دوژمن، یاخود نەوەك جوولەی تری دوژمن لە ئینگلتەرای باشووردا هەبێت.

رۆنشتد هەموو کاتێك دژی ئەوەبوو کە لەشوێنی خۆتەوە بەرگری بکەیت، فەرمانێکی بە پەلەی دەرکردو ئاگاداری هەموو یەدەگەکانی کردەوە کە هەبوون بۆ ئەوەی هێرش بکەن بۆ دەرپەڕاندنی دوژمن لە دەریا بەپەلە، تیپی زرێپۆشی ۱۰ لەئامادەباشیدا بوو لە نزیك (ئەمیانس) و تیپی زرێپۆشی یەك لە ناوچەی (روان) بوو جگە لە هێزێکی گەورە لەگەڵ یەدەگەکانی ناوخۆ.

تیپی زرێپۆشی یەك کە لەنزیك (روان) بوو کە ئەویش ئامادەبوو بۆ چوونە پێشەوە. هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا کەشتیگەلەکانی دوژمنی بۆردومانکرد، کەشتیگەلی ئەڵمانیش هەموو پێداویستیەکانی خۆی ئامادە کردبوو و ئەویش کەوتە نێو شەڕێکی توند.

لەکاتژمێر نۆی سەرلەبەیانی دەرکەوت کە هێرشی سەرەکی ئامانجەکەی (دییب)ە، کەچی هێرشی لاوەکی بەرەو باشووری رۆژئاوابوو.

بەیانی ۱۹ ئاب رۆنشتد وا شەڕەکەی مەزندەکرد کە دوژمن هێرشێکی بەرفراوانی کردووە، بەڵام دابەزینێکی گەورەی نەکردوە، ئەوەی بە لای ئێمەوەش باش بوو، ئەوە بوو کە هێزی ئاسمانی بەریتانیا هەڵنەستاوە بەهێرشی خەست.

کاتێك کە رۆژ داهات هەڵوێستەکان زیاتر بۆمان روون بووەوە، هێرشی پیادەی بەریتانی لە وشکانی ڕاوەستاو هەندێك لە تانکەکانی تێکوپێك

شـكان و تائێسـتاش لـەناو دەريـان، هێـزە يەدەگەكانيشـمان گەيشـتنە بەردەم (دييب).

دوژمــن زەرەرو زيـانێكی زۆری لێكـەوت، تــوانرا هێزەكـانی كەنــەدی بەشێوەيەكی سەرەكی جيابكرێنەوە، بەڵام نەتوانرا ژێرئاوەكان(غەواسـە) لەشەڕەكەدا بەكاربهێنرێن، چونكە قووڵايی ئاوەكـە زۆر نـەبوو، هـەروەها توانيمـان سـەربازێكی زۆری بـەريتانی بـەديل بگـرين، لـەپێش هـاتنی عەسريش ئەڵمانيا لە سێ لاوە هەسـتا بەهێرشـكردنی بەرامبـەر بـۆ سـەر دوژمن كە تاكو ئێستاش دوژمـن خـۆڕاگرە، كەچـی كەشـتيگەلی ئاسمـانی سـێ بـەردەوامبوو لـە بۆردومـانكردنی كەشـتيگەلی دابـەزينی دوژمـن و خەريكردنی.

لەدوای كاتژمێر سێی پاش نيوەڕۆ پێشرەوانی يەكەكانی تيپی زرێپۆشـی ١٠ كە لە (ئـەميانس) بـوو تـوانی لـە (دييـب) نزيـك ببێتـەوە، بـەڵام هـيچ پێويستيەك نەبوو بۆ چوونەژوورەوەی ئەو تيپە، چونكە كەنەديـەكان كـە نزيكـەی تيپێـك دەبـوون پێشـتر لـە وشـكانيەوە لادران و كـەنارەكان بەتەواوی دووبارە كەوتەوە دەستی ئەڵمانيەكان، هەروەها تيپـی پيـادەی (٣٠٢) ئازا، بە كەلوپەلـە سـەربازيە خراپـەكانی لەشـەڕدا بـەردەوام بـوو، هــەروەها كەشـتيگەلی ئاسمــانی ســێ بەشـێوەيەكی بـاش پشـتيوانی لێدەكردن.

زەرەرو زيانەكانی ئەڵمانيا مام ناوەندی بوو، بەڵام بەتاريەكی ئەڵمانيا بە تەواوی هەموو سەربازەكانی كـە نزيكـەی ٨٠ كـەس دەبـوون لەناوچـوون، كەنەديەكان شەڕێكی توونديان دەكرد، بەڵام دابەزينەكە خێرا ئاشكرابوو، هێرشـەكە كتوپڕيەكـەی بەفيڕۆچـوو، بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم هێرشـەش

هەموو ڕێو شوێنێك گیرایە بەر، زەرەرو زیانەكانی ئەڵمانیا نزیكەی ٣٠٠ سەرباز بوو، بەڵام هی دوژمن ٧٠٠ كوژراو لە وشكانی و نزیكەی ٣٠٠٠ سی هەزار سەرباز بەدیل گیراو ٣٠ تانكیشی تێك و پێك شكا.

ڕۆنشتد بە پلە یەك گرنگیدا بەو یەكانەی كە بەچاكی وەڵامی ئەم دابەزینەیان داوە، مەدالیای پێ بەخشین و ڕەفتاری تایبەتی لەگەڵدا ئەنجامدان. سەربازەكانی ئەڵمانیا بە پلە دوو گرنگییەكی زۆریان بە دانیشتوانی فەرەنسادا، نەك هەر مامەڵەیان چاك بوو لەگەڵیان و دڵسۆزبوون بەرامبەر هێزەكانی ئەڵمانیا، بەڵكو بەشداریانكرد لە چاودێری و چارەسەركردنی بریندارەكانیشیان. لە بەرامبەر ئەمەشدا ڕۆنشتد سوپاسێكی تایبەتی پێشكەش بە دانیشتوانی ئەو ناوچانە كرد وەك دانپیانانێك بەرامبەر كارەكانیان، ئەو كارەی ڕۆنشتد بەرامبەر دانیشتوان كردی، هیچ سەركردەیەكی تر لەكاتی شەڕدا نایكات، وەكو ئەوەی پێشنیاری بۆ هیتلەر كردو تاكو دیلە فەرەنسیەكان ئازاد بكات، ئەوانەی كە لە جەنگدا بە دیل گیرابوون و بە خزمایەتی دەگەڕانەوە سەر دانیشتوانەكانی ئەم ناوچانە. هیچ سەربازێك لە مەیدانی جەنگدا پیاوانە هەڵسوكەوتی نەكردووە وەكو ئەوەی كە فۆن ڕۆنشتد كردی. ئەزموونەكانی دبیب زوو بە زوو دەرئەنجامێكی باشی هەبوو و بوون بە وانەیەك و، لە نێو بەرەكانی جەنگ لە تەواوی ڕۆژئاوا بەكارهێنرا، ڕۆنشتد گومانی لەوە نەبوو كە كردەوە جەنگییەكانی دبیب جگە لە مومارەسەكردن چیتر نەبوو، بەختیش ڕۆڵێكی باشی بینی لە سەركەوتنی ئەڵمانییەكان. لە كۆتایی ئەیلوولی ١٩٤٢ هیتلەر مارشاڵ (هیلدەری) سەرۆك ئەركانی سوپای لەسەركار لاداو لە جێگاشی لیوا (زیتزلەر)ی سەرۆكی دەستەی ئەركانی دانا و كردی بە سەركردەی بەرەی ڕۆژئاوا، لە

دواییشدا لە رۆژەکانی کۆتایی مانگی ئەیلوولی ١٩٤٢ بارەگای رۆنشتد لە سانت جیرمان گوازرایەوە بۆ بەرەی جەنگ لە رۆژهەلات پایەی خۆی لە لیوا زیتزلەر وەرگرت و دوای چەند رۆژێك بەرەو بەرەی رۆژهەلات بەرێکەوتین. پێشتر لە جەنگی پۆلەندا لە سالّی ١٩٣٩ پلەی سەرۆکی دەستەی ئەرکانی حەرەکاتم لە بارەگای رۆنشتد وەرگرتبوو، هەروەها لە هەلّمەتەکەی رۆژئاوا لەسالّی ١٩٤٠ کە ئێمە لەسەر هەستەکانمان کۆك بووین. ئەمانجەکانی ئەلّمانیاش لە رۆژهەلات گەیشتن بوو بە قەفقاس و ستالینگراد، سوپای شەشی ئەلّمانیاش لەوێدا لەنزیك شاری ستالینگراد رووبەڕووی جەنگێکی کوشندە بووەوە و رۆژ لە دوای رۆژیش جەنگەکە خەستتر دەبوو، هەروەها چاوپۆشی کرد لەو هێرشەی کە مەبەستی شاری لینینگراد بوو، چونکە ئەو تیپانەی کە بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکرابوون لە شوێنی دیکەی جیاجیادا بەکارهێنرابوون. لە راستیدا دەسکەوتێکی باشمان لە شەڕ لە سالّی ١٩٤٢ بەدەستهێنا، بەلاّم ئەم سەرکەوتنانە کۆتایی یەکلاییکەرەوە نەبوون، بەلّکو بە پێچەوانەوە هەست و کاریگەری روسیەکانی زیاتر کرد و، هەستی دەروونی سەربازەکانی ئەلّمانیاشی گەیاندە سەرووی هەولّەکانیان کە لە پێشوودا نەیانتوانی بوو ئەو پلەیە ببڕن، لە باکووری ئەفریقیاش رومڵ بە سەرکەوتوویی بەرەو سنووری ولاّتی میسر بەڕێکەوت، بەلاّم لە دواییدا شکستی بەخۆی هێنا لەبەر کەمی ئازووقە و زرێپۆش و تەقەمەنی و سوتەمەنی، بەلّکو بەریتانییەکان بنەمایەکی زۆریان لە دەستدا بوو لەو پێوستییانەی کە باسمانکرد. گۆڕانکارییەکی روون و ئاشکرا لە ئەنجامی رووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە روویدا، کە لیوا مونتکومری پێی هەستا، رۆمل هەرچەندە سەرکردایەتی باشی لە دەستدا بوو و بەرەنگاریەکی باشیشی کرد، بەلاّم دوای ئەوەی

هاوپەیمانان دوای کەوتن توانی لەبەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی دیکە بەرەو ڕۆژئاوا پاشەکشە بکات. لە پاییزی ساڵی ١٩٤٢ لە دوای هێرشی ئەنگلۆ- ئەمریکی بۆ سەر باکووری ئەفریقیا و (رأس الجسر) ی دامەزراند لە نزیك (الدار البیچاو) بەمەبەستی پاراستنی ڕێگای دەریایی لە سەقلیە، هەر لە دەستپێکی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ ئەدمیراڵ (دارلان) کە لەدەست مارشاڵ بیتان هەڵاتبوو، بە پاڵپشتی یەکەکانی ئەفریقا و بەریتانیا و فەڕەنسا باکووری ئەفریقیای داگیر کرد. بەم شێوەیە باکووری ئەفریقا لە دەست حکوومەتی فیشی دەرچوو.

لە دوای دانوستانەکەی فەڕەنسا لە ٢٥ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٠ خەڵك وا دەبینن و هەست دەکەن، هەڵوێستی ئەڵمانیا لەدوای ئەم دانوستانە ڕوون و ئاشکرا نەبوو، ئەوان دەپرسن: بۆچی ئەڵمانیا بە درێژایی شەڕ بەتەواوی فەڕەنسای داگیر نەکرد، بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی خودی ئەڵمانیا ؟

ئەو خەڵکانە خۆیان سەریان سوڕما بە ڕازیبوونی هیتلەر بە مانەوەی سوپایەکی بچووکی حکوومەتی فیشی سەرەڕای بەشێکی باش لە کەشتی گەلی فەڕەنسی کە لە تۆلۆن بوو، دەبێ باش بزانین هیتلەر ئەوکاتەی دڵنیابوو لە مانەوەی فیشی کە پاڵپشتی خۆی بوو بە درێژایی جەنگەکە، بەڵام لە دوای کردەوەکەی دارلان کە لە دژی ئەڵمانیا ڕابوو، سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا ئەو ترسەی بۆ دەرکەوت کە ڕووبەڕووی دەریای سپی ناوەڕاست بووبووەوە. ڕومل لە تونس پاشەکشەی کرد، ئەگەرچی یەکە ئەمریکی و بەریتانییەکان و یەکەکانی دارلانی فەڕەنسی لە باکووری ئەفریقا و کەشتی گەلی فەڕەنسی لە تۆلۆن هەبوو، سەرەڕای بوونی یەکەکانی فەڕەنسی لە ناوچەی حکوومەتی فەڕەنسا لە فیشی.

ئەوکاتـە حکوومـەتی فیشـی بەسـەر (بـرانیس) و بەشـێکی فەڕەنسـا و دەریای سپی ناوەڕاست دەسەڵاتداربوو، چی ڕوودەدات ئەگەر فەڕەنسیە هەڵاتووەکان ئەوانەی کە لـە باکووری ئـەفریقیا بـوون لەگـەڵ یەکـەکانی دابـەزینی ئەمـەریکی و بـەریتانی لـە کـەناری دەریـای سـپی ناوەڕاسـتدا دابەزن ؟

ئایا سوپای حکوومەتی بیتـان پالْپشـت دەمانـەوە یـاخود دەچـوونە پـالْ هێزەکانی دارلان ؟ لە هـەموو ئـەو کردەوانـە بەتـەواوی بـیروڕای ئـەلْمانیا بـەدیار دەکـەوێت، هـەروەها کـردەوەی هیتلـەر بـە خێرایـی بۆمـان شـی دەکاتەوە لە خێراکردنی داگیرکردنـی فەڕەنسـا و ناوچـەی دەریـای سـپی ناوەڕاست.

ئەو ڕێوشـوێنانەی کـە هیتلـەر گرتبوویـە بـەر هـیچ زەرەرو زیانێکی لـە باشووری فەڕەنسا بە حکوومەتی فەڕەنسا نەگەیاند، بەڵکو فەرمانیـدا لـە خێرایی داگیرکردنی ناوچەکەنی بـرانیس و دەریـای سـپی ناوەڕاسـت، کـە وای لێهات بـە پێـی هەسـتی ئێسـتاکەی و بـە شـێوەیەکی کتـوپڕ کـە زۆر گرنگ بوو، فەرمانیـدا بـە خۆئامـادەکردنێکی خێـرا بـۆ پێشـڕەوی بـەرەو باشووری فەڕەنسا، ئەم ئامادەباشیەش لەگەڵ هـاتنی مـانگی ئـاب تـەواو بێت، لەبەر ئەگەری بارودۆخی سەربازی ناجێگیر، بۆ ئـەم جەنگـەش هـیچ یەکەیەکی لەوێدا ئامادە نەبوو، بەڵکو تیپە نایابەکانی لە کەناری بەلجیکا و فەڕەنسا و هۆڵەندا کاریان دەکرد، جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش درابووە دەست تیپە نوێیەکانی هێـزی بـەرگری ئـەلْمانیا نـەبێت کـە لـە فەڕەنسـا بوون، لەگەڵ هەندێك لەیەکەکانی ئاسایشی سەر بـە سـەرکردەی سـوپای پاریس کە پێکهاتبوو لـە سـەربازە بـە تەمەنـەکان و ئـەو چـەکە سـووك و خراپانەی کە لە دەستیاندا بوو، هەروەها نەبوونی تۆپـەکان بـوو. ئـەرکی

هێزەکانی دەریایی ڕۆژئاواش مەشق پێکردنی تیپەکانی تایبەتی بوو بۆ بەکارهێنانیان لە دوای داگیرکردنی کەناری دەریای سپی ناوەڕاست ، تاکو بەکەمترین زەرەرو زیان دەست بەسەر کەشتی گەلی فەڕەنسیدابگرن، هەروەها دوابەدوای دەستپێکردنی هێرشەکەش ئەرکی کەشتی گەلی ئاسمانی سێیەمیش خۆ ئامادە کردنبوو بۆ داگیرکردنی ئەو فرۆکەخانانەی کە لە باشووری فەڕەنسا داهەبوون.

دڵەڕاوکێی سەرەکی ڕۆنشتد بیرکردنەوە بوو بەرامبەر لەو یەکانەی کە پێویست بوو بەکاریان بهێنێ بۆ بەرگریکردن لە کەنارێکی درێژ کە سنووری نزیك (فندرس) دەگرێتەوە تا دەگاتە سنووری ئیستالیا لە نزیك منتون، ئەمەش دوای دەست بەسەردا گرتنی باشووری فەڕەنسا. لە ناوەڕاستی تشرینی دووەم توانرا بە ئاسانی شۆڕشی جەزائیر لە دژی حکوومەتی فیشی دابمرکێنرێتەوە، هیتلەریش هەر لەهەمان مانگدا فەرمانیدا فەڕەنسا داگیر بکرێت.

یەکە بێ هێز و ناچالاکەکانی ئەڵمانیا جوڵەیان کرد، مەبەستی ستراتیژی ڕۆنشتد روون و ئاشکرا بوون کە داگیرکردنێکی خێرای ئەو خاڵە گرنگانە بوون کە کەوتبوونە سەر کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست. ڕێگای پێشڕەویش بۆ باشووری فەڕەنسا لە باکوورەوە دەکەوتە سنووری دۆڵی رون، لە باشوورەوەش لەسەر سنووری رووباری کارون بوو، ئەم دوو هێڵە سەرەکیەی پێشڕەویش ئاشکرابوون و لەیەکتر شاراوە نەبوون.

پێشڕەویەکەش بەم جۆرە بوو:

١- هێزەکانی سوپای یەکەم لە (بۆردۆ) جوڵەی کرد بەبەزاندنی (تۆلۆن) بۆ (ناربۆن).

٢- یەکەکانی پێکهاتەی فیلبۆ جووڵەیان کرد بە بەزاندنی (لیۆن) بۆ مارسیلیا و تۆلۆن، هەروەها بە هاوکاری مەفرەزەی دیکە بەرەو فیشی، بۆ گەیشتن بۆ کەنارەکان لەسەر شێوەی جەنگێکی بروسك ئاسا، یەکەکان سوودیان لەو شەمەندەفەرانە وەرگرت کە مینرێژ کرابوون، یەکە بچووکەکانی پێشەوە بەیارمەتی ئەو شەمەندەفەرانە توانیان بەرەو کەنارەکان جوڵە بکەن، مارشاڵ رۆنشتد باسی گرنگیەکی زۆری ناو فەرەنسای کرد، بێ ئەوەی هیچ رووداوێك روویدات و فەرمانە تایبەتیەکانی دابەشکرد کە تیایدا هانی یەکەکان دەدات، بۆئەوەی خوورەوشتی چاکیان هەبێ بەرامبەر هاوڵاتیان و دەسەڵاتدارانی فەرەنسی. ناوبراو بەم شێوەیە فەرمانیدا "دووربکەونەوە لە سەرپێچی یاسا کە دەبێتە هۆی بێزاری، هەرچەند گران لەسەرتان بکەوێت" هەروەها فەرمانیدا بەیەکە ئەڵمانییەکان کە سڵاو و رێز بسەننەوە یان سڵاوی دۆستایەتی بکرێ لە گشت تاکەکانی سوپا بچووکەکەی فەرەنسی کە تا ئەوکات بوونیان هەبوو، جگە لەمانەش بڵاوکراوەکانیان بەیارمەتی هێزی ئاسمانییەوە هاویشتە خوارەوە و لە نێو ئەو لافیتانەی کە هەڵیانواسی بوو، هۆکاری هێرشکردنەکەیان بۆ خەڵکی مەدەنی روونکردبووەوە. سەبارەت بەم هێرشەش بە شێوەیەکی یاسایی حکوومەتی فیشی ئاگادار کرایەوە و پێش چەند کاتژمێرێك بەر لە هەڵاتنی رۆژ هێرشەکە دەست پێبکات، رۆنشتد داوای لە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی کرد بەرەو پێشەوەی یەکەکان بڕوات، بە ئیعتیباری ئەوەی سەرۆکی گشتی ئەوان بوو، هەروەها هەستا بە سەردانێکی فەرمی بۆ بیتان لە فیشی، ئەم سەردانەش لە خۆیەوە بوو، بەبێ ئەوەی لەسەرووی خۆیەوە فەرمانی پێبکرێ، ئەم کارەشی بۆ ئەمە ئەنجام نەدا وەکو

نەرمی نواندنێك بەرامبەر مارشاڵی فەڕەنسا، بەڵكو بۆ ئەوەبوو كە پێش چوونە ژوورەوەی یەكەكانی ئەڵمانیا خۆی لە فیشی ئامادەبێت، چونكە ئامادەبوونی ڕۆنشتد هۆكارێكی كاریگەر بوو لە دروست نەبوونی پێكدادان لەگەڵ یەكەكانی فەڕەنسا پێش ئەوەی فەرمانەكە لە دەست دەرچێت. ئەم هێرشەش بەبێ پێكدادان ئەنجامدرا، ئەگەرچی چەند چركەیەكی تاڵ بەسەر ئەفسەرە فەڕەنسیەكان تێپەڕی، كە بەچاكەی هەردوولا بەسەر گێروگرفتەكاندا زاڵبوون. هەموو ئەو ئەڵمانیانەی خاوەنی دەسەڵات بوون سوپاسی سەربازی گەورە لیوا (دی لتردی تاسكن) یانكرد بۆ ئەو ئاڕاستە راستەی بەكاریهێنا، بەمجۆرە یەكەكانی ئەڵمانیا دوای بیست و چوار كاتژمێر گەیشتە مارسیلیا و توانیان سنووری باكووری لیۆن ببڕن و بەپێی ئەو خشتەیەی كە بۆ هێرشكردنەكە دیاریكرابوو، بۆئەوەی بەشەمەندەفەرە خێراكان رابگەن. لە ئەنجامی داگیركردنی باشووری فەڕەنسا ناوچەی سەركردایەتی گشتی رۆژئاوا فراوان بوونێكی گەورەی بەخۆیەوە بینی، هەروەها بەرپرسیارەكانیش زیاتر بوون، دەبووایە هێزەكانی كەناری دەریای سپی ناوەڕاست بەتەواوی و بە خێرایی رێكبخرێن و ئامادەبكرێن بۆ بەرەنگاربوونەوە، بەڵام جگە لە قەڵای گەورە و كۆن و بەندەرە ئاویەكان زیاتر هیچی لێنەبوو، هەروەها كەناری دەریاكەش خۆی لەبارێكی ئاسایی نەبوو، ئەركە ناخۆشەكەش لەوەدا بوو كە بەرەی دەریا نوێیەكە فراوانە و دەبووایە یەكە پێویستەكانیان بۆ ئامادە بكرێت، بەڵام ئەو كاتە لە هێزێكی كەم زێتری لێ نەبوو،بەڵام ئایا هاوپەیمانان رێگەیان بە رۆنشتد دەدا بۆ خۆ ئامادەكردن؟ دەبووایە ماف دەسەڵاتداریەتی فەڕەنسا لە باشوور بە هەند وەربگیرابایە، لەهەمان كاتدا بایەخ بە ئاسایشی دەریاچە و بەرەی

برانیسی بدرێت، نەشدەتوانرا هاوسەنگی بکرێت لە نێوان ئەو دوو داواکاریە تەنها بە هاوکارییەکی توند لەگەڵ حکوومەتی فیشی و دەسەڵاتدارانی هەرێمەکەدا نەبێت، چونکە هاوکاری سیاسی ئەرکی دادوەری سەربازیی پاریس بوو، نەك ئەرکی رۆنشتد. دادوەری سوپایی لە پاریس رێکخراوێکی دروستکرد بۆ تەواوکردنی داواکاریەکانی سەربازیی ئەڵمانیا لەلایەك و، فیشی لەلایەکی دیکەوە. ئەم ئامادەکاریانەش زۆر زۆر شلو شۆق بوون. دەتوانین پێشبینی بکەین کە لەگەڵ زیادبوون و فراوانبوونی ئەرکەکانی رۆنشتد لە باشووری فەرەنسا چەندە گرفتەکانی زیاتر بوون،هەرچەندیش ئەو گرفتانە هەموو شتێك نەبوون.

رۆژهەڵاتی رۆن لە فەرەنسای باشوور هەر سەر بە هێزەکانی ئیتالیا بوو. بۆیە یەکەکانی ئەڵمانیا هیچ پەیوەندیەکیان بەم ناوچەیە نەبوو، بەڵام لێرەدا پرسیارێك خۆی زەق دەبێتەوە:

کێ ناوچەکانی مارسیلیا- تۆلۆن - منتون - داگیر دەکات ؟ دوا بە دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان بەرلین و رۆما سەرکردە سیاسیەکان کۆك بوون لەسەر هەبوونی سوپای چواری ئیتالیا لە کەناری ئەم کەرتە، ئەم سوپایە ئێستاکە لە نێوان منتۆن و ئەسبیزیا خۆی تەیار دەکات، چونکە دەبووایە ئەم هێزە تاکو تۆلۆن لەژێر دەستیدا بێت و بڕیاریش درا بارودۆخی ئەم بەشە لە سوپای چواری ئیتاڵی کە کەنارەکانی فەرەنسا لە تۆلۆن تا دەگاتە منتون داگیر دەکات، تەنها لەبواری خۆ پڕ چەککردنیان لە ژێر فەرمانی رۆنشتدا بن. نیوەی رۆژهەڵات لەو ناوچەیەی کە دەورە دراوە لە نێوان منتۆن و ئەسبیزیا لە ژێر فەرمانی سەرکردایەتی باڵای ئیتالیا دابوو، بۆیە دەتوانین پێشبینی گرفتەکان بکەین کە لەم ناوچەیەدا روویاندا. مارشاڵ (فرسلینۆ) سەرکردەی گشتی

چواری ئیتالیا بوو کە پیاوێکی کاریگەر و سەرکردەیەکی لێهاتوو بوو، سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی لیوا (ترابوتشی) بوو،

نزیکەی چوار تا پێنج تیپی ئیتالی لەگەڵ چەند بەتاریەیەك لە کەناری دەریای سپی ناوەڕستی فەڕەنسی تەیار بکرێت، دوابەدواش گۆڕانکاریەکی زۆر و جیاواز بۆ داگیرکردنی ئەم کەنارە بەم شێوەیەی خوارەوە دەستپێکرد:

١- پێکهاتەی سوپای لیوای (فیلبەر) لەگەڵ چەند یەکەیەکی جۆراو جۆر لەم کەرتەدا دەبن کە لە سنووری ئیسپانیا درێژ دەبێتەوە تا نزیك (فندرس) بۆ (مارسیلیا)ی ناوەوە، ئەم هێزەش لە چوار تا پێنج تیپی بێهێز لە خۆ دەگرێت.

٢- سوپای ئیتالیا لە بەشی رۆژئاوا دەبێت کە لە تۆلۆنەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە (منتون) دەستەیەکی بە هێزی پەیوەندی ئیتالی بە سەرکردایەتی لیوا (مارازانی) گەیشتە بارەگای رۆنشتد کە ئەفسەرێکی ئیتالی لێهاتوو بوو لە بەشی فروسیە، لەکاتی پشووشدا سەرکردایەتی تیپێکی نایابی ئیتالی بووە بە ناوی سالیری لە ناوچەی رۆژهەڵات ساڵی ١٩٤١-١٩٤٢ کە لەلایەن رۆنشتدیش ناسراوبوو، هەروەها یەکێك لەوانەی کە ئەندامی ئەو دەستەیە بوو بەناوی عەقید (رافیولی) بوو کە ئەفسەرێکی باش و ئیشکەر بوو، هەروەها موقەدەم (سکنورینی) بوو کە هەردەم بە رووخۆشی جیاکراوەتەوە، ئەم دەستەیەش کە نزیکەی لە ٨ ئەفسەر پێکهاتبوو لەگەڵ چەند کەسێکی تری باش کە نزمتر بوون لە خۆیان، ئەم دەستەیە خۆی لەگەڵ بارەگای سەرکردایەتی رۆژئاوا تێکەڵ کرد بە شێوەیەك کە بەشێکە لەوان، پەیوەندی کەسایەتی رۆنشتد لەگەڵ

ئـەوان پەیوەندیـەکی برادەرانـەی باشـبوو. سـوپای چـواری ئیتالیـا فەرمانەکانی خۆی لە رۆنشتد وەردەگرت سەبارەت بە خۆ عەمبار کردن و پارێزگاری کردنـی لـە کـەنارەکان، لەلایـەکی دیکـەوەش فەرمانـەکانی لـە سـەرکردەی خـۆی وەردەگـرت لـە رۆمـا، ئـەو کێشـانەی کـە روویانـدەدا لەلایەن رۆنشتد بە شێوەیەکی باش چارەسەر دەکرا، چـونکە ئـەم پیـاوە بـە لێهاتوویـەکی بـاش ناسـراو بـوو وە کاریگـەری زۆری بەسـەر بەڕێوەبەرایەتی کەسانی نەتەوەی تردا هەبوو. لیوا (ترابوشـی) سـەرۆکی دەستەی ئەرکانی سوپای چواری ئیتالیا لە ١٠ی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٤٢ نامەیەکی بۆ سەرۆکی دەستەی ئەرکانی سەرکردایەتی رۆژئاوا بـەم شێوەیەی خوارەوە نووسی :

(ئازیزم ژەنرال- لە کاتی گەڕانەوەی بۆ پاریس سەرکردایەتی رۆژئاوا بـە چەند ووشەیەکی رێزکـراو باسـی سـەرکردە خۆشەویسـتەکەی دەکـات کـە دەڵی : ((دوو خاڵی سەرکردایەتی نموونەیی لەخۆوەگرتبوو، خووڕەوشتی باش و هۆشمەندێکی باش)) لەمەش مەبەستی حـالی رۆنشـتد و دەسـتەی ئەرکانەکەی بوو. لە کاتی داگیر کردنی کـەناری دەریـای سـپی ناوەڕاسـت لـە تشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٢ بـەبیٚ گوێدانـە هەسـتی دەریاوانـە فەڕەنسیەکان و بەهەنـد وەرگـرتنی بـیر و راکانیـان هێڵێکـی دەرەکـی لـە چوار دەوری بارەگای دەریای تۆلۆن دامەزرێنرا، چونکە بەلای ئـەدمیراڵی فەڕەنسی شتێکی نەشیاوە فەرمانەکانی خۆی لـە ئـەڵمانیا وەربگرێت لـە بەنـدەرە دەریاییـە تایبەتیەکـەی خـۆی ! بۆیـە یەکـەکانی فەڕەنسـا لـە تۆلۆن خۆیان شان بە شانی ئـەو هێزانـە دانـا کـە پارێزگـاری لـە کـەناری ئەڵمانیای ئیتاڵی دەکەن. مارشاڵ بیتان دیارییەکی پێشکەش بە رۆنشتد

کرد کە بریتیبوو لە وێنەیەکی هونەری کە پێکهاتبوو لە داپۆشەرێکی برۆنزی کە بەکاردەهێنرێ بۆ داپۆشینی دەمی تۆپە دوور هاوێژەکانی پارچەی دەریایی کە ناوی (ئەلزانس) بوو.

ساڵی ١٩٤٢ بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت، ناوچەی سەرکردایەتی مارشاڵ رۆنشتد فراوان بوو بەرەو کەناری ئەڵمانیای هۆڵەندی بە درێژایی دەریای باکوور لە گەرووی ئەتڵەسی درێژ دەبۆوە تا دەگاتە سنووری برانسیس، لە کۆتاییدا تا دەگاتە بەرزاییەکانی دەریای سپی ناوەڕاست. سەرەڕای ئەوەی داکۆکیکەرەکانی ئەلپ لە (منتون) بەرەو باکوور تێپەڕ بوون بە )مونت سنیس) تا دەگاتە سنووری سویسرا. ئەگەرچی هێرشی هاوپەیمانان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر دەبوو ئەم ترسەش روون و ئاشکرا لەلایەن داکۆکیکەرەکان کە لە هێڵێکی داماوی دیار رووبەڕوویان دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەی هەندێك لە ئەزموونەکان ناخۆش بوون کە لە ئەنجامی هەندێك لە بەشەکانی سوپای فەڕەنسی دەردەکەوت، بیر و بۆچوونی زۆریش هەبوون کە رێگا بە حکوومەتی فیشی بدرێت. تاکو کاتی جەنگ سوپایەکی نوێ پێك بهێنێ.

رۆنشتد سەربازێکی باش بوو لە کارە مرۆییەکان دوور نەدەکەوتەوە و دەربارەی هەڵاتنی یەکەکانی فەڕەنسی لە حکوومەتی بیتانیش باش دەیزانی بە بوونی هەستێکی باڵای گەلی نیشتمانی فەڕەنسا، چونکە پێی سەیر نەبوو بەخۆ لادانی یەکەکانی فەڕەنسا بۆ لای هاوپەیمانان. هەروەکو لە پێشوودا لەلای ئاشکرا بوو بەرهەڵستی فەڕەنسا لە باکووری ئەفریقیا رۆژێك هەر دەردەچێت. رۆنشتد دڵنیا بوو لە هاریکاریکردنی باشی یەکەکانی فەڕەنسا کە بۆ داکۆکیکردن کاریان دەکرد، بەڵام زۆر

حەزی دەکرد مارشاڵ بیتان رازی بکات و پاڵپشتی حکوومەتی فیشی بێت، دوا بە دوای گفتوگۆیەکی سەرەتایی درێژ لەگەڵ بارەگای سوپای ئەڵمانی کە زۆر بە ترس بوو لە یارمەتییەکانی فەڕەنسا، ئەم سەرکردایەتیە رەزامەندی خۆی نیشاندا بۆ ئامادەکاری و هاریکاریکردنی ئەڵمانی- فەڕەنسی، عەقید بۆن لەگەڵ دوو ئەندام لە دەستەی دانوستاندن لە پاریس گەیشتنە سەرکردایەتی گشتی رۆژئاوا هەروەها حکوومەتی فیشی و بریدۆی سەرکردەی سوار چاکی فەڕەنسی لە جیاتی مارشاڵ بیتان دەربارەی ئەم دۆخە راوێژکاریان دەکرد بۆ پێکهێنانی هەندێ تیپ کە پێکهاتبوون لە نزیکەی ١٠٠٠٠٠هەزار سەربازی فەڕەنسی، بۆ ئەو مەبەستەش هێزی ئاسمانی ئەڵمانی بارەگا بچووکەکانی مەشق کردنی لە باشووری فەڕەنسای چۆڵکرد، بەڵام چەکدارکردنی ئەم هێزە زۆر نائاسایی بوو، چونکە بە شێوەیەکی گشتی سوپای فەڕەنسی چەکەکانی کۆن بوون، هەندێکیان مێژووەکەیان دەگەڕایەوە بۆ مێژووی جەنگی یەکەمی جیهانی. رۆنشتد هەرچی لە دەستیدا بوو کردی بۆ ئامادەکردنی ئەم سوپا نوێیە بە چەکی باشی ئەڵمانی کە ئەوەی لە بەردەستی خۆیەتی. ئەم گفتوگۆیانەش چەند هەفتەیان خایاند لە نێوان زستانی ١٩٤٢-١٩٤٣ لە پاریس بەڵام هەموو شتێك لە پاشان رووخا. دەرئەنجامی ئەمەش نائارامی هیتلەر بوو سەبارەت بە باکووری ئەفریقیا، بەڵکو ترسی زیاتر پەیدا کرد لە پێکهێنانی سوپایەکی نوێی فەڕەنسی لە کاتی جەنگدا، بۆ ئەم کارەش فەرمانێکی بەپەلەی دەرهێنا بۆ لابردنی هەر کارێکی ئامادەکراو بۆ ئەم مەبەستە دەستی پێکردبوو، زۆر بە داخی زانی کە رۆنشتد بیر و بۆچوونی خۆی بە بێتان راگەیاند، دەربارەی ئەم

بڕیـارە هیتلـەر دەسـتیکرد بـە لابردنـی هەرچـی هێـزی بـەرگریکردنی فەڕەنسـی بـوو، هـەروەها پـڕ چـەککردنیان لەبەرئـەوەی دوودڵ و ئـارام نـەبوو لـە دڵسۆزی ئـەم یەکسـانە، بۆیـە هـیچ کاتێـك زۆریـان نـەکرد لـە حکوومەتی فیشی بۆ بەرگریکردن لەسەر کەنار شان بـە شـانی یەکـەکانی ئەڵمانی.

## بەشی نۆیەم

### ترس لە داگیرکردن

روودانی داستانی ستالینگراد پێشبینی دەکرا، سوپای شەشی ئەڵمانی بە فەرمانی هیتلەری نەخۆش کەوتە نێو تەلەکە، ئەمەش یەکەم ناخۆشی بوو لە نێو بازنەی فراوانی ئەڵمانیا روویدا و کاریگەریەکی زۆر خەراپی هەبوو، لە هەمان کاتیشدا روون و ئاشکرابوو کە جەنگ تەنها ئێستا لە بەرەی رۆژهەڵات دەستی پێکرد و ، بارودۆخیش لە ئەفریقیا هەر دژوار بوو.

با چاوێك بە نەخشەی ئەوروپا دابخشێنین: بە شێوەیەکی گشتی بەرەی ئەڵمانیا بەمجۆرە بوو:

کەناری نەرویج—دانیمارك —کەناری دەریای باکووری ئەڵمانی —هۆڵەندا— بەلجیکا —کەنارەکانی فەڕەنسا تاکو سنووری ئیسپانیا نزیك (ئەبرون) تا ئەوپەڕی رۆژهەڵات. سنووری چیاکانی برانیس، بەرگری لە کەناری ئیتالی گۆڕەپانی جەنگ لە باکووری ئەفریقیا— کەنارەکانی ئەدریاتیك— یۆنان— دەریای رەش دەکا، لە دواییدا بەرەی رۆژهەڵات بەرەو یەکێتی سۆڤیەت و درێژ دەبێتەوە بۆ رۆژئاوای قەفقاس تاکو لینینگراد، جگە لەمەش فنلەندیەکان لە بەرەی خۆیان لە لینینگراد تاکو دەریای باکوور پێویستیان بەوە نییە کە سەربازێکی لێهاتوو بن تاکو بزانن پاراستنی ئەم بەرە فراوانە چەند ناخۆشە کە سێ بەشی ئەوروپا دەگرێتە خۆی. بەرەی رۆژئاوا و ئەوروپای باشوور ناوچەیەکی فراوان بوو بە بێ ئەوەی یەکەکانی تەواوی تێدا هەبێت بۆ بەرگریکردن، بەڵکو چەند تیپێکی هەبوو

بۆ بەرگریکردن نەك چیتر. ئەوەی روویدا لە جەنگی جیهانی دووەم وەك ئەوە وابوو کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی روویدا، بەرەکانی ئەڵمانیا بە خێرایی فراوان بوو بۆ چوار بەرە بۆئەوەی بتوانرێ ئەڵمانیا بەراورد بکەین بە وڵاتێك کە چوار دەوری گیراوە، سەرەڕای ئەم کەم و کورتیانەی لە پێویستیە سەرەکیەکانی داهاتووە کە بە شێوەیەکی باش دیار بوونە ئەگەرچی ئەو داهاتووە زۆرەی جیهان لەژێر دەستی هاوپەیمانان بوو. لەم کاتەشدا هێرشەکانی ئاسمانی هاوپەیمانان بەردەوامبوو، هەروەها توانای هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا کەم ببووەوە. ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٣ هەموو توانای سەربازی و سیاسی خۆی وەگەڕهێنا و لە سەرەتادا بە شێوەیەکی کەم بەرەو ژوور دەڕۆیشت، لە پاشانیش بە شێوەیەکی خێرا. کەچی ناوچەی سەرکردایەتی رۆژئاوا لە ئەوروپا فراوان بوو تەنها پارچەیەك نەبێت لە کۆی گشتی. ساڵی ١٩٤٣ بەرەو ژوور هاوپەیمانانی رۆژهەڵات دەستیانکرد بە فێڵ و لەبەر بزرکردن لە کارەکانیان، ئێستاکە دەبێت هێرشکردنەکە لەکوێ دەست پێبکات ؟

لەوانەیە لە هۆڵەندە دەست پێبکات یان لە نێوان (کالیە) و (هاڤر) ، هیچ جیاوازییەکیش نییە لە نێوان ئەو دوو ناوچەیە لە رووی دەسەڵاتەکانیانەوە بۆ هێنانە خوارەوەی هێزی ئاسمانی. هەردوو نیمچە جەزیرەی نورماندی و بەریتانی کە بە درێژایی دەریابوو باش بوون بۆ بەکارهێنان و، لە دوولاوەش دەریا بەشێوەیەکی باش چوار دەوریانی گرتووە. رۆنشتد لەو کاتەدا بیری لە مینا دەستکردەکان نەکردبووەوە و خۆی و دەستەی ئەرکانەکەی وایاندەزانی داگیرکردنەکە لە ناوچەیەکی کراوەی کەنار دەست پێدەکات، بەڵام لە دواییدا پێویست بووە مینایەکی باش هەبێت. لەوانەش شاربورگ و بریست یەکەم شوێن بوون کە جێگای

سەرنج بوون بۆ هێنانە خوارەوەی هێزی ئاسمانی لە نێوان ڕێژگەی(وار) و سنووری ئیسپانیا واتە (لیسلاندس) Leslands ئەم کەرتەش کە درێژاییەکەی نزیکەی ۳۰۰ میل دەبوو و تیپی پیادەی لێهاتووشی کەم تیابوو، کەواتە ماوەی هەریەك تیپ لەم تیپە لاوازانە نزیکەی ۱۰۰ میل بوو، ئەمەشیان بۆ بەرگریکردن نەبوو، بەڵکو بۆ چاودێری کردنی کەنار بوو. ئەگەری ترسیش لەلایەن ئیسپانیاوە بەرەو برانیس نەبوو، بەڵکو هەندێ پڕوپاگەندە بڵاوببۆوە دەربارەی هاوپەیمانان کە هەڵدەستن بە هێنانە خوارەوەی هێزی ئاسمانی لە نیمچە دەریای ئەندەلس، لەوێشدا بەرەی دەریای سپی ناوەڕاست هەبوو، کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد و هیچ قەڵابەندیەکیشی نەبوو، هەروەها هێزێکی واشی لێ نەبوو کە لە لایەنی سەربازیەوە گرنگی هەبێت،

موقەدەم (میردترنگ) سەرۆکی بەشی جووڵە لە دەستەی ئەرکانی ڕۆنشتد هەموو ڕۆژێك نامەیەکی نوێی ئاگادارکردنەوەی دەربارەی ئەو ناوچانە پێشکەش بە ڕۆنشتد دەکرد. کە ئەگەری داگیرکردنیان هەیە و ناوەڕۆکی ئەم نامانەش لە نێو سەرچاوەکانی دەرەکی و ناوەخۆ کۆدەکردەوە. چالاکیەکانی ئاسمانی دوژمن زیاتر بوو لە فەڕەنسا بەتایبەتیش لە شەواندا، هەروەها فڕۆکەکانیش ئەفسەر و جێگرە بەریتانییەکانیان بۆ مەڵبەندی بزوتنەوەی بەرهەڵستیکارەکان دەگواستەوە، هەروەها چەکێکی زۆریشیان بۆ فڕێ دانە خوارەوە، بە تایبەتیش جۆری غەدارە. جوڵانەوەی بەرهەڵستیکاری فەڕەنسی تاکو پێش ساڵی ۱۹٤۲ ترسناك نەبوو و چەند ئەندامێکی تێدا هەبوو کە بریتی بوون لە چەند کەسێکی ئەرکانی سوپا، بەڵام ئەمانە لەلایەنی سەربازیەوە جێگای ترس نەبوون، تا ساڵی ۱۹٤۳ شێوەی ئەو بەرهەڵستیکاریە یان

ئەو بزوتنەوەیە گۆڕاو ڕێکخستنەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەیدەسەند تاکو بوو بە سێ کۆمەڵ کە لە نێو خۆیان لەمەڕ کێشە سیاسی ناوەخۆییەکان ململانێیان دەکرد، لەمبارەیەوە زۆر لە حکوومەتی فیشی داواکرا بە پۆلیس ئەم ترسناکیە لەناو ببات. هێرشەکانی مغاویر لە زیادبووندا بوون و بریتی بوون لە هێرشی ڕێك و پێك بۆ سەر کەنارەکان، ئەم هێزانەش مغاویری بەریتانیش پێی هەڵدەستان بریتی بوون لە خراپە کردن و تێکشکان و لە زۆر حاڵەتیشدا هەڵدەستا بە کۆکردنەوەی زانیاری. ئەم هموو ڕووداوانە لە ساڵی ١٩٤٣ لە ڕۆژئاوا ڕوویاندا و توند و تیژیەکان زیاتر بوون. هەروەکو لەسەرم پێویستە ئاماژە بەلایەکی تر بکەم ئەویش گەشەسەندنی شوعیەکان بوو لە ڕۆژئاوا و چالاکیە ناوچەییەکانیشی لە پێشووتر زیاتر بوو، لەدوای هەرەس هێنان لە ستالینگراد، هۆبەی هەواڵگەری دوژمن دەستیکرد بە کارێکی چالاك کە لە دواییدا زانیان بە کۆمکاری ئەڵمانیای سەربەست لە ڕووسیا کە ئەفسەری ئەڵمانی پێشوو بەشداری تیادا دەکرد کە پێشتر لەلایەن ڕووسیا بە دیل گیرابوون، لە نێوانیان ناوی کۆن هەبوو وەکو (فون سبیراتس) ،ئەمەش لەلایەن ڕۆنشتدەوە نەك هەر بڵاوکردنەوەی نهێنییەکان بوو، بەڵکو ناپاکی و خیانەت بوو کە مەترسی هەبوو لەسەر بە فیڕۆدانی گیانی زۆر لە ساربازانی ئەڵمانیا لە بەرەی ڕۆژهەڵات. ئێستاکە شێوەیەکی نوی لە پڕوپاگەندەی هاوپەیمانان دەستیپێکرد لە ڕۆژئاوا، نامەکانی بێتەلی ئەمەریکی- بەریتانی گوی بیست دەبوو کە لە بارەگای ڕۆنشتد بانگەوازی دەکرد بۆئەوەی ڕێز لە ئەفسەرە ئەڵمانییەکانی بەشداربوو لە کۆمکاری ئەڵمانیای سەربەست و ڕێزلێنانێکی باشیان لێبگیرێت. ئێمە لە ڕۆژئاوا بووین و بۆ ئێمەیان ڕوون دەکردەوە، کە ئەم ناپاکانە، نموونەی

ئەفسەرە پاکەکانن و، خاوەن رەوشتن و پێویستە رێزیان لێبگیرێت. ئەمە پڕوپاگەندە بوون و بەشێوەیەکی تایبەت ئاراستەی رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی دەکرا، وەڵامی رۆنشتد ئەوەبوو دەیگوت (سیاسەت هەموو جۆرە ناپاکیێك وەبەر دەهێنێت، بەڵام خیانەتکاران پایەدار ناکات). خەندەقی بەرگریکەرەکانی رۆنشتد لەسەر کەنار بوو، بۆ یە ئەم خەندەقانە بە هەموو هۆیەك دروستکرابوون، لە دواییدا دەردەکەوی کە جێگای گومان لەلایەن رۆنشتدە. هەر سەرکردەیەکی سەربازی خاوەن بیرێکی راست و یەکسان پێویستە بە باشی سەیری ئەگەری هەرەس هێنانی خۆی بی، ئەگەرچی هەلۆیستیشی گونجاو بیّ، ساڵی ١٩٤٣ هەلۆیست لە رۆژئاوا زۆر ترسناك بوو. جەنگی توندتریش لە ئەفریقیا بەردەوامبوو، لەوەش زیاتر لە بەرەی رۆژهەلات کە سەرچاوەی ماندووبوونێکی زۆر بوو بۆ هەموو پیاوەکان و کەل و پەلەکان، ئەو هێزانەی کە جوولەیان بەرەو رۆژئاوا نەبوو، تەنها کەمێکیان نەبێت. هەندێك لەو تیپانەی رۆژئاوا لە چەند پیاوێکی بەساڵاچوو پێکهاتبوو کە چەکی کۆنیان بە دەستەوە بوو، توانای جوڵانەوەیان کەمبوو کە نەیاندەتوانی سەرکەوتن بە دەست بهێنن، هەروەها زۆربەی ئەو تیپانەی سەر کەنار وڵاغیان بۆ گواستنەوە بەکار دەهێنا و لەو هەمان کاتیشدا تۆپ هاوێژەرەکانیان خێرا نەبوون، فەرمانەکان داوایان دەکرد هێدی هێدی تیپە باشەکان بەرەو رۆژهەلات بنێردرێن و تیپە ناچالاکەکان ئەوانەی کە مەشقێکی کەمیان کردبوو شوێنی ئەوان بگرێتەوە، لەمەش زیاتر تیپەکانی زرێپۆش و پیادە لە رۆژهەلاتەوە بگوازرێنەوە بۆ رۆژئاوا و مانەوەی بۆ ماوەیەکی کەم و دووبارە گەڕانەوەیان لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات. هەروەکو پێویست بوو بیر لەم جۆرە هەلۆیستانە بکرێتەوە بۆ

ئامـادەکردنی خەندەقـەکانی پشـتەوە و ئامادەکردنیـان بـە شـێوەیەکی باش، نموونەش لەسەر ئەم جەنگی جیهانی دووەم خەندەقەکانی پشتەوە بەتایبـەتی لـە رۆژئـاوا زۆر بـە شـێوەیەکی وورد دروسـتکرابوون، ئـەم خەندەقانەش جێگای زامنکردنی سەرکردە بـەرزەکانی ئـەڵمانیا بـوو لـە کاتی ئاڵوگۆڕکردنی هەڵوێستەکان، ئەگەرچـی هیتلـەر لەسـەر ئـەم جـۆرە بیر و بۆچوونانە کۆك نەبوو کە پێویست بـوون لـە رووی سـەربازییەوە لـە بەرەکانی جەنگ دروست بکرابایە..

بۆچوونی هیتلەر وابوو لـە کـاتی دروسـت کردنـی ئـەم جـۆرە خەندەقانـە مانای کشانەوەیە بۆ دواوە پـێش ئـەوەی هەڵـەکان لـە دەسـت دەرچـن و بەرگریەکی توند نەکرێ، هیتلەر هەر لە ساڵی ١٩٤٣ وە ئەم دروشمەی بۆ خۆی گوتۆتەوە ئەویش:

(لە جێگای خۆت جێگیر بەو،لەسەر یەك بستە خاکی خۆت سازش مەکـە)

. ئـەم جـۆرە مردنـەش بـە هـەموو روویـەك لـە رووەکـانی سـەرکردایەتی راستن، کە دەبێت پشت بە جووڵان و ماندووبوون ببەسترێت، لەبەرئەوەی رۆنشـتد و سـەرکردەکانی ئـەڵمانی دیکـە هـەر لەسـەر ئـەمجۆرە میراتـەی سەربازی مەشـقیان کردبوو. چـونکە دەسکەوتەکانی سـەربازی ئـەڵمانی پێشوو یان سەدەی هەژدەم بەرەو ژوور بـەهۆی لێوەشاوەیی و جووڵـەی ئەڵمان بە چـاوی گومانـەوە سـەیری ئـەمجۆرە پێشـنیارانەیان دەکـرد لـە دروسـتکردنی خەندەقـەکانی پشـتەوە وەك رێـو شـوێنێکی خۆپاراسـتن، چونکە لێرەدا دووبارە هۆکارێکی تر هەیە کە ئـەویش ترسـی هیتلـەرە لـە بـە فـیڕۆ چـوونی شـکۆداریان، کەواتـە خەنـدەقێکی تـری ئامـادەکراو لـە رۆژئـاوادا هەیـە، ئـەویش لـەو باوەڕەدایـە تـەنها دروسـتکردنی بەرگریـە دەبێتە هۆی لەدەسـت دانـی ناوبـانگی (کـە نابێـت چـۆك بـدەیت) کاتێك

هیتلەر لە ساڵی ١٩٤٠ لە وەدەستهێنانی پلەکانی سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، بۆیە لە ساڵی ١٩٤١ بەرەو ژوور رۆژئاوا ئامادەبێت بۆ بەرگریکردن، بەڵام خۆ ئامادەکردن بۆ بەرگریکردن تاکو ساڵی ١٩٤١لە ئامادەباشیدا نەبوو تا دەگاتە سەرەتای ساڵی ١٩٤٢. ئەگەرچی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤١ دەستیکرد بە خۆئامادەکردنی بەرگرییەکانی بەڵام بە لێکدانەوەی ئەوان دەتوانرا لە رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٤٤ بەرگری بکرێ، هەروەها ئەو شەڕەی کە بەڕێوە بوو ئاسان دەبوو، وا نەبێت هیتلەر گرنگییەکی زۆری بە بەرگریەکانی دەشتایی نەدابێت، بەڵکو پێی وابوو خەندەقە ئامادەکراوەکانی لە شیش و چەمەنتۆ بە تەنیا دەتوانن خۆ ڕابگرن و بەرگری بۆردومانەکانی ئاسمانی و تۆپە قورسەکان و هێرشی زرێپۆشەکان بگرێت، بەڵام دەبێت ئەمە تێبگەین کە زەحمەتە هیچ دەوڵەتێك لە جیهاندا هەبێت بتوانێت جۆرە خەندەقێك بە درێژایی هەزاران میل دروست بکات... دەبێت ئەو قەڵابەندیە خراپانە بە وردی و لە قوڵایی زەویدا بە رێك و پێکی ئەنجام بدرێن، بەڵکو هەموو کاتێك دەبێت گرنگی پی بدرێت بۆئەوەی لە گۆڕەپانی جەنگدا بە خێرایی ئەنجام بدرێن، بە هێزکردن و چاککردنیش بە چەمەنتۆ و ئاسن دەبێت بەس. چونکە تا ئێستاش فەرمانی زانیاری و لێکۆڵینەوە لەسەر خەندەقەکانی بەرگریکردن زۆر دواکەوتووە، دوای تێپەڕبوونی کاتێکی گونجاویش خەندەق تۆپەکانی کەنار بە شێوەیەکی گشتی هەر خراپ بوون، کە لەڕاستیدا تۆپەکان کۆڵەگەی پشتی بەرگریکردن بوون. لەبەرئەوە دەبێت هەمانگیەك لەلایەن یەك سەرکردەوە هەبێت، هەروەکو لە پێشوودا قسە دەربارەی بەکارهێنانی تۆپەکان لە نێوان سوپا و هێزەکانی دەریایی. سەرکردەی تۆپەکان لە بارەگای رۆنشتد خەباتێکی

زۆری دەکرد بۆ لەناو بردنی کێشەکان کە کۆتاییان نەبوو، چونکە هێزی دەریایی هەر لە کۆنەوە باوەڕی وابوو کە ئەو زانیاریەکی زۆری هەیە لە بەکارهێنانی تۆپەکان، ئەگەرچی زانیاریەکانی ئەو دەربارەی بەکارهێنانی تۆپەکان وابوو لە جەنگی دەریایی، بەڵکو بۆ خەریککردنی نیشانەکانی دەریایی خێرا و ماوەی دوور و مامناوەندی بوو، بەڵام پیادە ئەمجۆرە زانیارانەی نەبوو، باشتروابوو راستەوخۆ دوژمن لە کەناری ئاوەکان خەریك بکات، بەتایبەتی ئەو دوژمنانەی کە دادەبەزین، بۆ ئاسانکاری دەبووایە ئەرکەکان بەم شێوەیە دابەشبکرایە.

١- بەتاریەی کەنار : کە سەر بە هێزی دەریایی بێت و ئەرکەکانی سەرەکیشی خەریککردنی ئەو ئامانجانەیە کە لە دەریاوە دوورن.

٢- بەتاریەی کەنار ئەوانەی ماوەی تۆپەکانیان کەمە لە دژی ئەو دوژمنانەدا بەکاردێت کە لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە. بەڵام هیوای بەیەك گەیشتن دەربارەی دیاریکردنی ئەرکەکان زۆر بی هێز بوو لەبەیەك گەیشتنی بیر و رای هەردوولا دەربارەی بەکارهێنانی تۆپەکان، دوای ئەوەی راسپاردەی فوهرەری ژمارە ٤٠ ی بلاوکردەوە کە لە ئاستی ئەو هێزانەدا نەبوو تاکو رۆنشتد بتوانی بڕیارێکی ئازایانە بدا، لەبەرئەوەی هێزەکانی دەریایی کە سەرکردایەتی دەکرد، لە هێڵێکی تووندا بوو لەگەڵ هیتلەر و لەژێر کاریگەرییەکی بە هێزتری سوپادا بوو. ساڵی١٩٤٣ هیتلەر لە ئەنجامی کارتێکردنی پێشنیاری سەربازە تۆپ هاوێژەکانی دەریایی فەرمانەکانی دەرکرد و کەوتە ژێر کاریگەری بیر و باوەڕەکانی و پاڵینا بۆ چاککردنێکی گەورە بە دانانی ژمارەیەکی زۆر لە بەتاریەکانی کەنار لە نێو خەندەقە چاکەکان، ئەنجامی ئەمەش چونکە بەتاریە نوێیەکان گرنگییەکی گەورە و دیاریکراوی بە سوودیان لە جولانەوە

دەبێت.لێرەدا نموونەی بەتاریەکانی عەیار ١٧ سم دوور هاوێژیان ١٨ میل دەبێت بۆ هانا هاتن و بە دەستهێنانی لەسەر کاریگەری ئاگری تەواو، چونکە لە بەندینخانەیەك بەند کراوە کە دەبێت لە ئاسن و چیمەنتۆ دروستکرابێت.هەر لەبەر رووناکییەکانی داگیر کردندا کە سالّی ١٩٤٢ لە دبیب روویاندا پێویستە چەند شتێکی رۆنشتد و هەندێك لە سەرکردەکانی وەك خۆی روون بکەینەوە کە دژی لە گۆڕنانی چەکەکان بوون لە ئەو تۆپەڵانەی کە لە ئاسن و چەمەنتۆ دروست کرابوون چونکە ئەو چەکانە دەبووایە لە نێو ئەو خەندەقانە کاربکات و بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە و بەرەو هەر لایەك کە پێویست بێت، یان دژی ئەو دوژمنانە بەکاربهاتایە کە چەند هەزار یاردەیەك لەبەرەی جەنگدا دوور بوون، لەمەش زیاتر بەکارهێنانی بوو لە دابەزینی دوژمن بۆ کەنارەکان، دەتوانین دەرەنجامی ناخۆشییەکانی کە بەسەر تۆپهاوێژەکاندا روویاندا بەمجۆرە بوو :

لە سالّی ١٩٤٣ لە ناوچەی رۆنشتد نزیکەی ١٤٠ بەتاریەی کەنار لە یەکەکانی سوپادا لە نێو خەندەقە باش و هەمیشەییەکاندا هەبوو، زۆربەی ئەم بەتاریانەش عەیارەکانیان لە نێوان ٥-١٠ سم بوو کە دەستکردی ئەڵمانیا بوو، لەوانەش ئەو تۆپانە فەڕەنسی و پۆڵەندی و چیکوسلۆڤاکی بوو کە لە شەڕدا دەستیان بەسەردا گیرابوو، هەروەها تۆپەکانی رووسیا بوو کە عەیارەکەی لە نێوان ١٢-١٠ سم بوو، لەگەڵ تۆپەکانی فەڕەنسا کە عەیارەکەیان لە نێوان ١٥-٢٢ سم بوو، بەڵام تۆپە نزیك هاوێژەکان و هەندێك لە جۆرەکانی دیکەی تۆپەکان لە (٣٤٠) تۆپ پێکهاتبوو کە عەیارەکەیان لە ٢-١٥ سم بوو کەهی زۆربەی نەتەوەکان بوون، زۆربەی ئامێری راکێشانەکانیان کۆن بوون، بۆ ئەم تۆپانەش ناخۆش بوو بۆ خەریکردنی نیشانەکانی جووڵاوە لە شەودا، بەڵام

هێزەکانی دەریایی لەلای دووەم و باشترین تۆپی نوێیان هەبوو کە باشترین ئامێری نیشانە پێکانیان هەبوو. بۆیە رۆنشتد هەموو کات بەمجۆرە تەنگەژانە خەریکبوو، بۆیە دەستە و وەستان بوو لەسەر زاڵبوونی بەسەر هەڵوێستەکان، چونکە زۆربەی بڕیارەکان بۆ ئەو کەسانە بوو کە دووربوون و کاریگەری زۆریان لە دەست و پێوەندەکانی هیتلەردا هەبوو، هەروەها دوو دڵ بوو لە پێدانی چەك و تەقەمەنی بەو کۆمەڵە نێو دەوڵەتییە.

جگە لە هێزەکانی ئاسمانی و تیپی تانکەکانی یەدەگ کە باشترین هێزبوون بۆ بەرگریکردن لە رۆژئاوا، ئەو تیپانەش هێزی گەورەی شەڕکردن بوون، زۆر لەبار بوون بۆ جووڵانەوە و لە توانایاندا هەبوو گەورەترین خزمەت بە هاوبەشی هێزی ئاسمانی پێشکەش بکەن. لیوای بەناوبانگ (کیرفن جوین بێرگ) بەسەرکردەی یەکەکانی تانك لە بارەگای رۆنشتد دامەزرێنرا، کە لەپێش جەنگدا پلەی پاشکۆی سەربازی هەبوو لە باڵوێزخانەی لەندەن، یەکێك بوو لە شارەزاکانی رۆنشتد دەربارەی ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ئامادەکردنی سەربازەکان و گواستنەوە و بەکارهێنانی زرێپۆشەکاندا هەبوو، ناوبراو کەسێکی لێهاتوو بیر و بۆچوونەکانی فراوان بوون، هیچ کاتێك بیر و بۆچوونی لەگەڵ رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی نەدەگونجا و کۆك نەبوون.

پێویستە بڕیارێك بدا کە کەس پێشبینی نەدەکرد ئەوەندە کاریگەری لەسەر هێزی ئاسمانی و جووڵانەوەی هێزەکانی گەورەدا هەبێت، لەدوای ساڵی ١٩٤٣، چونکە جەنگی هێزی ئاسمانی بەس ئەوکاتە دەستیپێکرد ! ! ئەگەر هاتوو لیوا فۆن جون بیرك تووشی پێکان هات، لەگەڵ ئەوەشدا بە تێڕوانینی رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی گرنگییەکی

زۆر بـه تیپـەکانی زرێپـۆش نادرێـت و دەبێتـە بەهانەیـەك بـۆ جوولـە پێکردنی، چونکە لەوێدا بەرەیەکی دەریایی بی شوومار هەبوو کە لە جەزیرەی (تسـل) درێـژ دەبـۆوە تـا دەگەیشـتە جەزیرەی (ئـەپرون) لەلایەکی ترەوە بەرەیەکی تر هەبوو کە لە فندرس درێژ دەبێتەوە تـا دەگاتە منتون، بۆیە دوژمن لە توانایدا هەبوو لەهەر شوێنێك لەو شوێنانە هێزەکانی ئاسمانی بێتە خوارەوە.

گومان لەوەدا نەبوو کە هێزی زرێپۆشەکان ئامادە بوون بەرگری لەو شوێنانەدا بکەن کە لەوانە بوو هێزەکانی دوژمن لە ئاسمانەوە تیایدا دابەزن. بەلام ئەگەری زۆری هەیە کەوا لە مرۆڤ دەکات کە دەستە وەستان بێت بەرامبەر دابەزینی دوژمن کە پێویست بوو لەو شوێنانەدا دابەزن !

کاتێك پێکهاتەی زرێپۆشەکان ئاگادار دەکرێتەوە بۆئەوەی بەخێرایی بجوولێن و بۆ ئەو ناوچەیەی هەڕەشەی لەسەرە لە ئەنجامی بالا دەستی هێزەکانی ئاسمانی دوژمن، ئەوکاتە نرخی زرێپۆشەکان لە رووی ئامادەکردنەوە کورت دەبێتەوە بەس.

لێرەدا پیچویستە ئاماژە بۆ لێکدانەوەکانی المارشال (سیریل) بکەین کە سەرکردەی گشتی کەشتی گەلی ئاسمان بوو، ئەو پێی وابوو فریاکەوتنە گرنگەکان لەکاتی روودانی جەنگدا بوو لەو پۆلانەی کە پێویست بوون لە بەرەیەکی جەنگەوە بگوازرێتەوە بۆ بەرەی جەنگی رۆژئاوا ئەگەر پێویست بووایە.

لە سالی ١٩٤٣ نەتوانرا سەرکەوتنی ئاسمانی دابین بکەن، ئەگەچی هێزێکی ئاسمانی تەواو هەبوو بۆ گواستنەوەی سەربازە دیاریکراوەکانی

یەکەکانی زرێپۆشەکان. رۆنشتد (سبیریل) لە ساڵی ١٩٤٣ دەیزانی ئەو پەیمانەی کە دابووی بۆ گەیاندنی پێداویستیەکان لە ساڵی ١٩٤٤ نەگەیشتن لەبەرئەوەی هەڵوێستەکان لەوێدا لە گەشەسەندندا بوون.

دووبارە دەگەڕێمەوە سەر پێناسە جیاوازیەکانی نێوان بیر و باوەڕە هەمە جۆرەکان، لەوکاتەی دەمەوێ چارەسەری بەکارهێنانی یەکەکانی سوپا (ب) بە سەرکردایەتی رومل لە ساڵی ١٩٤٤ بکەم، لێرەدا بەوەندە واز دەهێنم کە تەنها بە دڵنیاییەوە کەوا بیر و بۆچوونی رۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی وایاندەزانی کەوا هێزەکانی زرێپۆشە یەدەگەکان بۆ هەڵوێستە ترسناکەکان زۆر پێویستن، بەڵام سەرکردەی بەرپرسی ناوچە فراوانەکانی بەرەی رۆژئاوا پێویستە لەسەری کەوا هێزە یەدەگەکان لە ژێر فەرمانیدا بێت، هەروەها بۆی هەیە هەر کاتێك بیەوێت بەکاریان بهێنێت بە گوێرەی هەڵوێستە گشتییەکان، بە بێ بوونی ئەم یەدەگانەش بەرگرییەکی سەرکەوتوو مەیسەر نابێت !!.....

سەرەڕای کاریگەری یەکلاکەرەوەکەی هێزی ئاسمانی لە جەنگدا، بە تەنهایی ناتوانێت بەتەنیا سەرکەوتن لە شەڕەکەدا بەدەست بهێنێ، لەبەرئەوەی هەردەم پێویستی بە هێزی پیادە دەبێت بە تایبەتی هێزی زرێپۆش، بۆیە نابێت رۆڵی هێزی پیادە فەرامۆش بکری و دەبێت مەشقێکی زۆر باشیانهەبێت و لەسەر هەموو جۆرە چەکێکیش رابهێنرێن، چونکە تاکو ئێستاش ناتوانری پشت لە هێزی پیادە بکرێ لە جەنگدا ببێتە ئامێرێکی سەردەمانە، وە راهێنانێکی ورد رابهێنرێن و بە چەکی سەردەمانە پڕ چەك بکرێن، رۆنشتد پێی لەسەر ئەمە دادەگرت و بەبێ دوو دڵی. ساڵی ١٩٤٣ خاڵی وەچەرخانی سەربازیی گەورە بوو، شەڕی وێرانکاری ساڵی ١٩٣٩-١٩٤١ بەسەرچوو و سەردەمی هێرشەکانی بە

دوای راکێشا لە بەرەی رۆژهەلات و باکووری ئەفریقیا، خالی تەوەرەی ناوەڕاست رقیان هەستا بەتایبەتی یابان لەسەر بەرگریکردن پاش ئەوەی ئابلوقە دران. لە سالی ١٩٤٣ —بەرەنگاربوونەوەی گەورە لە هاوپەیمانان دەستیپێکرد بەرامبەر تەوەر و شەڕی ئاسمانی لەسەر ئەوروپای ناوەڕاست، جگە لە هەلسانی هێزی هاوپەیمانانی ئاسمانی بۆ گرژداچوونەوەی رۆژئاوا بۆ پێکهێنانی هێزێکی بی شومار لە فڕۆکەی ئەمریکی و بەریتانییەکان، کە بەردەوامبوون لەسەر چالاکیەکانیان بی کۆلنەدان بەسەدان لەو تەیرە زیویانە لە بالای ئاسماندا دەسوڕانەوە بە پێکهاتەی لێک نزیک ئەوا کاریگەری هەبوو لەسەر دەروون، جگە لە راماڵینی دەشتەکان بە بوردومانکردنی هێزەکانی ئاسمانی بۆ پێکانی فڕۆکەخانەی و شەمەندەفەر لەولاشەوە بۆردومانێکی ترسناك و ناڕەحەت پێ بە پێ لە زیادبووندا بوو بە شێوەیەکی گشتی نیشانە سەرەکییەکانی وەك ئامێری مەکینە و ئەو ئامێرانە بوون کە وەستا بوون و لە جوولە دابوون. ئەو هەموو جۆرە هێرشانەش رۆژ لەدوای رۆژ زیادیان دەکرد، رۆنشتد بەسەر پیادەکانی هێلی ئاسنی فەڕەنسی دا هەلدەگوت و بەتایبەتی ئەوانەی بەردەوامبوون لەسەر جێبەجێکردنی ئەرکەکانی خۆیان، سەرباری ئەو هەموو زەرەر و زیانانەی کە بەردەوامبوو، هەر لەبەر ئەمەش رۆنشتد دیاری تایبەتی پێبەخشین لەوەش زیاتر بڕیارێکی دەرکرد بە ئازادکردنی خزم و کەسی ئەم کرێکارانە ئەوا لە جەنگدا لەلایەن ئەلمانییەکانەوە دەست بەسەر کرابوون لەسالی ١٩٤٠ وەك رێزلێنانێك بۆ ئەوان.کاتێك هێرشە ئاسمانییەکان توند و تیژتر بوون رۆنشتد پێشبینی لەوە کرد کە ئەمە سەرەتای دەست پێکردنی داگیرکەرانە لەلایەن هاوپەیمانانەوە. بووردومانەکانیش زیاتر لەسەر شارە

پیشەسازییەکان هێڵی بەیەك گەیشتنیان بوو، نەوەك لەسەر داترازانی ویستی ئەڵمانیا بۆ بەرگریکردن. بەڵکو هەوڵیدەدا بۆ بەدەست هێنانی پڕوپاگەندە لە نێو پێکهاتەکانی هێڵی ئاسنیندا، هێرشکردنی راستەقینە لە سەرەتا هێندە ئاسان نەبوو بۆ سەر قەڵای ئەوروپی ناوەڕاست گەرهاتوو لاوازی بەردەست نەبێت، لە ئەنجامی شەڕی ئاسمانی وەلەسەر هەموو پێکهاتەکان وا پێویست بوو لە رۆژئاوا پارێزگاری لە تۆماری هێرشەکانی ئاسمانی بکەن بە دیاریکردنی کەی و لەکوێ روویدا بووردومانە ئاسمانییەکە،ئەمەش دیاری بکرێ لەسەر نەخشە تایبەتییەکان بۆ بەدەست هێنانی وێنەیەکی روون لە بۆردومانکردنی قورسەکان کەوا هاوپەیمانەکان گەرەکیان بوو لەگەڵ کەشتییەکانی ئاسمانی ئەڵمانی سێیەم سالّی ١٩٤٣، هێزەکانی زۆر لە کورتیدا و کورتیەکی بەرچاو، هەروەها دوژمن هێشتا نەیتوانیوە گەورەیی هێزی ئاسمانی بەدەست بهێنێ، هەروەها فڕۆکەخانەکانی فڕۆکە جەنگیەکان نزیکبوون لە کەنار هێواش هێواش بەرەو کورتی دەڕۆیشت، لەبەرئەوە وا پێویست بوو کە فڕۆکەکان بگوازێتەوە بۆ شوێنە دوورەکانی پشتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنی ئەو فڕۆکە شەرکەرانە رقیان هەبوو لەوەی کە بچنە ناو قوڵایی خاکی فەرەنسا، بۆیە چالاکیەکانی ئاسمانی لە کەنار بەرەو کزی چوو، تۆپە دژە ئاسمانییەکانی عەیار ٨سم و عەیار ٨٨ ملیمەترەکانی ئەوا بەریتانییەکان دەیانهاویشت و دەستە وەستان بوو بۆئەوەی بگات بە بۆمبەکانی پێکهاتەکانی کەوا لە پێشتر بەرزتر دەفڕین. هەروەها تۆپە دژە عەیار ٨ و ١٢ سم نەیاندەتوانی ئاسانکاری بەرپا بکەن مەگەر بە شێوازێکی کەم نەبێت. کەشتی گەلە بچووکەکان زۆر لێهاتوو و وشیاربوون بەڵام سەرکەوتنی کەشتیە ژێر ئاوەکان لەگەڵ

بەسەرچوونی ساڵ لە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرەو نەمان چوون، بۆیە ئەڵمانیا ناچار کرا لەسەر بەرگریکردن لەخۆ لە ڕێگای دەریاوە هەر لەو کاتیشدا بەمانای وشە هیچ کەشتی گەلێك نەما.

چالاکیەکانی کەشتی گەلی ناوچەی دەریای ڕۆژئاوا لە کەمیدا بوو بۆ بەرگکریکردنی لە کاروان و لە کەناری دەریاییە نزمەکان و کۆکردنەوەی زانیاری دیاریکراوی سنووردار، ئەو کاروانانەش مادەی خامیان لە ئیسپانیاوە دەهێنا کە هەندێ لەو مادانە لە ئەڵمانیا کەمبوو، لەسەر ئەو کاروانانەش پێویست بوو کە قۆناغ بە قۆناغ لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی تر بڕۆن تا دەگاتە هۆڵەندە، چونکە ئەو کاروانانە هەموو کاتیچك لەو خاڵە نیشانکرانەبوون کە هێرشیان دەکرایە سەر لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانی ڕۆژئاوا لەڕێی ئاسمانی و دەریایی. بۆیە پێکهاتەی ئەو ژمارە کەمەی کەشتیە بچووکانەی کەوتبوونە دەریای ڕۆژئاوا، ئەرکەکانی خۆیان بەجێهێشت و خۆیان یەکلایی کردەوە بۆ بەرگریکردن لەم کاروانانە !

ئەو کەشتیە باشانەی ژێر ئاوەکان کە چەندان هێرشیان دەکردە سەر کەشتیەکانی دوژمن و ئەم هێرشانەش بەشێوەیەکی گشتی وەکو ئیشی لێدانی دەرزی وابوو لەسەریان هێندە کاریگەری هەبوو، هەروەها کە نەیاندەتوانی زانیاری تەواو بەرفرەوانی دەریایی وەربگرن مەگەر لەسەر شوێنێکی دیاریکراو نەبێت لەبەر نەبوونی ژمارەیەکی کەم بۆ ئەم کارە.

ئەو کەشتیانەی کە گەڕانەوەش کەوتنە ژێر چاودێریەکی تایبەتیەوە، لەدوای گەڕانەوەشیان بۆ بارەگاکانی لە (بورد) و لە (الاروشل) یان (نازیر) یاخود هەر بارەگایەکی تر کە تیایدا دەمانەوە و کەشتییەکانیان

تیادا پاك دەكردەوە و پشووشیان لەوی دەدا، كەشتیە ژێر ئاوەكانی ئیتالی و یابانیش ناوە ناوە ئەم شێوازەیان پەیڕەو دەكرد !!

دەریایەكە كەشتیەكی كەمی هەبوو لەگەڵ كەسێكی زۆر كە بەكاردەهێنران بۆ تۆپ هاوێشتن و بەرگریكردنی لەزەوی، ئەوەش فەرمانێك بوو كە دەرباز بوونیان نەبوو، ئەنجامیش هێزەكانی دەریایی هەستان بە جێبەجێكردنی ئەركەكان لە جیاتی سوپاكانی كەنار، ئەگەرچی هێزەكانی دەریایی گەورە بوون هەروەكو لە جەنگی یەكەمی جیهانییش گەورەبوو، چونكە بەرگریكردن لە كەنارەكان مەسەلەیەكی سەرەكی بوون كەواتە ئێستاكە ئەركەكان بە شێوەیەكی هەڵە جێبەجی دەكران. ئەو دابەزینەی كەنار دیمەنێكی سەرسوڕهێنەری بەخۆیەوە بینی، هیتلەر زۆر حەزی لە قەڵابەندی دەكرد،وشەی قەڵا كاریگەری زۆری هەبوو لەسەربیر و باوەڕ و دڵنیایی هیتلەر، بەڵام ئەو وشەیە هەمان كاریگەری نەبوو لەسەر رۆنشتد، بۆیە گرنگیەكی زۆر كەمی پێدا، بەرزبوونەوەش بۆ پلەی قەڵات كە ئێمە بە گاڵتەجاریەوە لە بارەگای رۆنشتدەوە ئەم باسەمان دەكرد، چونكە لە راستیدا هیچ سوودێكی بۆ ئێمە نەبوو، هیتلەر هەوڵ و تێكۆشان و كاتێكی زۆری بەفیڕۆدا بۆ بەردەوامبوون لە دروستكردنی قەڵاتەكان، رۆنشتد زۆر بە دڵنیاییەوە دەیزانی كە دوژمن هێندە گێل نییە كەوا هەڵبكوتێتە سەر ئەم قەڵاتانە بە شێوازێكی راستەوخۆ لە دەریاوە، لەبەرئەوەی دەیتوانی زۆر بە ئاسانی دەستیان بەسەردا بگرێت گەر لە رێگای كەنارەوە لە دەرەوەی ناوچەی قەڵا بێت، چونكە خاڵی بێهێزی دوایی كەوتبووە پشت قەڵاتەكان لە رووی وشكانییەوە، چونكە خاڵی بێهێزی قەڵاتەكە كەوتبووە لای

وشكانييەكەی هەروەكو چەند جارێك دوژمن لە ساڵی ١٩٤٣ ئـەم لایەنـەی بەكارهێنا بەهۆی پێگە پەرەشوتەكانەوە.

لەكوێوە دەتوانین بەرگری مسۆگەر بكەین لە ناوچەی قەڵاتەكان ؟

بەڕاستی پێویست بوو تیپێك یان دوو تیپ لە قەڵاتـە گـەورەكان هـەبێت، لەگەڵ تیپێك لە قەڵاتە بچووكەكان، بەڵام ڕۆنشـتد زۆر سـوور بـوو لەسـەر بـاوەڕ هێنـان بـە بـەرگریكردنێكی لاواز بـۆ ئاسـانكاری كـەوا لـە چـەند كۆمەڵێك پێكهاتبوو كـە لای ئـەو بـوو. هـەروەها تۆپـەكانی بـەرگریش لـە بەرەیەكی بەرفراواندا كەمبوو، لەبەرئەوەی لـە نزیكـەی هـەموو بەتاریـەی تۆپ هاوێژەكان لەناو خەندەقە پەنا دراوەكان جێگیر ببوون، لەسـەر ئـەو بنەمایەی كە دەتـوانن بوردومانـەكانیان بـەرەو كـەنارەكان بتـەقێنن، بـی ئـەوەی گۆڕانكـاری لــە شـوێنەكانیان هــەبێت و ئاڕاســتەكانیان بــەرەو وشـكانی بێـت. ئـەم دابەزینـەش بـووە هـۆی دڵەڕاوكێیـەكی گـەورە بـۆ سەركردە رۆژئاواییەكان. ئەگەرچی لەساڵی ١٩٤٤ دۆخەكان چـاك نـەبوون بەوەی كەوا هیتلەر هەندێك ئەفسەری باوەڕ پێكراوی دامەزرانـد و هـەموو جۆرە متمانەیەكی پی هەبوون، بە پلـەی فـەرمانی دابـەزین، لەسـەر ئـەم كەسانەش پێویست بوو سوێند بخۆن بە نووسراوێكی فەرمی كەوا بەرگری لـەم قەڵاتـە دەكـەن ئەگـەر بەهـەر نرخێـك بێـت، ئـەم سـوێند خواردنـە نووسراوەش بۆ هیتلەر رەوانـە دەكـرا، ئەگەرچـی ئـەو كەسـانە یەكەیـەك بـوون پێویسـتیان نـەبوو كـە بتـوانن پارێزگـاری لـە قەڵاتـەكان بكـەن، قەڵاتــەكانیش تــەنها چــەند باڵاخانەیــەكی ناتــەواو بــوون، بـەپێی ئـەو فەرمانەش كە تەنها مافی جووڵانەوەیان لەناو قەڵاتەكەدا هەبوو، هـەروەها بیر و رای دەریاوانەكانیش وابوو كەوا بەرگری لەو قەڵاتە بكـەن، فـەرمانی ئــەو قەڵاتــەش دەســتەڵاتێكی كاریگــەری بەســەر هێزەكــانی و هێــزە

ئاسمانەکانەوە نەبوو، بەڵام لەسەر بەشەکانی تر هەیبوو، گەر زۆر پێویستی بکردبایە بۆ سزادانی کەسانی دەریاوان و هێزی ئاسمانی لە قەڵات کە نەیاندەتوانی بەتەنها بەیارمەتی دەستەڵاتی دادوەری هێزی دەریایی و هێزی ئاسمانییەوە جێبەجێ بکرابایە. هەر لەبەرئەوە ئەم فەرمانە لاوازەش هەموو کاتێك هەڕەشەی ترسناکی لە دادگا سەربازیەکانییەوە ئاڕاستە دەکرا، لەبەر بێهێزی ناو ئەم قەڵاتە یەکەیەکی ئاگادارکردنەوە دامەزرێنراو کەسانی سەربەو یەکەیەش زۆربەی زۆریان کرێکار و مەدەنی بوون لە جل و بەرگی سەربازیدا!!

بە هیچ شێوازێك کار لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا نەدەکرا ئەوەش کەوا لە ساڵی ١٩٤٤ ئەم راستیە بە دیار کەوت، رۆنشتد هەڵسا بە پێداچوونەوەیەك بە شێوازی راپۆرتێکی تەواوی بی پەردەیی و بەرپرسەکان ئاگادارکرانەوە لە سەختی هەڵوێستەکان و بە لێبوردنەوە کە ناتوانی بەسەریاندا زاڵبێ، بەڵام بێ سوود بوو، لێرەدا بە چاکی دەزانین کە تێبینییەك باس بکەین کە پەیوەندە بە نێوان هیتلەر و بیتان. هیتلەر پاش داگیرکردنی باشووری فەڕەنسا نامەیەکی درێژی تایبەتی بۆ مارشاڵ بیتان نارد تیایدا باسی ئەو هۆیانەی کردبوو کە وای لێکرد فەڕەنسا بە تەواوی بگری، بەم رستەی خوارەوەش کۆتایی پێهێنا کە دەڵێ : (ئەی مارشاڵ گەر هەر داخوازی و تەنگ و چەلەمەیەکت هەیە لەلای مارشاڵ فۆن رۆنشتد باسی بکە) سەیر لەوەدایە هیچ یەکێك لەو نامانە نەگەیشتنە دەستی رۆنشتد. وا روویدا لە ساڵی ١٩٤٢ بەرێکەوت یەکێك لە فەرمانبەرانی ئەڵمانی باسی نامەکەی رۆنشتد دەکا کاتێك کەوا ئاگاداری هەندێك زانیاری دەکردەوە، ئەم فەرمانبەرە سەری سوڕما لەوەی کەوا سەرکردایەتی رۆژئاوا هیچ شتێك دەربارەی ئەو نامەیە نازانی، وەکو

ئـەوەی کـە مارشـاڵ بیتـان داوا دەکـات بـە گـوێرەی نامەکـەی هیتلـەر دەبووایە بچێتە لای رۆنشتد بە سەردانێکی فەرمی، ئیتر هەر چۆنێك بێت ئەم سەردانە رووی نەدا، بەڵام دوای چەند رۆژێـك رۆنشـتد دانەیـەکی لـەم نامەیە بـە دەسـت گەیشـت، دەرئـەنجامی ئـەم نامەیـەی هیتلـەر لەسـاڵی ١٩٤٣، کەوا رۆنشتد لە پێشان زیاتر چاوی بە بیتان کەوتووە، لـە هـەمان کاتیشدا بوویتە هۆی گۆڕینەوەی بیر و ڕای ئـەم دوو پیـاوە بـەو کارانـەی کـە پێویسـت بـووە بـە سیاسـەتمەداران نـەوەك پیـاوانی سـوپا، گەرچـی رۆنشتد رقی لە سیاسەت دەبـۆوە بـەڵام رازیبـوو بـە گواسـتنەوەی نـاخی حەزەکانی بیتان بۆ هیتلەر لەگەڵ ئامۆژگاریەکانی بۆ راییکردنی هەرچەند کە پێویستی بووایە لەو پێناوەدا، دوای گەڕانەوەشـی بـۆ بارەگـای خـۆی هەموو خاڵەکانی رێك دەخست و بە شێوەی بروسکە بـۆ سـەرۆکی گشـتی سوپای ئەڵمانی دەنـارد، لیـوا بـارون (فـۆن نـیرون) کـە پلـەی ئەفسـەری پەیوەندییەکانی فیشی لە نێوان بیتان و رۆنشتد کـاری دەکـرد، وا دیـارە کـــەوا نامـــەگۆڕکی هـــەبووە لـــە نێـــوان پێنتـــان و رۆنشـــتد ســـەرەڕای ســـەردانەکانی، گەرچـــی باڵوێزخانـــەی ئـــەڵمانیا بـــەرپرس بـــوو لـــە سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەڵمانیا، زۆرجاریش وا روویدەدا زیادە رەوی لە ئەرکەکان دەکرا لە نێوان پیاوی سوپا و سیاسەت !!

کاتێـك کـە ئـەو دوو سـەرکردە سـەربازیەمان دێتـەوە یـاد لـە پـاریس و برۆکسـل کـە سـەرقاڵبوون بـە سیاسـەت هیتلـەر و گـەورە پیـاوانی حـزب سیاسەتێکی وایان پەیڕەو دەکرد کەوا هەموو دەستەڵاتدارەکانی خۆیـان دەخستە دوای خۆیـان، هـەروەکو دەزانـین چـەندی بـۆی کـرا بـەرگری لـە سیاسەتەکەی کرد، سەرباری ئەمەش بۆی نەبوو بە هـیچ شـێوەیەك کـەوا رێگر بێت لە دەرنەکەوتنی نوێنەرەکانی فـوهر لەسـەر شـانۆی سیاسـەت.

ئەو کەسانەش زۆربەی کات فەرمانبەری حزبی بوون و پلەی باڵایان هەبوو وە پاڵپشتیان لەلایەن هیتلەرەوە لێدەکرا، کە زۆر لە دەستەکانی ناوەخۆیی تر بەرزتر بوو. زۆر جاران ئەم فەرمانبەرانە دەستی دەستەڵاتی ناوەخۆییەکانیان دەبەستایەوە، لە رۆژئاواوەش داخوازیەکی پێویست هەبوو بۆ بەدوادا گەڕانێکی سەربازی لە وڵاتە هاوپەیمانەکان یاخود پاڵپشتەکان بۆ پشکنینی دیواری ئەتڵەسی، کە هیتلەر زۆر شانازی بەو دیوارەوە دەکرد، ئەم بە دواداچوونە سەربازیەش سەرکردەکان یەك لەدوای یەك سەرپەرشتیان دەکرد لە تورکیا و بولغاریا و هەنگاریا و فنلەندا و رۆمانیا و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و ئەوانی تر..... ئەو ناوبانگیەی رۆنشتدی نێو دەوڵەتی وای لە خەڵکە مێوانەکان کرد کە بێن لە نزیکەوە ببیینن و گەر بۆیان کرا بتوانن گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، پەیوەندی تەلەفۆنی بوو بە شتێکی ئاسایی لە نێوان بارەگای رۆنشتد و ئەو کەسە بەڕێزانەی کە ئارەزوویان دەکرد و لەسەر منیش وا پێویست بوو ئەم ئارەزووانە بە شێوەیەکی دیبلۆماسی بگەیەنم بە رۆنشتد، بەڵام لەکاتی هاتنە ژوورەوەی میوانەکان سۆزێکی زۆر رووبەڕوویان دەبۆوە لەو پێشوازییە گەرمەی کە رۆنشتد لێی دەکردن بە خوو رەوشتێکی سۆزانە، کە هەموو پێی دڵخۆش دەبوون، گفتوگۆکانی بە ئەڵمانی و فەڕەنسی ئەنجامدەدا لە هەموو سەردانەکان خواردنیان پێشکەش دەکرد و هەردەم کاتی سەردانەکانیش تەنها یەك کاتژمێر بوو. لە دوای نیوەڕۆ، رۆنشتد گەر وەکو پێویست نەبووایە شتێکی وای نەدەخوارد وەکو باسبکرێ، بە خێرایی هەر لەدوای نان خواردنەکە دەڕۆیشت زۆر جارانیش لە خواردنەکانی ئێوارە ئامادە نەدەبوو، دەتوانین ئاماژە بەم چیرۆکە بکەین (سەرۆکی نێردراوی تورکی بە پلەی لیوا دوای نان خواردن دەستی بە

قسان کرد و بەردەوامبوو لەسەر ئازایەتی سوپای تورکی گەورە لە ساڵی ١٩٣٠، ئەوەی کە تێبینیمان کرد، هەرچەند پیاهەڵدانەکان زیاتر دەبوون، ئـەوا رۆنشـتد هێـواش هێـواش تەنگـەتاوتر دەبـوو. کاتێـك لـە درێـژەی قسـەکاندا بـوو، رۆنشـتد هەڵسـاوە سـەر پـێ و بـە بـەرداخ لـە مێزەکـەی پێشەخۆیدا و گوتی (بەڕێزان بابخۆینەوە لەسەر شەرەفی وڵاتـی تورکیـا و گەلی تورکیـا و سـوپا ئازاکـەی) میوانـەکانیش بـە کـۆڵ یادگـاری لەسـەر کەسایەتی و کاریگـەرەکان لەسـەر هـەڵس و کەوتـەکانی پەروەردایـەتی و ناوبانگی سەرکردەی نێو دەوڵەتی، زۆر بە ئاسانیش دەیتوانی کاریگـەری خۆی لەسەر مرۆڤەکان جێبهێڵێت.

## بەشی دەیەم

### ماندووبوونەکانی بە فیڕۆچوو

بەهاری ساڵی ١٩٤٣ ڕۆنشتد بۆماوەی سی هەفتە پشووی وەرگرت و لە شاری بادتولز بەسەربرد، ئەو کاتە هیتلەر لە (برخستکادن) بوو ئەم دەرفەتەی قۆزتەوە بۆ بانگهێشتنی ڕۆنشتد بۆ بارەگای خۆی بەر لەوەی پشووەکەی تەواوبێت و بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژئاوا، ڕۆنشتد لە کاتی پشوودا جل و بەرگی مەدەنی لەبەردەکرد، هەروەها خەڵك دڵخۆش بوون بە ناردنی ئەو ئۆتۆمبێلەی کە هیتلەر بە پاسەوانەکان بەدوای ڕۆنشتدی دانارد کە تاوەکو بیهێنێت بۆ بارەگای هیتلەر، سروشتی خەڵکەکەش وایان پێخۆش بوو کە ڕۆنشتد لەناو بەرگی سەربازیدا ببینن، کاتێك خەریکی سواربوونی ئۆتۆمبێل بوو خێزانەکەی پێی وت سەیرکە خەڵك چەندە تامەزرۆی بینینی تۆیە، ڕۆنشتد وەڵامی دایەوە گوتی ئا ئەوانە لە پێناو من نەوەستاون بەڵکو چاوەڕێی پاس دەکەن، سەرۆکی دەستەی ئەرکانی ڕۆژئاوا، سەرۆکی هۆبەی جووڵەکردنی مارشاڵی باوەڕپێکراوی (زمرمان) ڕەوانەکرد بۆ یادتولز بۆئەوەی ڕۆنشتد لەگەڵ هیتلەر بدوێ سەبارەت بە هەڵوێستە ترسناکەکان لە ڕۆژئاوا هیتلەریش وا لێی هاتبوو لەبەرپەچدانەوەی بابەتە سەخلەتدارەکان. بۆیە لەسەر بابەتی ترەوە قسەی دەکرد، لێرەدا گەورەیی هیتلەر زیاتر ڕەنگی دەدایەوە و بە وتەکانی بەوەی کە بیری لێدەکردەوە لە ڕووبەڕووبوونەوە گەورەکانی ڕۆژهەڵات، ئەم وشەیەش هێمایەك بوو بۆ قەڵات کە باشترین تیپ بەشداریان تێدا دەکرد، هەروەها باوەڕێکی پتەوی بە زرێپۆشە سەردەمیەکان هەبوو، کە ئاواتەخواز بوو بەلایەنی کەم ٩٠ تیپی ڕووسی

لەناو ببات، ئەم هێرشەش لە رووی (بایل کرود) دەگەیەنرا، هیتلەر زیاتر ترسی لە هەڵوێستی سیاسی ئیتاڵیا هەبوو پێشبینی دەکرد لە داهاتوویەکی نزیک بڕوخێ. لەو کاتەی ئیتاڵییەکان بچنە پاڵ هاوپەیمانەکان گەر ئەمەش روویدا دەبێت سوپای چوارەمی ئیتاڵی لە چەك دابماڵدرێت و مۆڵگەکانی بدرێتەوە دەست ئەڵمانییەکان بۆئەوەی کەوا رۆنشتد لە قسە بوەستێنی هیتلەر کۆتایی بە قسەکانی هێناو لەناکاو خودا حافیزی لە رۆنشتد کرد و گەڕایەوە بۆ پاریس بێ ئەوەی ویستەکانی بەدەست بێنێت، سەرۆکی بەشی جووڵە مارشاڵ زمرمان لە یادگارییەکانیدا نووسیویەتی دەڵێ :

(ئێمە باوەڕمان وابوو هیتلەر بەبێ پچڕان قسەی کردبێت، نەوەکو لەلایەن مارشاڵ رۆنشتدەوە گوێی لە شتێك بێت کە بەدڵی نەبێت، لەبەرئەوە رۆنشتد بڕیاریدا کەوا راپۆرتێکی درێژ و بێ پەردە لەسەر هەڵوێستی رۆژئاوا ئامادە بکات، کە دامەزرابێت لەسەر هەندێك راستی کە هیچ شك و گومانێکی تێدا نەبێت، بۆئەوەی سەرکردەی باڵا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، ئەم راپۆرتەش لە بەهاری ساڵی ١٩٤٣ نووسیویەتی جێگای تێڕامانی هەمووان بوو، هەر لە دەستپێکردنی هێرشەکانی هاوپەیمانان لە حوزەیرانی ساڵ ١٩١٤، ئەمەش لای رۆنشتد شتێکی روون بوو کە لەلایەن هاوپەیمانانی رۆژئاوا ساڵی ١٩٤٣ هێرشی دەکرێتە سەر، بۆیە دوو دڵ بوو لە هەڵوێستی هێزی بارەگاوە لە راستیا کەناری ئەورووپی رۆژئاوایی لە رۆژئاوا و باشوور بەرگری لێ نەدەکردن لەبەرئەوەی پارێزراو بوو، بە درێژایی شەڕگەکان زۆر گوێی نەدەدا بەیەکە دوورەکان کە دەستبەسەر دەکران. چونکە ئەورووپای ناوەڕاست بوو بە قەڵایەك، بەڵام ئەو قەڵایە قایم و پتەو نەبوو و هێزێکی تەواویشی لێ نەبوو، بۆیە هێزی هاوپەیمانان

به تەواوی چوار دەوری ئەم ناوچەیان گەمارۆدا، لەبەرئەوە لە توانایاندا هەبوو بە یارمەتی و هێرشێکی هاوبەشەوە هێرش بکەن، هەروەها هێزە ئاسمانییەکان لە هەلۆیستێکدا بوون کە دەتوانرا فڕۆکەکانیان لە سێ لاوە هێرش بکەن و ئامانجەکانیان بپێکن. هاوپەیمانەکان دەستیان بەسەر دەریادا گرت، لە هەر شوێنێ لە هەر جێگایەك لە رۆژئاوای ئەورووپا و باشووریشدا زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی بخزن، ئەوانە پالپشتیان لێدەکرا لەسەرچاوەیەکی بە هێزەوە هەروەها لە توانایاندا هەبوو زۆر بە ئاسایی بەهۆی دەریاوانە بە تواناکان چۆنی بیانویستبایە جێگۆڕکێ بە هێزەکانیان بکەن. لە هەموو لایەکی بەرەکان بۆ ونکردنی مەشقەکانیان، تۆپ هاوێژە ئەلمانییەکان لە بارێکی ئامادەکراو نەبوون کەوا بتوانن تێکەلّ بە یەدەگە خێرا گرنگەکان بن لە کەناری رۆژهەلات بۆ رۆژئاوا یان لە باکوور بۆ باشوور لە پێناو پاراستنی خالّە هەڕەشە لێکراوەکان، زۆر لە لە بەرەکانی شەڕ خامۆش بوون هەروەکو بەرەی نەرویج و فنلەندا و بەلقان لەبەر کەمی هێلّی شەمەندەفەر و هێواش لە کشانەوەی ئەم بەرانە و ئاگادار نەکردنەوەیان، هێزی ئاسمانی هاوپەیمانەکان هەردەم بەربەستیان بۆ دروست دەبوو سەبارەت بە هێلّی شەمەندەفەر بۆ گواستنەوە. ئەمەش وایکرد ببێتە بەربەستێك لەسەر جێگۆڕکردنی پێکهاتە گەورەکانی سوپا لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی دیکە، هەر لە سالّی ١٩٤٣ هاوپەیمانەکان رووبەڕووی گواستنەوەی سەربازی دەبوونەوە، لەولاوەش ئەلّمانیا قەیرانی کرایە سەر بۆ بەرگریکردن بۆیە تەرازووی هێزەکان ئاوەژووبووەوە و هەروەکو لە بەشی دووەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا روویدا، رۆنشتد وای دەبینی کەوا ئەلّمانیا دەولّەتێکی دەشتاییە. کە چوار دەوری بە هێزەکانی ئەورووپای ناوەڕاست دراوە،

بۆیە پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی گۆڕانکاری لە پرۆگرامی سیاسیدا بکەن، ئەگەرنا چارەنووسی دەبێتە لە ناوچوون هەر بە هێزەکانی دەوروبەر، بە پێوانەیەکی چاك نێوان سیاسەت و ستراتیژی دەنرخاند.
هیتلەریش لەو باوەڕە دانەبوو لەم رۆژانە هێرشی بکرێتە سەر و راستیشی دەکرد بە دەست نیشانکردنی شوێنی هێرشکردنەکە بۆ نموونە سەرکردە ئەڵمانییەکان روودانی شەڕیان وا پێشنیار کرد کە لە (جنوی) یان لە باشووری ئیتاڵیا و یۆنان رووبدات، لێکدانەوەکان بە بەردەوام لە گۆڕاندا بوو هەروەکو بە دەرکەوتنی هەندێك پڕوپاگەندە و ناردنی راپۆرتی درۆ بە دەستی ئەنقەست، زیادبوونی ئەم دیاردانەش زیاتر هیتلەریان خستبووە گومانەوە، تا گۆڕانکارییەکی سەرتاسەری بنەڕەتی لە بیرۆچکەی هیتلەر گۆڕا و گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە بەرگری لە بستێك زەویدا بکات تاکو دوایین سەرباز و دوایین گوللە، ئەوەش لە ئەنجامی بێزاربوون و گۆڕانی بەخت ساڵی ١٩٤٣. بەمەش توانای جوڵە و هونەری سەرکردایەتی بەتەواوی گۆڕا کە پێشتر زیاتر جەختی لەسەر ئەو فەرمانە کردەوە بۆ یەکلاکردنەوەی کە نابێت دەستبەرداری پارچەیەك زەوی بن، وەناتوانن هیچ زەویەك چۆڵکەن تاوەکو بڕیار وەرنەگرن.

بۆی هەیە دوژمنەکانمان بەسەر سوڕمانەوە هەستیان بەوە کردبێت کەوا سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی شتێکی وای نەکردبوو هەر لە ساڵی ١٩٤٣ وە تاکو کۆتایی جەنگەکان، لەوەش زیاتر دەستی بە هێڵی بەرگریکردنێکی مات کرد بۆ سوڕان بە دەوری هەموو بەرەکان و دەرچوونی فەرمانی وازهێنان لە بەرگریکردن کە زۆر بە درەنگەوە دەکرا، ئەمەش بوو بەهۆی لە دەستدانی زەرەر و زیانێکی زۆر لە گیانی وماڵی، لە هەمووی گرنگتر ئەو باوەڕ بە خۆبوونە لە دەست درا. سەرکردە سەربازیە ئەڵمانییەکان

له ساڵی ١٩٤٣ زنجیری زۆر قورس و پەل بەست کرابوون و بێبەش بوون لە هەموو سەربەخۆ بوونێك، ئەمەش گەیشتبووە دوا تروپك کاتێك پلدارە کۆنەکان دەسوڕان لە ناوچە بەرفراوانەکان لە کاتێکدا نەدەوێران یەك تیپ بجولێنی بە بێ بڕیاری هیتلەر، تاکوو دەگاتە ئەندامەکانی دەستەی ئەرکانی هیتلەر هەروەکو لیوا (جودل) دەبا رازیبوون لەلای هیتلەرەوە بەدەست بێنن، ئەمەش وایکرد سەرکردایەتی بەرەو تەسك بوونەوە بچێت و بوو بە هۆی دواکەوتنی گشت هەنگاوەکان، بارەگای هیتلەر کەوتبووە (بروسیا) ی رۆژهەلات، بۆ دەرهێنانی هەر نەخشەیەك کە پێویست بوو لە بارەگاکەی لە هەر تیپێك لە تیپەکان چ لە رۆژهەلات یا لە ئەفریقیا لە رۆژئاوا بۆ فەرمان دەرکردن زۆر دوا دەکەوت، هێڵی کەناریش تاکە شت نەبوو کە داگیر بکرێت لەبەرئەوەی زۆر دوورگەی گەورەتر لە پێشەوە هەبوو، تەنها بۆ ٢٠ تا ٣٠ سارباز بۆی تەرخانکردبوون. لە راستیا سەرکردایەتی بەرەی رۆژئاوا تەنها بەشێك بوو لە بەرەی ئەوروپی. بەلام بەشێکی زۆر گرینگی هێرشیش چاوەڕوانکراو بوو لەهەر کاتێك لەلایەن هۆڵەندا و بەلجیکا و فەرەنساوە، رێگای دڵی ئەڵمانیا و ئەو ناوچەیەی راست بە بەلجیکادا دەڕوات، تا دەگاتە باکووری فەرەنسا بۆ (کولون) بەم پێیەش سەرکردایەتی رۆژئاوا بەتەواوی و لە راستیدا بەرەی باکووری ئەفریقیا و ئیتاڵیا لە ئەڵمانیا دابڕابوون، لەسەر ئەم بنەمایەش رۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی و سەرۆکی هۆبەی جووڵە لەو باوەڕەدابوون هێرشی سەرەکی لە نێوان (عالیە) و رێگای سەرەکی (سوم) روویدات کە بەدوای دادی لە پالپشتی هاوپەیمانان بە شێوازی خێرا و بەرەو پێشەوە چوون بۆ (کودریان) بە تێپەڕبوون لە بەلجیکاوە لەسەر (ئەلایسن-کولون) یان نزیکەی (٢٠٠-٢٥٠) میل بە شێوەیەکی

راست، ئەمەش کارێکی سەیر نەبوو، ڕۆنشتد دەیزانی هەواڵگرەکانیش ئەم زانیاریانەیان بە دەست گەیشتبوو کە دیواری ئەتڵەسی لەبەرەی کالیان کاریگەرییەکەی تەنها رووکار بوو، هێندە بە هێز نەبوو لە هیچ لایەنێکەوە، ڕۆنشتد دەیزانی هەواڵگریەکان لەبەرەی بەلجیکاوە دیواری ڕۆژئاوای سنووری ئەڵمانیا بێ بەرگریە، هەروەها ناوچەی راین و زۆر بە بێ پارێزگارین، ژمارەیەکی زۆریش لە بیانییەکان لە هەموو جۆرەکان کاریان دەکرد بۆیە خزمەتی هەواڵگری هاوپەیمانان لە ئاستێکی خزمەتگوزاری هەواڵگریەکان ئەڵمانی بوون، ڕۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی دەیانزانی کەوا بارەگای هێزی هاوپەیمانان هەموو زانیاریەکیان هەیە کە پەیوەست بێ بە هەڵوێستەکان، هێرشە سەرەکیەکەی کە بە درێژایی هێڵی (کالیا-ئەبیڤن) بەرەو (ئەیش-کولون) دەستپێکرد هەروەکو چۆن ڕۆنشتد پێشنیاری کردبوو، بەرەی ئەوروپای ڕۆژئاوا و باشوور بەتەواوی تووشی داڕووخان بوون و بەتەواوی لە ئەڵمانیا دابڕان، ئەگەرچی ئێستا بۆتان روون دەکەمەوە هەندێك لەو بیر و بۆچوونانەی کە تۆزێك گۆڕان لەسەرەتای دەستپێکەکەیساڵی ١٩٤٤ روویدا، بۆی هەیە هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکان هۆکارێکی گرنگیان هەبوو کەوای لێکردن هێرش نەکەن وەکو ئەوەی ڕۆنشتد پێشنیاری کردبوو، بۆی هەیە هەندێك هۆی پێشنیارەی ڕۆنشتد دانابوو دەستی پێکرد، بەو هێرشەی کە لە کورترین هێڵ کە دەگاتە ئینگلتەرا هەروەها چەندان ئاسانکاری هەمە جۆری پێشکەش بە هێڵی ئاسمانی هاوپەیمانەکان کرد،بۆی هەیە هاوپەیمانەکان ترسا بن لەوەی کە ئەڵمانیا و لەبەری باشوورەوە بەرەو رووبان ببنەوە، گەرچی ئەو رووبەڕووبوونەوەیە هیچ سەرکەوتنێکی نییە لەبەرئەوەی بەشی هەرە گەورەی لە تیپی

ئەڵمانییەکان بێبەش بوون لە جووڵە و پەرت و بڵاو بوون لە کەنارە فراوانەکان، ئەمەش چەند هەفتەیەکی دەویست بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە یەکەکان، بۆی هەیە ئەم یەکانەش هێزێکی ئەوتۆیان نەبووبێت بۆئەوەی لەسەر هاوپەیمانانندا زاڵبن وەکو ئەوان کە خۆیان ئامادە کردبوو، سەرباری سەرکەوتووییان لە هێزی ئاسمانیدا، پێویستە ئەوەش تۆمار بکەین کە ئەم قەڵاتە رووپۆشێکە بۆ شاردنەوەی فێڵەکانی هەڵخەڵەتاندن، هەر ئەم بۆچوونەش هەبوو سەبارەت بە دیداری رۆژئاوا، ئەم رایەی خۆشی لەلایەن دوو میوانی بیانی دەربڕیبوو بەڵام بە شێوازێکی لەبار، رۆنشتد کەسایەتییەکی بە زاخ بوو لەسەر شێوازی لاسایی کردنەوەی کۆنینە پەروەردە کرابوو، سەرکردەیەکی متمانە پێکراو و بە توانا بوو لە راگوێزانی سوپا، وای دەبینی کە تاکە هونەری شەڕ لەوەدایەکە هەر لەگەڵ رۆنشتددا بەرگری بکەین، زۆر گرنگە بۆ هەموو خوێنەرێك کە بزانن بەم شێوازە بیر و باوەڕی رۆنشتد دیاری بکەین، گەر واش نەبێ ناتوانن وەکو پێویست لەبەسەرهاتەکانی داهاتوو بگەین، راپۆرتێکی سەبارەت بەرامبەر هەڵوێست بۆ بارەگای سوپای سوپای ئەڵمانی نارد و لە بەهاری ساڵی ١٩٤٣ پێشکەش بە هیتلەر کرا، وە ئەم راپۆرتەش لە بەدبەختی وەکو پێشتر باسمانکرد وەڵامی خێرا نەدرایەوە، بەڵام سەرکردایەتی باڵا دەستی کرد بە بیر کردنەوە، گەرچی تا ساڵی ١٩٤٣-١٩٤٤ هیچ بڕیارێکی یەکلاکەرەوەیان وەرنەگرت، پاش ئەوەی رۆنشتد راپۆرتەکی نوێی لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٣ پێشکەش کرد، ئەم راپۆرتەش گری بەردایە سەر ئەفسەرە پایە بەرزەکانی بارەگای سوپا، لە بەشێکی تردا هەر لە دەرگای ئەم باسانە دەدەم، لەسەر سوپای ١٥ بوو کە بەرگری لە کەرتی کەناری

نێوان (ئەوستد) و رۆژئاوای (هاڤر) بکەن هەر لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ ئەم سوپایە بە رۆنشتدی راگەیاند کەوا چەند کارگەیەکی زل لە ناوچەی رێکخراوی (تود) دادەمەزرێنرێ بێ ئەوەی بزانرێ مەبەست لە دامەزراندنیان چیە، ئەم دامەزراوانەش بە شێوەیەکی زۆر نهێنی ئەنجامدەدران هەتاکو سەرکردەی گشتی سوپای ١٥ نەدەگەیشتە دیتن و شوێنی ئەم دامەزراوانە. هەروەکو شتێکی ئاسایی بوو، سوپاش نارەزاییەك بەرز بکاتەوە لەسەر دروستکردنی ئەم دامەزراوانە بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکی لەسەر هەبێت، هەروەها سوپاش هەستی بە مەترسی بوونی ئەم دامەزراوانە کرد کە لەو ناوچەیدا هەبوون. چونکە ئەم دامەزراوانە دەبێتە تاکە هۆکارێکی بەرچاو بۆ بوردومانکردنی لەلایەن دوژمنانەوە، ئەمەش وایکرد ببێتە مەترسییەك بۆ سەر یەکەکانی دەوروبەری خۆی. رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی بێ ئاگابوون لەم شوێنە و ئەم کارە نهێنییە، بۆیە رۆنشتد داوای روونکردنەوەی لە بارەگای باڵا کرد لەسەر ئەم دامەزراوانە، ئەو کەسانەی کە لە بارەگای هیتلەر بوون سەریان سورما بەوەی کە تاکو ئێستا سەرکردایەتی رۆژئاوا هیچ هەواڵێکی پێنەداوە، ئەوانیش بەڵێنیان پێدا بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە کە بێ ئەنقەست روویداوە، ئەمەش قسەیەکی سەرزارەکی بوو لەگەڵ توند بوون لەسەر نەدرکانی نهێنییەکانی ئەم دامەزراوانە، هەندێك نوێنەر کە دامەزرابوون لەلایەن سوپا و هۆبەی ئازووقەی بارەگای لیوا هەڵسان بە پێدانی زانیاری بۆ رۆنشتد، زانیاریەکانیش ئەمانەبوون پاش ماوەیەکی کورت ئامێرێکی نوێ دادەهێنرێ و لە رۆژئاوا بۆ یەکلاکردنەوەی ئەنجامەکان بەکاردێت وەك : چەکی سەرکەوتن ژمارە (١) چەکی سەرکەوتن ژمارە (٢) ئەمجۆرە چەکانەش لە زۆر شوێنی تایبەت

دەهاوێژران کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابوون، وەك خەندەقی بە ترپە قورسەکان، شێوازی هاویشتنیان تاکو ئێستاش نهێنییەکی پارێزراوە، کەچی چەکی ژمارە (٢) موشەکێك هاوێشتن بوو کەوا لیوا (دورن بیرکەر) دایهێنا بوو لە هۆبەی سوپا، کاریگەری گەلێك لە موشەکی ژمارە (١) زیاتر بوو، بۆیە ئەم چەکە زیاتر تایبەتمەندی بە تۆپە قورسەکان دەچوو، ئەم دوو چەکەش دوور هاوێژبوون کە دەیانتوانی بگەن بە باشووری ئینگلتەرا، بەڵام پاش کاتێکی درەنگ فەرمانی هیتلەر گەیشت کە پێی داگرتبوو لەسەر بەشداریکردنی رۆنشتد لە بەکارهێنانی و ئامادەکردنی ئەم چەکانە. بۆ ئەم مەبەستەش لێژنەیەکی تایبەتی لە ژێر فەرمانی دانا، ناوەکەشی بە دەستی ئەنقەست ناو نا (بارەگای گشتی بۆ بەکارهێنانی تایبەتی) ئەم دەستەیەش پێکهاتبوون لە ئەفسەر و ئەندازیارانی هێزی ئاسمانی و هۆبەی ئازووقە و هەندێك ئەفسەری تۆپە قورسەکان کەوا سوپا دایمەزراندبوون، بەڵام دوایی زۆر بە خێرایی روون بووەوە کە ئەم دوو چەکە بەتایبەتی ژمارە (٢) بەکارنەهاتبوو لە ماوەیەکی زۆر ئەوانە هێشتان لە ژێر تاقیکردنەوە دابوون و زۆر هەڵەی هەمەچەشن روویدا لەکاتی دروستکردنیان، ئەمیش بەو تاقیکردنەوەی کەوا لە رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا بەرێوە چوو و بە ئەنجام گەیشت، ماوەی دوور هاوێژی چەکی ژمارە (١) لە نێوان ١١٠-١٢٥ میلە، چەکی ژمارە (٢) ماوەی دوور هاوێژییەکەی لە نێوان ١٦٠-١٩٠ میلە بە ئاماژەیەکی تر ماوەی دوور هاوێژیەکەیان بۆی هەیە بگاتە ٥٠٠ میل یان زیاتر گەر هاتوو دەرفەتی پێویست هەبێت، واش بڕیار بوو کە چەکی ژمارە (١) بۆ یەکەم جار بەکار بێت ، بەڵام کاتی بەکارهێنانی دیاری نەکرابوو،شوێنەکانی دانانی ئەم چەکانەش لە نێوان کالیا و رێژگەی(سین) دا بوو. دواتر هەڵسان بە

دروستكردنی خانووبەرە لە شێوەی گوند بەڵام زۆر بە فێڵاوی، ئەم ئامادەكاریەش لەلای دوژمن و هاوپەیمانان ئاشكرابوو، بۆیە ناوچەكەی لە شێوەی مافوور تۆپ باران كرد. شوێنی چەكی ژمارە (٢) جێگای زۆر بڵند و بەرزبوو، بە روونیش لە بەرچاوان بوو، بۆیە لەكاتی تۆپ بارانە ئاساییەكان نیشانەیەكی لەباربوو، سەركردایەتی رۆژئاوا دوای تاقیكردنەوەیەكی ناخۆش وا پێشنیاری كرد كەوا مۆڵگەی چەكی ژمارە (١) زۆر بە ئاسانی و سروشتی دابمەزرێ تاكو لەبەرچاوان نەبێ، هیتلەریش لەسەر ئەم شێوازە رازیبوو، دەستكرا بە دروستكردنی ئەم مۆڵگانە بە شێوازێكی نوێ كە ژمارەیان ٩٠تا١٠٠ دەبوو، كاتێك كەوا هێرش ساڵی ١٩٤٤ دەستیپێكرد نزیكەی ٩٠ تا ١٠٠ مۆڵگە لە نێوان (كالیا) و (هاڤر) دروستكرابوون، كێشەی دەستەڵات لەسەر ئەم چەكە روون نەبوو، چەكی ژمارە (١) بەدەست سوپا و هۆبەی ئازووقەوە بوو. دروستكردنی ئەم مۆڵگانە تایبەت بوو بە رێكخراوی تود، كاتێك چەكی ژمارە (٢) ئامادەبوو بۆ بەكارهێنان سەرۆك هملەر ئەم چەكەی داماڵی لە سوپا ! رۆنشتد ئامادەباشی لەم دوو چەكە وەرگرتبوو گەیشتبووە ئەم بیر و رایەی بێ دوو دڵی وێرانكەرن، بەڵام ناتوانن یەكلاییكەرەوەبن. سەرباری ئەمەش چەكی ژمارە (١) هەندێك كەم و كوڕی دیاریكراوی تێدا هەبوو، هەندێك جار وا رووی دەدا. ئەم چەكانە لە دواوەی دوژمانان بە زەوی دەكەوتنەوە وەیان لە بەلجیكا لەسەر زەوی دەكەوتنەوە، ئەمەش بەهۆی هەڵەكردن لە دروستكردنی ئامێری سەركردەی ئەم چەكەیە. دوو دڵی رۆنشتد لە زیادبووندا بوو، چالاكیەكانی دوژمن لە رێگای ئاسمانییەوە بۆ سەر ناوچەی سوپای پانزەهەم، ئەمەش دەبووە هۆی لێكەوتنی زەرەرێكی زۆر لە بەرەكانی جەنگ و كە زیاتر لە زەرەرەكانی

دوژمن له ئینگلتەرا. هەرچۆنێك بێت گرقتی ئەم دوو چەکە هونەری بوون، رۆنشتد و دەستەی ئەرکانەکەی هەرچەندی پێیان کرا پارێزگاریان کرد لەم نهێنیانە، چەکی ژمارە (١) لە شەوی ١٢ و ١٣ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٤ بەکارهات ، بەڵام چەکی ژمارە (٢) تاکو هاوینی ساڵی ١٩٤٤ بەکارنەهات، هەرچۆنێك بێت دەستەکانی هونەری ئەم دوو چەکە پێویستیان بە چەند یەکەیەکی راهێنراوی تایبەتی هەبوو، لە پڕ و لە مایسی ١٩٤٤ وا روویدا کەوا هیتلەر فەرمانی دەرکرد بە هاوێشتنی یەکەم جار لە ٦ ی حوزەیرانی ١٩٤٤ کە دەکەوێتە هەمان رۆژی دەستپێکردنی هێرش، کارگەکانی چەکی ژمارە (٢) بە شێوەیەکی گشتی کەوتبوونە چوار دەوری ئاراس لە (کونتناتن) لە نێوان (کان) و (سنت لو) دوایی پاش ماوەیەکی درەنگ گوازرایەوە بۆ هۆڵەندە، هەروەها باوبوو سوپای ئەڵمانی پێشوو کە فەرمان و رێنمایی دەربکەن. فەرمانی یەکلاکەرەوەشی نا بەڵکو ئاراستەیەکی گشتی لە سەرکردایەتی باڵاوە بۆ سەرکردە پێشڕەوەکان دەرکرد دەربارەی ئەرکەکانیان. ئەم شێوازەش زۆر جار ئاسایی بوو لە رۆژانی رابردوو، لەسەردەمی (مولتکە) و(شیلفن) ئەم شێوازەش دەستەی ئەرکانی ئەڵمانی گشتی پراکتیکی کرد لە ماوەی نێوان ١٩١٤-١٩٣٩، ئەم رێنماییانەش بە چاوێکی هەند و شوێنێکی بەرز و خزمەتێکی درێژ و تاقیکردنەوەو سەربەخۆیی سەرکردە پێشینەکان بوو لەکار، هەروەها ئەم رێنماییانە سەربەستی دەدا بە سەرکردەکان لە جێبەجێکردنی و جووڵە کردن بەگێرەی بارودۆخ. هەرچۆنێك بێت ئەم شێوازەش لە ساڵی ١٩٤٢ ونبوو پاش ئەوەی کەوا هیتلەری سەرکردەی باڵا هاتە سەر کورسی دەسەڵات و بوو بە سەرکردەی باڵا فەرمانێکی درێژی تایبەتی دەرکرد بەیارمەتی دەستەی ئەرکانی و بەبێ گوێدان و بە

بێ هەند وەرگرتنی پلە و پایەی سەرکردە ئینجا گەر (مارشاڵ) بێت یان پلەی (عەقید) بێت !! رۆنشتد ساڵی ١٩٤٣ هەستی کرد کە هەردوو دەستی کەلەبچە دەکرێ گەر مەترسی هێرش لابچی و یان دوژمن لە دابەزینەکان رزگار بن. ئەو کاتە یان ناتوانی بەسەربەستی کاربکات، سەرباری ئەو ٢٥ ساڵە خزمەتەی کە هەیبوو، بەڵکو ناچار دەبێت دەست بکات بە پاڕانەوە بەر لەوەی هیچ فەرمانێك دەربکرێت، بۆیە داوای سەربەستی لە کار و دەرکردنی چەند پێشنیارێکی گشتی لە سەرکردایەتی گشتی کرد، بەڵام داواکانی بەباداچوو، رۆنشتد بە کردەوە هەڵوێستی وەرگرت و فەرمانی دەرکرد بە پشکنینی بە شێوەیەکی نموونەیی لە هەموو خاڵە لاوازەکانی سەرکردایەتی رۆژئاوا، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش چەند دەستەیەکی پێکهێنا لە نێو هەموو ئەو سوپایەی کە لەژێر فەرمانی خۆیدا بوو، کە پێکهاتەی ئەفسەر و سوپا و هەردوو هێزی دەریایی و ئاسمانی لە پۆلی ئەندازەیی و تۆپ هاوێژ و دژە بەرگرییەکان و زرێپۆشەکان و ئەندازیارەکانی رێکخراوی تود لە سەرووی هەموو ئەو دەستان، دەستە تێکەڵاوەکان لە لیوایەك لەناو سوپادا پێکهاتبوون. راپۆرتی ئەم دەستانەش پێشکەشی سەرۆکی سوپای شارەزا دەکرا، پاشتر لەلایەن سەرکردەی سوپاکەوە دەدرایە رۆنشتد بۆئەوەی بەسەریاندا بچێتەوە، بۆ جێبەجێکردن و پشکنینی بە شێوەیەکی نموونەیی بۆئەوەی بە وردی بەڕێوە بچێت، ئەم دەستانە کۆمەڵێك پرسیاریان دایە دەست کە پەیوەست بوون بە فەرمانگەکان تا وەڵامیان بدەنەوە، جگە لەوەش ئەو دەستانە کاتێکی درێژیان پێدرا بۆ چاودێرییەکی بەرفراوان، بۆ یەکە جیاجیاکان لە هەموو بەرە فراوانەکاندا بە ئازادی،

گرنگترین پرسیارەکانیش ئەمانە بوون:

١- بارودۆخی ئێستا و بایەخی سەربازی و خۆڕاگری و ئامادەکردن و ڕێکخستن و مەشقی یەکەکان.

٢- دەربڕینی بیر و رادەربڕین لەسەر ئەوەی کە ئامادەیە بۆ شەڕ یاخود شتی تر هەیە، هەروەها دەشێت بۆ رووبەڕووبوونەوە یان بەرگریکردن.

٣- پشکنینی قەڵابەندی هەمیشەیی و قەڵابەندی کەناری گۆڕەپان.

٤- هێز و ڕێکخستنی پارێزراوەکان و یەدەگ و چەك و بەرگریکردن.

٥- ئایا هاوکاری لە نێوان هەر سێ لای پڕ چەك بە تینە.

٦- پشکنینی پلانی هێڵە ئاگریەکان و چەکە قورسەکان.

٧- ئایا هەموو قەڵابەندیەکان بە شێوەیەکی چاککراون لەلایەنی پزیشکی و ئاو و دابینکردنی داو و دەرمان.

٨- ئایا رژێمی هاتوچۆ لە نێوان هەموو رەگەزە هێزە چەکدارەکانی پێشەوە بەردەوامە.

٩- چ هەڵوێستێك وەرگیراوە بۆ چارەسەرکردنی یەکەکانی پەڕەشووت و یەکەکانی هێڵی پشتەوە کە دادەبەزن.

١٠-ئایا یەدەگەکان بە شێوەیەکی چاك دانراون بۆئەوەی بە خێرایی بجولێن ئەمانەش گرنگترین خاڵی پرسیارەکان بوو کە لەلایەن رۆنشتدەوە ئاراستەیان کراوە.

داوا لە دوو سەرکردەی سەربازی لە پاریس و بروکسل کراوە کە لە ژێر فەرمانی سەرکردەی رۆژئاوا نەبوون، تاکوو بەشداری لە پشکنین و

ئامادەسازی لە ناوچەکەیاندا بکەن بۆ بەرگریکردن. چەند ئەفسەرێك لە دەستەی ئەرکانی سەرکردەی رۆژئاوا دامەزران بۆ ئەو پشکنینەی کە باسکران، بەمەش توانرا خاڵە لاوازەکان چاکبرێت کەوا دەتوانرا لەناوەخۆدا چاك بکرێن، بەڵام ئەوانەی کە پەیوەست بوون بەو کێشانەی کە بە سەختی چارەسەر دەکران، بڕیاردرا بە راپۆرتێك لەسەر ئەنجامی ئەو پشکنینانەی کە لە پاییزدا کران بۆ هیتلەر رەوان بکرێت، وە ئەم راپۆرتەش بە کردار جێبەجێکرا، بەڵام پاشان چی روویدا لە دواییدا باسی دەکەین، رۆنشتد وا هەستی کرد لە کۆتاییەکانی بەهار بەهۆی داهێنانەکانی کەوا ئیتاڵیا لە هاوپەیمانان دوور دەکەوێتەوە، سەرباری دوو دڵی و هەڵوێستی گشتی بەرامبەریان، ئەم هەواڵەش رەوانەی بارەگای هیتلەر کرا بە شێوەی بروسکە کە هیچ وەڵامێکیشی نەبوو، بەڵام ئەم بابەتە بە تەلەفۆن لە نێوان دەستەی ئەرکانی رۆنشتد و بارەگای سوپا تاوتوێ کرا.

جەنگی ئەفریقیا کۆتایی پێهات بە لەناوچوونی بارەگا، هاوپەیمانەکان لە سەقلیە دابەزین، زۆر روون و ئاشکرا بوو کە لە دۆڵی (مسینا) تێدەپەڕن بۆ ئیتاڵیای باشوور، هەموو زانیاریەکانیش دووپاتیان دەکردەوە کەوا یەکەکانی ئیتاڵی بەبێ ئارەزووی خۆیان شەڕیان دەکرد، بارەگاکانی ئەڵمانیا لە ئیتاڵیا زۆر کەم بوو لەبەرئەوەی زۆربەیان ئیتاڵی بوون بە بیانووی ئەوەی کەوا ئیتاڵیا وڵاتی خۆیانە و بەرگری لێدەکەن، بەڵام ئەم هیوایەش لە جێگای خۆی نەبوو، یاخود یاخیبووەکان لە بازنەی جێبەجێکردن بوون دژی مۆسۆلینی و رۆژانە لە زیادبووندا بوون، بەڵام زۆربەی ئەفسەرەکان دڵسۆزیان بۆ مەلیك نەدەشاردەوە. هەروەها ئەڵمانیاش هیچی تر نەیدەتوانی پیشەسازیە کاریگەرەکان و یارمەتی

سەربازی بگەیەنێتە سەربازە ئیتاڵیەکان. ئیتاڵیەکانیش زۆر سەخڵەت بوون بە لەدەستدانی هەموو سەروەت و سامانیان لە ئەفریقیا، ئێستاش دەبینین دوژمن خۆی ئامادە دەکات بۆ هەڵکوتانە سەر ئیتاڵیەکان لە باشوور، ئەمەش لە زووەوە لای رۆنشتد لە بیرۆکەیدا هەبوو کە ئیتاڵیەکان لە هاوپەیمانانی دادەبڕێن، ئەم ئامانجەش زۆر ترسناکە بۆ سەرکردایەتی ئەڵمانیا لەبەرئەوەی سەرکردە بەردەوام لەبەرەی باشوورەوە هەڕەشەی لێدەکرا، یانی لەبەرەی کەناری دەریای سپی ناوەڕاستی فەڕەنسی. بەڵام گەر هاوپەیمانان باکووری ئیتاڵیا بگرن ئەوکاتە دەکەونە دواوەی بەرگریەکانی رۆژئاوا، هەروەها دەتوانێت لە باشووری رۆژهەڵاتی ئیتاڵیای کاربکات دژی فەڕەنسا، رۆنشتد زۆر دەترسا لەوەی هاوپەیمانان ئیتاڵیا بە گشتی هێواش هێواش بەم هێرشانە بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیان. زۆریش دوو دڵ بوون لە دابەزینی خێرایی لە کەنداوی (جنەوی) یان لە (بندقیە) بەمەش دەبوو دوورکەوتنەوە لە هەموو شەڕەکانی چیا و کە ئامادە کرابوو لە (سالابریا) تاکو (البو) ئەمەش تەنها هەر ئیتاڵیای ئازار نەدەدا، بەڵکو ئەڵمانیا و سەرکردایەتی رۆژئاوا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەناو جەرگەی زیندوودا، ئەمەش شتێکی روونە کەوا هاوپەیمانەکان بیریان لەم پلانە کردبێتەوە، بۆی هەیە لەبەرچەند هۆیەکی گرنگ جێیەجێیان نەکردبێت، رۆنشتد هیچ زانیاریەکی لەسەر هۆیەکان لە ساڵی ١٩٤٣ نەبوو، ئەوەی کە زاڵبوو بەسەر ئیتاڵیا زاڵ دەبێت بەسەر (سردینیا) و (کورسیکا) و سەر کەناری دەریلی سپی ناوەڕاست، یانی ئەمەش هەڕەشەیەکی بەرگریکەرانی رۆژئاوایە لە باشوور بەتایبەت کەناری فەڕەنسای باشوور کە بۆیەکەم جار لە تشرینی دووەمی

(نۆڤمبەر) ی ساڵی ١٩٤٢ دەگیرکرا، پلانیش دانرا بۆ جێبەجێکردن و پارێزگاریکردنی بەڵام جێبەجێنەکرا !!!

هێزەکانی ئەڵمانی لە نێوان سنووری ئیسپانیا لە نزیک (فندرس) و (تۆلۆن) زۆر بێ هێز بوو، تۆپ هاوێژەکانی کەنار زۆر خراپ بوون، ئەم یەکانەش لەسەریان پێویست بوو کە پارێزگاری لە مەیدانی جەنگ بکەن بە پێی توانای خۆیان، بەتایبەت خاڵە گرنگەکان تیپێك یان دوو تیپ لە تیپەکانی رۆژئاوا هەبوون لە دۆڵی (رون) و چوار دەوری (تولون) بەڵام هەموو یەکەکان بەردەوام جێگۆڕکێیان پی دەکرا و لە بەرەی رۆژهەڵات بەکاریان دەهێنان، هێزی دەریایی و ئەسمانی لە ساڵی ١٩٤٣ زۆر لەوەی بی هێزتر بوو کە دەتوانێت پارێزگاری لە بەرەی باشووری نوی بکات، بەڵام ژ روودەدات ئەگەر هاتوو ئەوەندەش زیادبکەین بەوەی کە سوپای ئیتاڵی شەڕ نەکەن لە (تولون) و (منتون) ئەوانەش لە ژێر فەرمانی رۆنشتد بوون، بەوەی کرا ئەم سوپایە شەڕ نەکات ئایا دەبی هەڵوێستی سەرکردایەتی رۆژئاوا چی بێت بەرامبەر ئەم سوپایە، ئایا چ یەکەیەك جێیان دەگرێتەوە، ئەو کاتە وەڵام گەلی ئاسان بوو کە هیچ هێزێکی لەبار نەبوو بەکاری بێنن لە جیاتی سوپاکە، بۆی هەیە سوپای ئیتاڵی فەرمان لە رۆما وەربگرێت بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەڵمانیا ئەوکاتە چی روودەدات ئەمەش هەمووی روونکردنەوەیەکە لەسەر ئەوەی کەوا رۆنشتد چەند مانگێك بەر لە رووخانی ئیتاڵیا چەند راپۆرتێکی بۆ هیتلەر بەرزکردبۆوە و ئاگاداری کردبۆوە، جێگای خۆی بوو یەکەکانی ئیتاڵیا دووربکەونەوە لە هەر شتێك کەوا ئازاریان دەدات یاخود ئەو پەیوەندییەی پاشکۆ بوو لە سەرکردایەتی رۆژئاوا، ئەندامانی ئەم دەستەیەش خۆیان لە هەڵوێستێکی دژوار و سەخت دۆزیەوە، ئەوانی

هەروەکو هۆیەك بوون لە هۆیەکانی سیاسەت، بە پێی سروشت بە نهێنی ڕێنماییەکانیان لە ڕۆما وەردەگرت، هەروەها لەلایەکی دیکەش سەر بە ڕۆنشتد بوون، ئەمەش فەرمانی ڕۆنشتد ئاسانکاری لە هەڵوێستەکانیدا کرد.

لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٤٣ هیتلەر فەریق (کودریان)ی بە سەرپەرشتیاری بەشی زرێپۆشەکان دامەزراند، بەمەش پیاوێکی لێهاتوو چالاك ئەم پلەوپایە وەربگرێت، دامەزراندنی ئەم پیاوەش سوودێکی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی سەرکردەکانی باڵا و سەرکردەکانی سوپا تێکەڵاو و ئەو یەکانەی کە لە هێزی زرێپۆشەکانەوە لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاست لە ڕووی سەربازیەوە ئامادەبکرێت و بەکاربهێنرێن. پێویستە ئەوە بزانین زۆربەی سەرکردە پلە دارەکان و زۆر لە ئەفسەرەکانی ئەرکانی گشتی، لەم بەشەدا خزمەتیان نەکردبوو، بۆیە بێ شك ئامادەکاریو بەکارهێنانی سەربازی ئەو بەشە باشتربوو هەروەك لەساڵی ١٩٣٩ – ١٩٤٣ دا هەبوو، چونکە بەکارهێنانی بەشێوەیەکی باش و تێگەیشتوانە کە لەلای سەرکردە کۆنەکان بەم شێوەیە نەبوو.

ئەرکی کودریان بوژاندنەوەی ئەم تێگەیشتنە بوو لەنێوان سەرکردە کۆنەکان، ئەمەش ئەکێکی وا ئاسان نەبوو لەبەر ئەوەی کودریان نەیدەتوانی فەرمان بکات، بەڵام لە توانییدا هەبوو هەوڵیان لەگەڵ بداو یان ڕازیان بکات لە هەمان کاتدا نەیدەتوانی لەیەك کاتدا لەبەرەکانی جەنگدا ئامادەبێت، پێویستیش نەبوو زۆر لە بارەگای هیتلەر یا شوێنێکی تر ئامادەبێت، زۆر لە پلەو پایەی تری وەکوو زرێپۆشی لە بەشە گرنگەکانی سەرکردایەتی دا هەبوو، لیوا (بارون کیرفون جوین بیرك)ی دامەزراند بە سەرکردەی یەکەکانی زرێپۆشی ڕۆژئاواو بوو بە

پســـپۆرێك لەهـــەموو بوارەككـــانی وەك بـــەكارهێنانی زرێپـــۆش و پاشكۆیەكیش بۆ لیوای ئەركانی رۆنشتد.

لیوا (بارون كیرفون جوین بیرك) لە بەشی سوارچاكی بوو لە (رۆتبنێـرگ) هەروەها ئەفسەرێكی ئەركان و ناوەندێكی رۆشنبیری بەناوبانگ بوو، بیرو بۆچـوونەكانی زۆر لەگـەڵ بـیرو بۆچـوونەكانی رۆنشـتد دەگونجـا، لەبـەر ئەوەی هەردووكیان توانای جوولە كردن و تاكە گەوهەری هونەری شـەڕی راستەقینەن، بۆیە مانـەوەی هێزێكـی گـەرۆكی زرێپۆشـی یـەدەگی لـەژێر فـــەرمانڕەوایی ســـەركردایەتی رۆژئـــاوا بەپێویســـت زانـــی، ئـــەو هێـــزە یەدەگانەش دەبێت چەند تیپێك بن لەتەك پاریس...

لــە تشــرینی یەكــەمی ئۆكتۆبــەری ســالّی ١٩٤٣ لەگــەل رۆنشــتد بــۆ داوەتنامەیەكی تایەبەتی چوو لە سانت جرمان، لەو كاتەی كـەوا مۆسـیقا سەربازیەكان دەنگیان دەهات، لە ناكاو بانكرا بۆ سـەر تەلـەفۆن و تـاكوو لەگـەل بارەگـای سـوپا گفتوگـۆ بكـات و پێیـان راگەیانـد كـەوا ئیتالیـا بەیەكجارەكی دابڕاو لەگەڵ هاوپەیمانان كـەوت، رۆنشـتد ئەوەنـدە ملـهوڕ نەبوو پێویست بەوە بكات كە بڵێن ئەم بانگوازە ئیتر تەواو بوو.

لەبـەر ئـەوەی ئیتالیـا زۆر گـرنگ بـوو سـەبارەت بـە هەڵوێسـتی گشـتی ئەڵمانیا بۆیە هیتلەر بڕیاریدا كارەساتێك بەسەر ئیتالیادا بهێنێ، گەر چی ئەو وا بڕیاری نەدا كەوا هێزی ئەڵمانی بەرەو باشـورلەبەر ئـەوەی ئیتالیـا زۆر گـرنگ بـوو سـەبارەت بـە هەڵوێسـتی گشـتی ئـەڵمانیا بۆیـە هیتلـەر بڕیاریدا كارەساتێك بەسەر ئیتالیادا بهێنێ، گەر چی ئـەو وا بڕیـاری نـەدا كەوا هێزی ئەڵمانی بەرەو باشوور دابەزی بـۆ ئـەوەی پاڵپشـتی بكـەن لـە

هێزەکانی ئاسمانی هاوپەیمانان، بۆبەگەرخستنی باکووری ئیتالیا تاکوو ببێت بە بنکەیەك بۆ هێرشەکەیان.

هەروەها هیتلەر چەند تیپێکی ئەڵمانی نارد بۆ پاڵپشتکردن لە سەرکردەی گشتی باشووری رۆژئاوا مشیر (کیسرلنگ) لەو کاتەدا گیانی شەڕکردنی ئیتالیەکان دەستپێکرد رۆژ لەدوای رۆچ بەرەو دوو دڵی دەچوو، فریا گوزاریەکان لە ڤیەناو میونخ بەیارمەتی هێڵی شەمەندەفەرەوە بە تێپەڕبوون لە ئەڵپ یان لە رۆژئاوا بەتێپەڕبوون لە (مونت سنیس) بە شەمەندەفەر بەدرێژایی کەناری دەریای سپی ناوەڕاست کە بە تۆلۆن – نیس –جنوی–دا بەرەو ئیتالیا رەت دەبوون، هێڵی شەمەندەفەر لە لیۆنەوە تا مونت سنیس و تاکوو تورین بەسەر بەرزاییەکانیدا رەت دەبوو لە بەرزایی (٦٥٠٠)پێ بەناو تونێلی مونت سنیس، گەر هاتوو ئەو هێڵەش گیرا یان بۆردومان کرا یان شەمەندەفەرەکان لەکار کەوتن وا پێویست دەبێ ئەو کاتە کە هەموو شەمەندەفەرەکان لە تونێلی رۆژئاوادا لە شوێنە نزیکەکان بەتاڵ بکرێن.

هەروەها دوو تیپی تریش بەلای (مونت سنیس)دا رەوانەکران سەرباری بەفەرمی رانەگەیاندنی ئیتالیا لە جیابوونەوەکەی، بەڵام سوپای چواری ئیتالی فەرمانی نهێنی لە رۆما وەرگرت و بۆ ئاسانکاری هەڵوێستی ئەم سوپایە تیپی ئەڵمانیا کەوا لە ناوچەی ئیتالیەکان لەژێر فەرمانیدا بوون رێگایان دا بەتێپەربوون لە سنووری ئیتالیا. رۆنشتد لەوە زیاتر نەیتوانی هەڵسوکەوت بکات لەوەی کەوا بەرامبەر هاوپەیمانەکان کردی کە ببوون بە کۆسپ، ئەم تیپەی ئەڵمانیش چەند رۆژێك لەناو سوپاکانی ئیتالیا مانەوە لە دواییدا گواسترانەوە بۆ باکووری ئیتالیا زۆر بەهێواشی، ئەم هەڵوێستەش زۆر هەڵوێستەکی دەگمەن بوو؟

ئەم گۆڕانکاریەش لە ئیتالیا بە شێوەیەکی ئاشکرا لە تشرینی یەکەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٣ بەدیارکەوت، کەسیش نیە گلەیی لە پێداگری هیتلەر بکات لە ڕەنگدانەوەی کارەکانی، بۆیە یەکەمجار فەرمانی بۆ سەرکردایەتی ڕۆژئاوا دەرکرد کەوا بەشی چواردە سوپا بە زووترین کات لە چەك دابماڵدرێ، ئەمجۆرە کارەش بۆ بەدبەختی ئەم بەشە زۆر گرینگ بوو لە هەڵوێستی وادا، دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین ئەم ڕوویدا بەبێ بەرپەرچدانەوە، بەمەش بەرەی باشووری فەرەنسی بەتەواوی لە بەندەری (فندرس) تاکوو (مانتون) کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیا، لە پێناو ئەمەش سوپای ١٩ بەسەرکردایەتی لیوای لێهاتوو فون (سود نستیرن) پێکهات.

هیتلەر وا فەرمانیدا کە پرسیار بکات لە دەستەکانی سوپای ئیتالی داماڵدراو لە چەك، بەوەی کەوا گەر دەیانەوێت بە خۆبەختانە بەردەوامبن لە کوشتار لەتەك ئەڵمانیەکان یاخود نا، ئەمەش شتێکی ئاساییە کە ئیتالیەکان ڕەتیان کردەوەو ڕازی نەبوون بە شەڕکردن لە تەك ئەڵمانیەکان تەنها چەند یەکەیەکی تۆپ هاوێژ نەبێت، کە ئەمەش لە کەناری دەریای سپی ناوەڕاست دانران، لەبەر ئەوەی بەتەریەی کەنار دوای ئەمە نەخۆشی سۆزو خۆشەویستی گەڕانەوە بۆ ناو خزم و کەس کەوتە ناویان. ڕۆنشتد زۆر بەڕێز بوو ڕێگای پێدان بگەڕێنەوە بۆ ئیتالیا نەوەك بەدیل بگیرێن، ئەو هەموو هەڵوێستەش بەگشتی شەرمەزاری بوو بەتایبەتی بەرامبەر دەستەی پەیوەندیەکانی ئیتالیاو پەیوەست بوونیان بەسەرکردایەتی ڕۆژئاوا هەر لەزووەوە لیوا نایابی (مارازانی) بانگکرد. سەرکردایەتی ڕۆژئاوا هەوڵیاندا یارمەتی پێشکەش بە ئەندامەکانی تری ئەم دەستەیە بکەن کەوا لە (٦) سەربازو هەندێك سەربازی پۆڵ بکەن

بەهەر شێوازێك بێت، بۆیە جارێكیـان لەگـەڵیان چـووین بـۆ (الاوپـرا) لـە پـاریس تـاكوو (كـوك)ی باناوبـانگ، گەرچـی ئیتالیـەكانی لـەو هەڵوێسـتە راسـتەقینەی ئێمـە نەگەیشـتن، تـاكوو ئێسـتاش هەنـدێك لـە ئەفسـەرە ئیتالیەكان نامە بۆ رۆنشـتدو مـن دەنێـرن، هـەروەها سـەرۆك فەرمانگـەی كۆمـاری ئیتالیـا لیـوا (مـارازانی) نامـە بـۆ رۆنشـتد دەنێـری، هـەروەها موقەدەمی خانەنشین كراو سكنورینی كەوا خاوەنی میوانخانەی (فلورا)ی بەناوبانگ بوو لە رۆما ئەمیش بەهـەمان شـێوە نامـە ڕەوان دەكـات، ئـەم هەڵوێستەش تەنها یەك جار كارەساتێكی ترسناكی لێ كەوتەوە لـە مونـت سنیس وەكوو پێشتر باسمانكرد، زۆر گرنگ بوو بۆیە هیتلەر وای دانا ئەم تونێلـە گرنگـە بەسـاغ و سـەلامەتی كەوتـە دەسـت ئەڵمانـەكان، كـە دەسكەوتێكی گەورە بوو، هەروەكو یەكەی چیاییەكان توانیان بـە فـرت و فێڵ دەستی بەسـەردابگرن، بـەڵام كاتـێ كـە تیمێكـی بچـووك رووبـەڕووی بەرهەڵسـتێكی زۆر بـەهێز دەبوونـەوە لـە دەرگـای چـوونە ژوورەوەی رۆژهەڵات لەیەكەكانی شاخاوی ئیتالیـا، بەشـی رۆژهـەڵاتیش كـەوا بـەتێل دڕەكان دەورە درابوو روخێنـراو ئـاو هاتەچـوورەوە، بەمـەش زەرەرێكـی زۆری لێكەوت لـە ئـەنجامی تەقینـەوەی غازەكـان، بۆیـە هەڵوێسـتی ئـەم دەستە بچووكانەی ئەڵمانی زۆر قورس بوو بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئـەم خاڵانـە بـەخێرایی، هەنـدێك یەكـەی تـر لـە یەكـە چـیاییەكان لـە دوو لای تونێلەكـەوە لـە سـەرەوەی رۆژهـەڵاتی رێرەوەكـان، تـۆپ هاوێـژەكانیش بەشێوەیەكی چاك پاڵشتی ئەم دەستانەیان دەكـردو خاڵـە گرنگـەكانیش رووخـان و كـەوتنی ژێـر دەسـتی ئەڵمانـەكان، دوای دوو مـانگ شـوێنە رووخاوەكانیشـیان چـاكردەوە كاروبـاری رۆژهـەڵاتی (مونتـون) یـان (الرفییرا) چۆن بوو؟

ئایا سەرکردەی گشتی لە باشووری ڕۆژئاوا (کیسرلنگ) هێزێکی تەواوی هەبوو بۆ بەرپەرچدانەوەی دابەزینی هاوپەیمانانی چاوەڕوانکراو لە کنداوی جنوی؟ ئێستاکە سەرکردایەتی ڕۆژواواو سەرکردایەتی باشوور لە نزیك (منتون) بوون بە دوو سەرکردەی هاوسێ، (کیسرلنگ) لە باشووری ئیتالیا بەردەوام دەجەنگاو نەیدەتوانی بچێتە ناو گۆڕەپانی ئەو جوولانەوەی کەوا هاوپەیمانان لە نزیك جنوی بە شێوەیەکی کتوپڕ خۆیان بۆ ئامادەکردبوو، بۆیە وا پێویست بوو لەسەر ڕۆنشتد کەوا یەکە بێ هێزەکەی سەرباری بەرگری کەرەکانی کەنداو ئامادەبکات بۆ پێشڕەوی کردن بەرەو ئیتالیا بە تێپەڕبوون بە جنوی، گەر بهاتباو هاوپەیمانان لە ساڵی ١٩٤٣ دابەزیبان هیچ بەرگریەکی وایان تووش نەدەهات، گەرچی ئەوان هێرشێکیان ڕووەو ڕۆژوئاوا کرد بەتێپەڕبوون بە ئەلپ ڕووەو (لیون) کرد بۆ ئەوەی لە پشتڕا دەست بەسەر هێزی سەرکردایەتی ڕۆژئاوا دابگرن، گەر بهاتباو ئەوان هەستیان بە خاڵە لاوازەکان نێوان مۆناکۆ و گولون بکردبایە ڕووبەڕووی بەرهەڵستیەکی زۆربێ هێز دەبوونەوە، لەبەر ئەوەی ئەم کەرتانە وەکوو پێویست ئامادە نەکرابوون بۆ بەرگری کردن، دوای ئەوەی سوپای چواری ئیتالی ئەم شوێنەی جێهێشت، لەو کاتەدا دەیانتوانی بەرەو پێشەوە بۆ لیۆن بڕۆن،یا بەرەو ڕۆژهەلات پەرت وبلاو ببن تاکوو باکووری ئیتالیا لەئاستی ئەلپەوە .

ئەرکەکانی سەرکردایەتی ڕۆژئاوا زیادی کرد سەرباری زیادبوونی بەرەیەکی بەرفرەوان بۆی لە نێوان مونتون و سنووری سویسرا لە تەنیشت مونت بلاك لەم لایە نەوەش تەنها دەست کرا بە داگیرکردنی ڕێڕەوی چیاییە زیندوەکان بە ڕێگایەك تاکوو بتوانن کەڵك لە خۆپەنادانی ئیتالیاو فەرنسا وەربگرن، ئەم خاڵە بەهێزانەش بۆیە دامەزران بۆ

ئەوەی لەهەموولایەکەوە بەرگری بکەن، لەبەر ئـەوەی زۆر شـارەزا نـەبوو لەو گۆڕانکاریانەی شەڕ کە لای رۆژهەڵات یان لـەلای رۆژئـاوا روو دەدەن، هەر بەو پێیەش دارمانی ئیتالیا بوو بە هۆیـەك و ئامـانجێکی ترسـناك بـۆ سەرکردادیەتی ئەڵمانیاو بەتایبەتی سەرکردایەتی رۆژئاوا.

ناوچەی رۆنشتدو بەرەکانی زۆر لەم زیاتر درێژ بوونـەوە، بۆیـە پێویسـت بـوو باشـترین تیپـی بـۆ ئیتالیـا ببـات، هـەروەها چـەند بەرەیـەکی نـوێی بەهەموو بەشـەکانیەوە داگیرکـرد، ئەمـەش کاریگەریـەکی لەسـەر بـەرەی سەرەکی هەبوو لە قەنال و ئەتلەسی.

لە پێناو تەگەرەخستنی بەرەو پێشچوونی رۆژهەڵات یاخود بەرەو رۆژئاوا لـەو کاتـەی کـە هێـزی هاوپـەیمان لـە کانـاری دەریـای سپی ناوەڕاسـتی فەرنسـی دادەبـەزن، رۆنشـتد فەرمانیـدا بـە دروسـتکرنی ئـەم تەگەرانـە بەتۆپ هاوێژەکان بۆ پاراستنی رێگـا نزیکـەکان، ئـەم تەگەرانـەش دۆڵـی رون تارون یەك لەدوای یەك ئاسـتدابوون، ئەمـەش شـتێکی روون بـوو کـە ئەم شێوازە لاواز هێرشێکی بە تەقەلا نەبوو،خوێنەر دەتوانێ لـەو هـەموو ئەرکـە قـورس و سـەختانەی رۆنشـتد هـەموو بـەرەکانی جەنگدا لـە سـەر نەخشە تێبگـات کـە درێژییـەکی ۲۵۰۰ میـل بـوو، گـەر هـاتوو خلیجـان و گردۆڵکـە زۆرەکـانی کـەناری دەریـا داگـیر کراوەکـان بـە چـاوێکی هەنـد وەرنـەگرین، نـاتوانین بـەرگری لـەو هـەموو بـەرە بەرفراوانـە بکـەین، بـە بەرگری کردنێکی جێگیر کە نـەجووڵێ و تێکـەڵ بۆوە بـە هەنـدێك هێـزی هەمـە جـۆر کـەوا هێزەکانیـان دەگاتـە نێـوان ٥٠ –٦– تیـپ، ئەمـەش خەیاڵێکی دوور لە راستەقینەیە.

پێویسته لێکۆڵینەوەیەکی ورد و سەرکەوتووانه لەسەر نەخشەکه بکەین تاکوو له هەڵوێستی رەخنەکان بگەین، لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کەوا رۆنشتد ویستی شەڕی بەرگری کردن له رۆژئاوادا بەڕێوەببات لەسەر بناغەی کەوا جیاوازیەکی تەواو هەبوو لەگەڵ ویستەکانی هیتلەرو پێدا گرتنی لەسەر جێبەجێکردنی هەموو وردەکاریەکان، هیچ هێزێکی یەدەگی بەهێز لەبەشی زرێپۆشی لەژێر دەسەڵاتی رۆنشتدا نەبوو له چواردەوری پاریس و باشووری، لەو لاش هەندێك له یەکه زرێپۆشەکان لەپشتەوەی کەنارەکان سەرقالبۆون به هەندێك بەرگری لاواز. شەڕی رۆژهەڵات زۆر هیلاکی کردن زۆر به خێرایی جوولەیان کرد بۆ ئیتاڵیا و بۆ ئەوەی رۆژهەلات گەڕانەوە، کەلێنی زۆر لەو ناوچه فراوانەدا هەبوون و دەتوانرا به ئۆتۆمبێل بۆ ماوەی کاتژمێرێك له رۆژئاوا بجوولێی بەبێ ئەوەی تووشی یەك له یەکەکانی شەڕکەری ئەڵمانی ببیت، بۆیه کاری (حرکة الانصار) (بزوتنەوەی گەریلا) فەرەنسیەکان ئاسان بوو! !

هەندێك پێکهاتەی نوێی لاواز بەجڵ و بەرگی ئەڵمانی لەناوچەی کەنار دابەشکران، بارەگای سوپای ئەڵمانیش به بەردەوام یەکەی بیانی بۆ بەرەکانی رۆژهەڵات و سەرکردایەتی رۆژئاوا بۆ ئەم مەبەسته نارد.

سەربازی ئەم یەکانەش بریتیبوون لەو خۆبەخت کەرانەی که له خزمەتی سەربازی له یەکێتی سۆڤیەت و شێوەیەکی سەرەکی له قەوقاس و جورجیاو ئەرمینیا هەڵاتبوون... تد

بۆیه ئەوانەش بۆ ناوچەی رۆژئاوا گوازرانەوە له ترسی تۆڵه سەندنەوەی رووسیا لێیان ئەو یەکانەش لەژێر فەرمانی یەکەی سەرکردایەتی رۆژهەڵات لیوا (الحینال کوی سترنك) دابوون: ئەو سەرکردەیەش

زانیاریـەکی بـاوەڕپێکراوی لـە سـاڵانی رابـردوو لەسـەر رۆژهەڵاتەکانـدا هەبوو.

رۆنشتد بارەگای سەربازی ئەڵمانی ئاگادار کردەوە لە هەڵوێست و فیڵی نەخشەکان ئەو نەخشانەی کەوا هەمیشە بە پێوانـەی (١/١٠٠٠٠٠) بـوون، تـەنیا ئـەوە نـەبوو لـە هێڵـەکانی بـەرەی جـەنگ بـوو لەسـەر رۆخـی کـەنارەکان، بـەڵکو هـەموو بـەرەکان بـە ئـاڵای بچـووکی شـین دەستنیشانکرابوو!..

ئەگەر کەسێکی ئاسایی سەیری ئەم نەخشەیەی بکردابایـە رازی دەبـوو، هەروەها پێـی خۆش بـوو بـەم تێڕوانینـەی لـە بـەرەکانی جـەنگ کـە بـە شێوەیەکی سەرەنج راکێش ناوچەکانی پشتەوە بەیەکـەوە چڕو پڕەکـان پاڵپشت کردبوو، ئەم نەخشانە هەردەم بە پڕی خۆیان نیشان دەدا، بەڵام دەسـتەی ئـەکان کـەوا لـەو نەخشـانە دەکۆڵێتـەوە دەزانـێ کـە چـاو هەڵخەلەتێنەرە، چونکە ئەو هێڵە جوانانـەی بـەرەکانی جـەنگ نیشـانەی بـاوەڕ بـەخۆبوون، لـە راسـتیا وانـەبوو بـەڵکو بـێ هێـزو چـەندان کـونی گەورەی تێکەوتبوو، زۆربەی زۆری ئەو هێمایانەی کە لەسـەر ئـەو یەکانـە بـوون دەریـان دەخسـت کـەوا بەڵگـەکانیان راسـت نـین، بـەمجۆرە ئـەم نەخشانە هۆیەك بوون بۆ ری ونکـردن، بۆیـە ئەگـەر کەسێك هونەرمەندو حەزی لە گاڵتەی بووایە دەیتوانی ئەم شێوە گەورانە بەشـێوەیەکی روون دەربخـات، چـونکە لەراسـتیدا ئـەم نەخشـانە کاریگـەری زۆر ترسـناکی هەبوو.

رۆنشـتد لـە بارەگـای هیتلـەر زۆر لـە سـەرکردەکانی لـە تراویلکـەی ئـەم یەکانە ئاگادارکردەوە لەبەر ئەوەی لە راستیا ئەم یەکانە بوونیان نـەبوو،

ئەم نەخشانە نەیاندەتوانی دەری بخەن کەوا ئەم کاروبارانە بەشێوەیەکی راست بەرێدا دەڕوات یان بەم شێوەیە نەبوو کە پێویست بوو بەرەکان بەهێزبوون یان بەرەی خەراپ!!

بەر لەوەی بچمە ناو یادگاریە ترسناکەکانی رۆنشتد کە هەڵوێستی ترسناکەکانی رۆژئاوای چارەسەرکرد، گوێ لەم چیرۆکە دەگرین کە لە کاتی خۆیدا باسکرایە. پێشتر ئاماژەمان بەو ناخۆشیانە کرد کە ماوەی رووخانی ئیتالیا چەشتیان و رووبەڕووی تیپەکانی ئەڵمانیا بوونەوە لەکاتی تێپەڕبوونیان بۆ ئیتالیا بەتایبەتی لەنێوان ئەو ناوچەیەی کەوا سوپای چواری ئیتالی داگیری کردبوو، باسی چاوەڕوانی ژمارەی ئەو تیپە لەکار کەوتووانەمان کرد کە بۆ ماوەی چەند رۆژێك چواردەوری شاری (کان) و (نیس)و (مۆناکۆ)ی گرتبوو، لەو کاتەدا ئەفسەرو ئەفسەرانی پۆلێ و سەربازەکان ئەم ماوەیان بەهەڵ زانی کە لە چاوەڕوانیدا بوون بۆ سەردانی ناوچەی (الرفییرا)ی جوان، ملازمێکی گەنج لە دەم رووباری مۆناکۆ خۆی دەشووشت، ئافرەت و پیاوێکی ناسی ئەوانیش خۆیان دەشووشت، ملازمەکەیان بانگهێشتی ئاهەنگی سەمای ئێوارەکرد، ئەمیش داوەتەکەی رەت نەکردەوە، ئەفسەرە گەنجەکە هەستێکی ناسکی بەرامبەر خانمەکە دەربڕی، هەردوولا ئارەزووی پێکهێنانی هاوسەریان کرد، لەپاشاندا دەرکەوت کە خانمە بچووکەکە پەیوەندییەکی خزمایەتی بە تینی لەگەڵ ئەمیری مۆناکۆی دەسەڵاتدار هەیە، بۆیە پێویست بوو ئەم کارە بەشێوەیەکی فەرمی جێبەجێ بکرێ، لەبەر ئەوەی ئەم رووداوەش پێشینەی نەبوو ئەمیر بەم کارە رازیبوو و پاڵپشتی خۆی دەربڕی و فەرمانیدا بە کەتیبەی کە ئەو ملازمەی تێدابوو، کاتی ئەم فەرمانە گەیشتە لای رۆنشتد و فەرمانگەی کاروباری کەسی ئەڵمانی،

چونكه ئەم كارە پەيوەست بوو بەخزمايەتى ئەميرى دەسەلاتدار لە مۆناكۆ، ئەمەيش هەلۆيستى شەڕى نەبوو لە دژى ئەلمانياو بەشدارى لەم لايەنەى ديبلۆماسيەت بەشدارى كرد، سەفيرى ئەلمانيا لە مۆناكۆ ئاگادار كرايەوە كەوا هێنابوويانەوە بۆ پلەو پايەى خۆى لە وەزارەتى دەرەوەى ئەلمانيا بەم كێشە ئالۆزەوە، ئەم كاغەزەش شەڕێكى چالاكى لێكەوتەوە، لەبەر ئەوەى ئەم خانمە بيانيەو بۆيە هيتلەر فەرمانێكى لە دژى ئەم ئەفسەرە بەستەزمانە دەركرد.. لەبەرامبەر ئەمەش رۆ نشتد ئاخێكى ساردى بەرامبەر ئەم كارەى هيتلەر هەلكێشا...

هەروەكوو پێشتر گوتمان كەوا رۆنشتد رێنمايەكى دەركرد بۆ پشكنينى گشت جێگاو شوێنە بەرگريەكان، بۆ ئەم مەبەستەش چەند دەستەيەكى جۆراو جۆرى پێكهێنا بۆ ئەوەى هەلسان بە پشكنينى خالى بەرگريەكانى كەنار، ئەميش بەپێيى كۆمەلە پرسيارێك كە لە كۆتايى تشرينى يەكەمى ئۆكتۆبەر داينابوو لە دوو توێى راپۆرتێك پێشكەشى سەركردايەتى رۆژئاوا بكا، بەمەش دەتوانرا تاوو توێى راپۆرتەكان بكەن سەبارەت بەو دۆخەى كە بەرەكانى جەنگ لە رۆژئاوادا هەبوو، رۆنشتد بەبێ دوو دلى هەلسا وێنەيەكى روون و ئاشكراى لە راپۆرتەكە سەبارەت بە هەلۆێستى سەربازەكانى رۆژئاوا پێشكەش بە هيتلەر كرد.

رۆنشتد هەلسا بێ ئەوەى زيادە رۆيى رەشبينيەكەى بكات، بەوەى كە وێنەى رووت و ديارى هەلۆێستى سەربازى لەرۆژئاوا بدات بە هيتلەر، ئەوەى گرنگە بۆ روونكردنەوەى راستيەكان بۆ ئەوەى تى بگەى سەركەوتن تەنها كورتكردنەوەى سالى ١٩٤٤) لە دوابەزينەى كە لە نۆماندى روويدا هەروەها ئەو هاوپەيمانان دەكات لە هەر داگيركردنێك لە هەر شوێنێكى تر

١-چاكترين يەكەكان گوێزرابوونەوە بۆ ئیتالیاو بەرەی رۆژهەڵات، لە ناوچەی سەركردایەتی رۆژئاوا كەوا لەنێوان ٥٠-٦٠ تیپ دەبوو، بەڵام راستی ئەم تیپانە چی بوو؟

لە راستیدا چەند تیپێكی كەناری بوون شوێنەكانیان هەردەم قەڵا بەند بوو، ئەركی سەرەكیشیان بەرپەچدانەوەی ئەو هێرشانە بوو كە دەكرایە سەر ئەو بەرەیە كە درێژاییەكەی لە نێوان ٢٥- ١٠٠ میل دەبوو، لەمەش زیاتر كەنداوی (بسكای) باشووری (بوردو)و یەكەی بەرفرەوان بوو، بۆیە فەرماندەی فەوج ناچار بوو كەوا لە پشكنینی مۆڵگەكان مانۆڕسكیل بەكار بهێنێ بۆ ئەم كارەش پێویستی بەرۆژێكی تەواو هەبوو! !

شوێنی ئەم بەرگری كەرانە پارێزراو نەبوو، بەڵكو تەنها مەڵبەندی چاودێری كردنی كەنارەكان بوو...

كەرتی (اوستند — ابیفیل) بەهێزترین پارێزراوبوو لەچاو كەرتەكانی تر، دوای ئەمیش هێڵێكی لاوازبوو تا بەهافر دەگەیشت و لە (نورماندی)و (بریتانی) كەرتی بەهێزبوو كە كوتبوونە لای سەروو بەڵام نێوانیان هەروەكو هەوا سووك بوو، لەنێوان (لارویشل) و (بیارتیس) تەنها مەڵبەندێكی چاودێركردنی كەنارەكان هەبوو كە دوو تا سێ تیپی بێ هێز كە ماوەی پاراستنی ٣٠٠ میلی لەئەستۆ گرتبوو.

لە تەنیشت (برانیس) تەنها بەرگریكردن بوو لە رێڕەوە زۆر گرنگەكان لەسەر خاكی فەرەنسا، بەرەی دەریای سپی ناوەڕاست لە (فندرس) وە بۆ (منتون) لە رێگادا بوو بۆ دروستكردن، بەڵام نەژمارەی تیپ و نە نرخی سەربازی و چاكسازیەكان بەس نەبوو بۆ بەرگری كردن لە دژی هێرشی هاوپەیمانانەكان كەچی لە بەرەی ئەڵپ لە نێوان (منتون)

سنووری سویسرا لە نزیك (مونت بلاك) تەنها چەند خالێکی بەهێزی کەم ڕێورەوەکان هەبوو.

ئەم تیپانە لەژێر فەرمانی کۆمەڵەی کەناربوو و ئەرکەکانیشی هەروەکوو ئەرکەکانی تیپەکانی کەنار وابوو، یان لە پشتەوە یەدەگێکی نزیك بوو، بەڵام زۆربەی ئەم پێکهاتانە لە ماوەیەکی زۆر کورت ڕێکخرابوونەوەو مەشقێکی تەواویان نەکردبوو پێیان دەگوترا تیپ کە شارەزایان لەشەڕدا جیاواز بوو، هەروەکوو ئەوەی چەند جاری دیکە باسمان لێوەکردووە، ئەوەی پێویست بوو دەبووایە ئەو تیپە نوێیانە لە ئەڵمانیا بمێننەوە، بەڵام دواتر بۆ ڕۆژئاوا گوازرانەوە بۆ ئەوەی وەکوو تیپێکی سەربازی راستەقینە سەیر بکرێن، لەسەر ئەم تیپانەش وا پێویست بوو هەندێك شوێن زۆر پێویست لەبەرەکانی شەڕی کەناربگەنەوە، لە هەمان کاتیشدا لەسەر ئەو تیپانە پێویست بوو مۆڵگەی نوێ دروست بکات و سەربازە نوێیەکانیش لەسەر مەشق رابهێنێ بۆ بەهان هاتن و بۆ ئەوەی بەرەو بەرەکانی رۆچهەلات بیاننێرێت.

لە ناوچەی رۆنشتد کە کەوتبووە رۆژهەلاتی روسیا ئەو یەکە جۆراو جۆرانەی هەبوو، کە هەندێك جار پێکهاتبوون لە فەوجەکانی کە تێکەڵبوون بە چەند تیپێکی ئەڵمانی بۆ ئەوەی شوێنە بە تاڵەکان بگرنەوە، لەدواییشدا یەکەی ئاسایشی هەبوو کە لەژێر فەرمانی دوو سەرکردەی سەربازی وەك لباریس و بروکسل دابوون، لەسەر پشك کرابوون بۆ سەرکردایەتی کردنی رۆژئاوا بەئامانجی بەرگردی کردن لە کەنارەکان.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم هێزانە لە کۆمەڵێك یەکەی سەربازی جۆراوجۆر پێکهاتبوو زۆر بەشیان توانای سەربازیان جێگای گومان بوو، بۆیە پێویست بوو ئەو هێزانە بەر لەوەی بەکاربهێنرێن لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیان تاقیبکرێنەوە بەو زانیاریانەی کە پێویست بوو ئەوانە دە یانزانی و لەگەڵ ئەواندا دەگونجان.

هەروەها ئەم تاقیکردنەوە یەش بەس نەبوو بۆ قەرەبووکردنەوەی زەرەە گەورەکان.

سەرکردایەتی ئەڵمانیا ناچاربوو کەوا ئەو سەربازە بەهێزانەی کە لە تەمەن بچووك بوون رابکێشێ و بیانێرێت بۆ بەرەکانی رۆژهەڵات، سەرکردایەتی رۆژئاواش بە سەربازە تەمەن گەورەکان قەرەبوو بکرێتەوە، کە بریتیبوون لەو سەربازانەی لە جەنگدا بریندار ببوون: بەمجۆرە تیپەکانی رۆژئاوا باڵا پۆش کرابوو.

بۆ نموونە:

تیپی ٧٠ لەو پیاوانەی کە بەدەستی نەخۆشی گەدەوە بەهۆی خواردنەوە دەیاناڵاند، ئەفسەری لایەنە دەستکردەکانیش دەگمەن و زۆر نەبوون لەهەموو تیپەکاندا.

ئەم تیپانە زۆربەی بە سادەیی دەجەنگان لەدژی یەکەی هاوپەیمانانە داگیرکەرەکان، بەڵام لەسنووری توانیی خۆیا. تیپێکی زرێپۆش لە بەشی رۆژئاوا هەبوو، هێزێکی کاریگەریش بوو، ژمارەیان لەنێوان ٥ — ١٠ تیپ دەبوو، زۆربەی کاتیش جێگۆرکێیان لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا پێدەکرا، ئەم تیپانەش زۆربەیان زرێپۆش نەبوون، یاخود ژمارەیەکی کەم زرێپۆشیان لەگەڵدابوو، لەبەر ئەوەی بەرەی رۆژهەڵات هەموو ئەو

زرێپۆشـیانەی هەڵاشـی بـوو، کـە تـازە دروسـتکرابوون، هەنـدێك تیپـی زرێپۆش هەبوون کە زرێپۆشیان نەبوو، هەندێ تیپیش هەبوو کە ٣٠ — ٥٠ —٦٠ زرێپۆشی هـەبوو، یـانی بـوونی ٨٠ زرێپـۆش کـە بەکـەڵکی کـارکردن دەهات بە بەخششێکی چاك دەدرایە قەڵەم.

تیپی بروسکی زرێپۆش زۆر لە تیپی زرێپۆشـی سـوپا چـاکتر بـوو لـە بـەر ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٣ ئەم تیپە بە هەموو جۆرێك پڕ سەربازو کەرەستەی سەربازی کرابوو چاکتر لە تیپی سـوپا بـە زۆر زیـاتریش لـە دروسـتکردنی بەرگریکردن.

٢—دامەزراندنی بەرگری کـەرەکانی کەنارەکـە بـەر لـە ئێسـتا باسـی ئـەم بابەتەمان کرد، بەهێزترین بەرگری کـردن کـەوتبووە نێـوان (ئەوسـتند) و (سوم) بەتایبەتی (کاپ کریـز— ینـز)، کـە زۆر بـەهێزبوو کـەوتبووە سـەر کەناری هۆڵەندی لـەژێر دەسـەڵاتی ناوچـەی رۆنشـتد، بـەڵام بـۆ رۆژئـاواو باشوور دیواری ئەتلەسی زۆر بەهێز دەبوو تـاکوو بـەخێرایی نـەدەما، بۆ بەهێزکردنی هەنـدێك چاکسـازی لـە گۆرەپـان بـۆ ئـەنجام درا، بـەڵام ئـەو هێـزە پێویسـت نـەبوو لـەرووی چاکسـازی و مۆڵگـەکانی بـەهۆی بـەهێزی بەرگریکەرەکان.

بۆیە باس نەکردنی ئەم بابەتە گرنگیەکی مەزن بوو بـۆ هەڵخەڵەتانـدن(١) هەروەکو پێشتریش باسمان کردیە.

٣—لە دەستدانی توانایی و جووڵەکردن:

شەڕی نوێ بە پلەیەك زۆر پێویسـتی بـە توانـایی و زۆر جووڵـە هەیـە بـۆ هێرشکردن و بەرگریکردن، بەڵام تیپی کەنار و تیپی پیادە زیاتر پشـتیان بـە رەشـەوڵاغەکان دەبەسـت بـۆ گواسـتنەوەیان، ئەمـەش بـە بۆچـوون و

تێڕامانی سەردەمانە وا دادەنرێت کە توانای جوولە لە دەست دەدەن، ئەمەش گرنگترین هێڵی بێ هێزی بوو.

٤-دوای ئەمە راپۆرتەکە پێی لەسەر کەم کوڕیەکانی بەرگرییەکانی دژ بە تانکەکان و تۆپەهاوێژە بڕەرەکان و زرێپۆش و تۆپە دژە ئاسمانیەکان داگرتبوو، هەروەها سەرباری ئەمانەش جەختی لەسەر بێ هێزی کەلوپەلەکانی بەشی تۆپ هاوێژەکان و چەکەکانی گەورەی پیادەی دەکردەوە کەلە هێزی سوپای بیانی وەرگیرابوو سەربەهەموو دەوڵەت داگیرکراوەکان بوو.

٥-کەمی سووتەمەنی بە پلەیەکی بەرچاو وای لە فەرماندەی کەتیبەکان کردبوو کە نەتوانن بە ئۆتۆمبێل لەبەرە درێژەکانی جەنگ بسوڕێنەوە تەنیا چەند جارێك نەبێت لە مانگێکدا. زۆرشتی تریش کە ناتوانین ئێستا باسی لێوە بکەین مەگەر بە کورتی نەبێت، بەهەرحال بەشێوەیەکی تێروتەسەڵ لەلایەن رۆنشتد لە یادگاریەکانیدا چارەسەرکراوە، هەروەها ژمارەیەکی زۆری لەو نەخشەو هێلکاری بەو یاداشتنامەیە هاوپێچ کراوەو هەرتیپپێکیش لەو ٦٠ تیپە بەجیا بەپێی توانا سەربازیەکان باسی لێوەکراوە، راپۆرتەکەی رۆنشتد تەنیا رووناکیەکی کورتکراوەیە لەرووی ژمارەی کەمی ئەو هێوانە بۆ ئەوەی ئەم هێزانە یارنەتی وێرانکەرەکان و بەلەمە هەڵمیە ژمارە کەمەکان کاریگەریان هەبێ لەسەر مەترسیەکانی دەریا لە دژی هێرشەکان.

چۆن لە توانایی ئازایەتی هەموو جیهاندا نەبوو کە بتوانێ بەم ژمارە کەمەی دەریاوانی کاریگەری هەبێت، بۆ نموونە:

ژێر ئاوییەکانی ئەڵمانیا دەچوونە قوڵترین دەریا بەبێ ئەوەی پێویستیان پێ هەبێت، لەجیاتی ئەوەی لەشوێنە ترسناکەکان هەڵسن بە ئەرکەکانیان!!

هێزی ئاسمانیش بەیارمەتی سەرکردەی گشتی کەشتی ئاسمانیەکانی سێیەم راپۆرتێکی راستەوخۆی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٣ بەرزکردەوە کە لەم ساڵەدا هێزەکانی ئاسمانی ئەڵمانیا لەرۆژئاوا ژمارەیان لە فڕۆکەی بۆردومانکەرو شوڕکەر زۆرکەم بوو، بۆیە نەیاندەتوانی گەورەیی ئاسمانی (الانکلور) و ئەمەریکیەکان بەسەرکەوتوویی بپارێزن.

رۆنشتد لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٣ راپۆرتەکەی بەدەستی ئەفسەرێك بۆ بارەگای هیتلەر نارد لە روسیای رۆژهەلات، دۆخێکی خستە بەردەم سەرۆکی دەوڵەت، چەند رۆژێك هیچ شتێك رووی نەدا گەرچی سەرکردایەتی رۆژئاوا هەستیان کرد کە ئەم راپۆرتە لەسەر بناغەیەکی پتەو ئامادە کراوە، بۆیە پێویستە هیتلەر چاوی بکاتەوە، ئەو پشت گوێ خستنەی سەرکردەکانی رۆژئاوا تاکوو ئێستا بەدەستی ئەنقەست نەبووە، بەلام هیوایەکی پێویست بوو، سوێندی هەرە گەورەی سوپای ئەڵمانیش ئەوەبوو کە بەشەو و رۆژ لەنێوان دەریای رەش و دەریای بەلتیق شەڕبکات لەدژی روسیا، لەساڵی ١٩٤٢ کە بۆیان دەرکەوت دەستەی هاوکاریان رۆژ لەدوای رۆژ لە زیادبووندایە، لەبەر ئەوە واپێویست بوو کە هەرشتێك توانای خزمەتی هەیە دەبێت بۆلای رۆژهەلات رەوان بکرێت، شەڕێکی زۆرتووند لە باکووری ئەفریقاو بەرێوە دەچوو، دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ئەفریقیاو رووخانی ئیتالیا شەڕەکە درێژ بووەوە بۆلای خۆی هێمنیەکی کاتیش رۆژئاوای داگرتبوو مەگەر هێزەکانی ئاسمانی و هێرشی زەمینی سادەو جارجارە نەبێت.

لەسـالّی ١٩٤٣ بـارودۆخی نـاوەخۆ زۆر ئـالۆزبوو کاتێـك بزوتنـەوەی بەرهەڵسـتی توونـدترو گەشـەی دەسـەند تـا گەیشـتە پلـەی چـاو سورکردنەوەی سەربازی.

رۆنشتد هـەردەم سـەیری شـتەکانی بەشـێوەیەکی گشـتی دەکـرد نـەوەك ناوەخۆ، زۆریش وردەکاری لەسـەر نەخشـەی رۆژهـەڵات دەکـرد نـەوەکوو نەخشەسازی رۆژئاوا هـەروەکوو پیـادەکردنی هـەردوو شـەڕی رۆژهـەڵات، ئەوەندەی گرنگـی بەخوێندنـەوەی راپۆرتـەکانی بـەرەی رۆژهـەڵات دەدا، ئەوەندە ئـارەزووی لەخوێندنـەوەی راپۆرتـەکانی بـەرەی رۆژئـاوا نـەبوو، لەبەر ئەم هۆیەش تا کۆتایی سالّی ١٩٤٣، بەدابەزینی تیپی رۆژهـەڵات و باشوور رەزیل نەبوو، لەراستیا ئەو هەستا بـە پێکهێنـانی وێسـتی خـۆی، بەڵام کاتێك هەستی کـرد دۆخەکـە لـە رۆژئـاوا بـەرەو نائومێـدی دەچـن، ئەمەش شتێکە کەم سەرکردەی دووربین ئەم کارە بکات، بـەڵام زۆربـەیان بەتووندی دەست بەو هێزانە دەگرن کە بەدەستیانەوەیە.

لەسەر رۆنشتد پێویست بوو کە بە هیتلـەر رابگەیـەنێ کـە چـیتر ناتوانـێ پالّپشتی بەردەوام و بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ بەرەی رۆژهـەڵات یـاخود بۆ ئیتالیا بنێرێ، لەبـەر ئـەوەی مەترسـی لـەرۆژئاوا لـە زیاد بووندایـەو بەرپرسیاریەتێکی گەورەشی کەوتبووە سەرشـانی، ئێسـتاش کـاتی ئـەوە هاتووە سەربازو کەرەستە بۆ سەرکردایەتی رۆژئاوا ئامادەبکات، یـەرباری هەموو مەترسـیەکانی دیکـەی کـە لـە بـەرەکانی تـردا هـەبوون، دەبێـت هیتلەر بۆ بەهێزکردنی رۆژئاوا چیبکات.؟

سات لەدوای سات دلّە راوکێ ی لە زیاد بوونـدابوو هـەر لەگـەڵ دابـەزینی هاوپەیمانان لە پرتوگال و ئیسپانیاو جەزائیری بلیارد، بـەمانا لـە باشـوور

بۆ هێرش بردنه سەرناوچەی سەرکردایەتی رۆژئاوا بۆیە هەستا بەدانانی چەند پلانێك لەژێر چەندین ناوی هێما، ئەمەش هەرچۆنێك بێت شتێکی ئاسایی نیە کە خوێنەر حەز بە خوێندنەوەی بکات.

رۆنشتد خۆی لە خۆیا لەو باوەڕدا نەبوو کە هاوپەیمانان ئەو پلانە جێبەجێ بکەن، هۆکارەکانی باوەڕ هێنانەکەشی ئەمانەی خوارەوە بوون، ئەوە پێویستی بەپێشێل کردنی بی لایەنی هەیە، ئەمەش کارێکی هاوپەیمانان بۆ هۆکاری گەلێکی سیاسی پەیڕەوی ناکەن.

هەروەها ئەو بەچاوێکی بەرزەوە دەیڕوانیە ئیسپانیەکان باوەڕی وابوو کە ئەوان بەرگری لە خۆیان دەکەن دژ بەهەر هێرشی و پەلامارێك کە هاوپەیمانان لەو حالەتەدا دەبێ رێگای دوورو درێژی نێوان زنجیرە چیای برانیس بەرەو باکوور بگرێتەبەر، رێگاکانی ئیسپانیاش و تۆری هێڵی شەمەنەفەر بەتایەبتی بەرادەی پێویست گونجاو لەبەر نەبوو کەرێگا بە هاوپەیمانن بدا لەماوەیەکی کەمدا بنکەیەکی پەڵ هاویشتن و جوولەکردن بنیات بنێ هەرچەندە ئەوکارە پێویست و زەروور دەبێ لەپێناو دەست کردن بەهێرش و پەلامارێکی یەکلاکەرەوە لەوێوە.

رۆنشتد لەگفتوگۆ کردندا والێڕاهاتبوو و دەربارەی ئەم پلانە دەیگوت: (هاوپەیمانان هێندە گێل نین کەوا سەربەرزی ئیسپانیا پێشل بکەن، هەروەها ئیسپانیەکانیش رێگایان پێ نادەن، هەموو مرۆڤێکی ئاسایی دەیتوانی هەست بەزەحمەتی هاتنە پێشی هاوپەیمانان بکات بەتێپەربوون لە برانیس کارون و لوار، ئەمانەش هەموو دەتوانرێ بە نرخێکی کەم بەدەست بێن بە دابەزاندن لەشەڕداو بە پاڵپشتیکردنی

بنکەیەکی باوەڕ پێکراو لەئینگلتەرە، هەروەها ماوەی ڕۆیش تن لـەوێوە کورترە لەوەی لە ئیسپانیاوە دابەزن...

هیتلـەر لـە هەڵسـەنگاندنی خۆی لـە ئیسـپانیا نوشسـتی هێنـابوو، بۆیـە فـەرمانی دەرکـرد لەهەرشـتێك دووربکەوەنـەوە کـەوا شـپرەزەیان دەکـا. بۆیە نەخشەکانی ئەم جوولانەوە بە پـارێزراوی لەسـەرکردایەتی ڕۆژئـاوادا مایەوە، لەبەر ئەوەی هیچ شتێك تێدا جێبەجێ نەکرا.

بارەگای سوپای ئەڵمانی بەوە سەر قاڵبوو کە دابەزین لە ڕۆژئاوا نابێت و زۆر دوا بخرێت، روسەکانیش چوونە قۆناغی پەلاماردان و بـەرەی جـەنگ، ئەڵمانیان پاڵدەناو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهێزتر دەبوون.

بەهێواشی و لەسەرخۆ ڕێگای خۆیـان دەبـڕی و کـەرت لـەدوای کـەرت لـە باشـوورەوە بـۆ بـاکوور تێدەپـەڕین، وا زانرابـوو کـەوا هاوپـەیمانان خـۆ ئامادە دەکەن بە ئامادە سازیەکی ترسناك بـۆ هێرشـکردنەکی بـەرفراوان لـەڕۆژئاوا، ئـەو ڕاپۆرتـەی کـە ڕۆنشـتد لـە تشـرینی یەکـەمی ئۆکتۆبـەر پێکـەش هیتلـەری کردبـوو زۆر کاریگـەری دروسـتکر، بۆیـە بـەخێرایی فــەرمانی نـوێ یــەکلا کــەرەوەی بەپەڵــە دەرکــرد بــۆ بــەهێزکردنی سەرکردایەتی ڕۆژئاواو پڕکردنی بەسەربازو جبەخانە.

هەرچۆنێك بێت بۆ ئەنجامدانی ئەم فەرمانە کات زۆر درەنـگ بـوو، لەبـەر پشت گوێ خستنی بەرەی ڕۆژئاوا نەتوانرا چـەند مانگێـك ئـەم فەرمانـەی بقۆزنەوە لەگەڵ ئەوەشا چەند لە تواناادا هەبوو جێبەجێی کرد.

ڕێنماییەکانی الفوهرری ژمـارە (٥١) زۆر درێـژ دادڕبـوون بـە جۆرێـك کـە داوای لێبوردن لە دەرخستنی لێرە ئەوەندە بەسە کە ناوەڕۆکی بابەتەکە بگوازینەوە.

پێش هەموو شتێك هیتلەر ڕێنماییەکانی خۆی توندکرد کەوا هاوپەیمانەکان هێرش دەکەن سەر ڕۆژئاوا، ئەگەریش مسۆگەرە کە بەم نزیکانە یانی سالّی ١٩٤ ڕوودات، ئەنجامی شەڕەکەش بەستراوەبە سەرکەوتن و شکست هێنان. لەو باوەڕدابوو کە هێرش کردن لە کەنار ڕوودات و شەڕ بکەوێتە بەرەی سوپای پانزدەهەم. یان شەڕەکە نزیکەی بکەوێتە نێوان ئۆستەندو هافر. ئەم بۆ چوونەش نزیك بوو لە بۆ چوونەکانی ڕۆنشتدو هەروەها بۆچوونەکانی منیش، بەڵام دەستپێکی ئەم کارانە لەوەدابوو (نابێت دەست لەیەك بستە زەوی هەڵبگرین) بەمانای ئەوەی پارێزگاریکردن لە کەنار بە هەر نرخێك بێت، ئەمەش هیچ تێڕوانینێك نەبوو کە لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی ڕۆنشتد یەك بگرێتەوە، زۆرجاریش ئەو جیاوازیە سەرەکیانەم دەستنیشانکردووە کە لەنێوان بیروباوەڕی هیتلەرو بەرگریکردنێکی وەستاو لەگەڵ بیرو باوەڕی مشیر ڕۆنشتد و جووڵەی سەربەخۆ، دەبێ ئێمە ئەو ڕاستیە لەبەرچاومان بگرین لەبەر ئەوەی ڕۆڵێکی گرنگی دەبینێ لەسەر هەموو شتەکانی ترو تاکوو خانەنشین کردنی ڕۆنشتد لە تەمووزی سالّی ١٩٤٤ کە درێەی هەبوو، لەهەموو ئەوەش گرنگتر یەدەگی ناوەنجی کە زۆر بەگەرمی داوای پێکهێنانی دەکرد لە ٥ تا ٦ تیپی زریپۆش و ٨ – ١٠ تیپی پیادجە لەناوچەی پاریس و تا باشووری پێك نەهات.

دە تیپی پیادە بۆ ناوچەی پاریس و باشووری.

گەرچی هەندێك بارەگا هەبوون بۆ قەرەبووکردنەوەی زەرەو زیانەکانی یەکە ڕاهێنان و تۆپ هاوێژەکانی سوپاو پێکهاتە بچووکەکانی تر، کە بڵاوکرابوونەوە لەسەر کەنارەکان، ئەمەش بۆ قەرەبووە یەدەگە ڕەوان کراوە گەورەکان نەبوو هەرەوەکوو ڕۆنشتد دەیویست.

سەرەرای ئەمانەش رۆنشتد پەیمانی دابوو کە یارمەتیان بەهێزە ئازاو شەڕکەرەکانی هێزی ئاسمانی بدات کە لە رایخ و رۆژهەڵاتبوون، سەرکردەی گشتی هێزی سێیەمی ئاسمانی مشیر (اسبیرل) ژمارەی ئەو رادارانەی پێ راگەیەنرا، ئەوش لەلای خۆیەوە رۆنشتدی بەوە ئاگادارکردەوە، ئەم کارە زۆر پێویست بوو، چونکە دەبێتە بەردی بناغە کە هێڵی بەرگری لەسەری دەوەستێت بەو شێوەی کە سەرکردایەتی رۆژئاوا دەیەوێت، بەڵام دەبی دان بەوە دابنێین کە هیتلەر هۆکاری خۆی هەبوو کە ناچاری کرد شێوەیەکی بەرگری ووشك وتووند لە کەنارەکانی رۆژئاوا پەیرەو بکات، هیتلەر لەوانە بوو کە پێیان وابوو هێزەکانی ئەڵمانیا لەوبارودۆخێکدا نین کە رێگایان پێبدات بەهەموولایەك و ئاراستەیەکدا جوولە بکەن، ئەمەش تەنها لە رۆژهەڵاتدا کارێکی ئاسان بوو کە رووبەرێکی پان و بەرین و فرەوانی هەیە دەکرێ ئەوجۆرە جوولەو بزاڤانە تیایاندا پیادە بکرێ، کارێکی پێویست بوو کە کەناری رۆژئاوا لەدەست دەرنەچێت کە رووبەرەکەی سنووردارن، چونکە دەست هەڵگرتن لەکەناری دەبێتە هۆی گەیشتنی دوژمن بەخێرایی بۆ سنوورەکانی ئەڵمانیاو بنکە ئاسمانیەکانیشی پێشکەش بەرۆژهەڵات دەکات..

هەروەك تەواوی بنکەکانی چەکی سەرکەوتن ژمارە (١) و (٢) لە رۆژئاوا دامەزراون، دەبوایە لە دەستیان بدەین هەموو کاتێك دوژمن بەنێو فەرەنسادا پێشرەوی بکات.

ئەم هۆکارانەش بەڵگەی ئاشکراو روون بوون، گەرچی رۆنشتد بۆچوونەکانی خۆی بەپێچەوانەی کەم بۆ چوونانە دەبینی کە ئەڵمانیا شەڕی سەربازی لەهەربارێکدا کردبێت دۆراندویەتی، کۆتایی شەڕیش

وەستاوە لەسەر کات و لەسەر سیاسیەکان پێویستە ڕێگا چارەیەك بدۆزنەوە.

لە کاتێکدا ئەگەر هاوو سەربازەکان بەتەنها نەیانتوانی ئەم دۆخە بگۆڕن، لەراستیدا رۆنشتد و هەندێك لەسەرکردەکانی تر پێیان وابوو ئەڵمانیا لەو رۆژەوە شەڕەکەی دۆڕاندووە کە هیتلەر شەڕی بۆ سەر رووسیا دەستپێکرد.

فەرمانەکانی پارێزگاریکردنی کەناریش لەهەموو بارودۆخێکدا بۆ چوونێکی تەواوە، بۆیە گەر بهاتباو بەرگری کەرەکان بێهێز نەبان هەروەکوو باسمانکرد لەجێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە توندانە، لەسەر تیپی کەناری بێهێزو خەراپیش سەخت بوو ئامادە سازی بکات و بەرگری لە کەرتی نێوان ٢٥ — ٣٠ میل بکات. هەتاکوو فەرمانی توندیش نەیدەتوانی ئەم گۆڕانکاریە ئەنجام بدات، تاوای لێهات رێگانەدرا لە رۆژهەلات شێوازی جوولەی بەکاربێنن، لێرەشدا لە نائومێدیەکی بنەڕەتیدا شتێکی تر پەیڕەوکرا ئەویش (خۆڕاگر بە تاکۆتایی)..!!

بیرۆ بۆچوونەکانی رۆنشتد لەسەر بەڕێوەبەردنی شەڕی خۆپارێزی زۆر جیاواز بوو لەگەڵ بۆچوونەکانی سەرکردەی بالا.

نموونەی ئەمەش پێناسەی بۆچوونەکانی زۆردەکرد:

((پێویستە واز لە باشووری فەرەنسا بێنین بەگشتی لەباشووری لوارو کشانەوەی هەموو ئەوکەرتانەی لەوێدا هەن، بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی یەدەگ لەناوچەی پاریس، لەکاتێکدا ئەگەرهاتوو هاوپەیمانان لەبەری قەناڵەوە دابەزین))..

لەبەر تیشکی ئەم بۆ چوونە رۆنشتد هەستا پێشنیارێکی پێشکەش بە هیتلەر کرد، کە چارەنووسەکەی دۆڕان بوو، لەبەر ئەوەی ویستی هیتلەر مردوو بوو: ئەویش پارێزگاریکردن بوو لە ٥٠٠٠ هەزار میل لەبەری کەنار بە تێکڕایی!

لە ئەنجامدا ئەم بیرۆچکەیەش بۆ فەریق (جودل) لە نامەیەکدا روون بووەوە کە لەدواییدا لەگەڵ سەرۆکی گشتی لەسەری رێکەوتن، پێویست بەگوتن ناکات چونکە من هیچ وەڵامێکم وەرنەگرتووە...

پێشنیارەکانی رۆنشتد بە گوێرەی بیرکردنەوەی هیتلەر دووبارە بەسەریدا بچێتەوە.

بۆ ئەوەی خوێنەر باوەڕ بە کەمی هێزەکانی ئاسمانی ئەڵمانیا بهێنێت لەرۆژئاوا لە کۆتاییساڵی ١٩٤٣ چەند ژمارەیەك دەهێنینەوە:

١-فڕۆکەی جاکوار (شەڕکەری بچووك) کە ژمارەیان (٣٤٣) فڕۆکەبوو لەمانە تەنها (١٨٠)یان بۆ بەکارهێنان دەگونجا.

٢-فڕۆکەی شەڕکەر ژمارەیان (٣٤٠) فڕۆکە بوو لەمانە تەنها (٢٥٠)یان بۆ خزمەتکردن دەگونجا.

٣-فڕۆکەی بۆردومانکەر (٢٩) فڕۆکەبوون لەمانە تەنها (١٣)یان گونجاو بوو.

٤-فڕۆکەی زانیاری و هەواڵی دوور ژمارەیان (٨٠) فڕۆکەبوو لەمان تەنها (٢٨) یان بۆ کارکدن دەشیان.

٥-فڕۆکەی زانیاری و هەواڵی نزیك کە ژمارەیان (٤٠) فڕۆکەبوو تەنها (٢٥)یان بۆکارکردن دەشیان.

٦-تۆپە دژە فڕۆکەکان کە ژمارەیان (٣٣٩) بەتەریەی قورس بوو، تۆپە سوکەکانیش ژمارەیان (٤٠٢) بەتەریەبوو.

خوێنەریش دەتوانی لەوە بگات کە سەرکردایەتی رۆژئاوا نەیدەتوانی شەڕێکی بەرگری بە درێژایی (٢٥٠٠) میل بکات بە ژمارەیەکی هیچ لەبەرامبەر گەورەیی ئاسمانی هاوپەیمانان.

سەرەڕای کەمی سوتەمەنیش ئەو ژمارە کەمەی فڕۆکەی نایابەکان ئەرکەکانی خۆیان بەجێ دەگەیاندو سوتەمەنیش بەشی فڕۆکەکانی نەدەکردو مەگەر کەمێکی نەبێت، گەرچی فڕۆکەوانە ئەڵمانیەکان لە ململانێی ناخۆشیەکان زۆر دەگمەن بوون و لە خەباتێکی بێ هیوا بەردەوامبوون کەوا شایەنی گەورەترین پاداشت بوون.

هێزی ئاسمانی هاوپەیمانان لەسەرتای هێرشەکانیان لەرۆژی ٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٤ هەروەکوو لیوا (فولر)(١) لە کتێبە بێ وێنەکەی شەڕی جیهانی دووەم باسی کردووە بەمجۆرە بوو:

١-فڕۆکە بۆردومانکەرەکان ٢٢١٩ فڕۆکە.

٢-فڕۆکەی گواستنەوە ٢٣٩٥ فڕۆکە.

٣-٨٦٧ فڕۆکەی سەرئاو.

بەناوبانگترین کتێبی سەربازی بەریتانییەکانە.

هەرچۆنی بێت لەوانەیە ژمارەی فڕۆکە شەڕکەرەکان کەمتربن لەوەی کە (فولر) باسی کردوون، چونکە گەورە یی ئاسمانی هاوپەیمانا لەبارچاوبوو، سەرکردایەتی رۆژئاواش لەو کاتیدا زانیاریەکی ز ۆریان لەسەر هێزو مەبەستەکانی دوژمن نەدەزانی، هەروەها ئامێرێکی سیخوری تایبەتی

خۆیـان نـەبوو، لەبـەر ئـەوەی خزمـەتی سـەربە سـوپای ئـەڵمانیابوو، سەرکردایەتی رۆژئاوا جاجارە دەیتوانی هەندێك هەواڵ لـەم دەسەڵاتانەی خـوارەوە وەربگـرێ ئـەوانیش هێـزی دەریـایی رۆژئـاوا، سـەرکردە سـەربازیەکانی ئاسمـانی سـێیەم، هێـزی دەریـایی رۆژئاوا،سـەرکردە سەربازییەکانی پاریس و برۆکسل، سەفیری ئـەڵمانیا لـە پـاریس و یـاخود لەهۆبەی هەواڵگری تایبەتی هێزی بروسك.

رۆنشتد هرەدەم لە تاریکیدا کـاری دەکردو ئـەم زانیارایانـەی کـە وەری دەگـرتن لـەبارەگای هیتلـەرەوە بەدەسـتی دەگەیشـت ئەگەرچـی زانیارییەکان کەمیش بوون، هەروەها دەیتـوانی داوای زانیـاری ئاسمـانی لـە کەشـتی ژمـارە (٣٩ بکـات دەربـارەی قـەنال و ئینگلتـەرەو رۆژئـاوای دەریای س پی ناوەڕاست تـاکوو دەگاتـە دەوروبـەری (سـردینا)، گەرچـی ئەم فڕۆکانە زۆربەی کات نەیاندەتوانی بە ئامنجەکانیان بکەگـەن، بـەڵکو زۆریـان لـە شـوێنی دواوەی خۆیـان دەداو هێـزە شـەڕەکانی دوژمنیـان نەدەپێکا. لەهەمان کاتیشدا کەوا چـەند چرکەیەکی خێـرا لێـرەوە لـەوێ زانیاری لەشەودا لەسـەر گواسـتنەوەی سـەربازەکانی باشـوور ئینگلتـەرە وەردەگرت.

هەرچـەندە ئـەم تیشـکە زانیاریـە کەمانـە کـەلکێکی زۆری نـەبوو، هێـزی دەریایی رۆژئاواییەکانیش لەچەند یەکەیەکی بچوکی کـەم پێکهـاتبوون و ئەو هێزە نەبوو کە بتوانێ بەردوام زانیاری بەدەست بهێنـێ تـەنها لـە هەنـدێك کـاروان نـەبێت بـەو پێیـەی کـەنزیکبوو لـە کـەناری ئینگلتەرای باشوور، بەڵام راستەقینە چییە؟

لەوێ کەس نەیدەزانی چ ڕوودەدات!.. هەر لە ئینگلتەرە ژمارەیەکی لە بریکارەکانی ئامێری بێ تەلیان پێ درابوو، جار جارەش دە یانتوانی هەندێك زانیاری رەوانە بکەن.

هەر چۆنێك بێت (خزمەتگوزاری ئاسایشە ناوەخۆییەکان)(١)ی بەریتانی بەشێوەیەکی چاك کاریان دەکردو هەر بۆیەش بەریتانیا لەلای ڕۆنشتد خاکێکی قەدەغە کراو بوو.

هەروەکوو ناسراوە لە ساڵەکانی (١٩٤٣ -١٩٤٤) کەوا دوو سوپا جۆراو جۆر لەباشووری ئینگلتەرە هەبوو، یەکێکیان بە سەرکردایەتی لیوا (ایزنهاور) و ئەوی تریان بەسەرکردایەتی لیوا (مونت کومری) بوو، بەڵام چۆن ئەم دوو سوپایە پێکهاتن؟ کەس ناتوانێ بیزانیت!

لەوێدا مەشقی تایبەتی دەربارەی دابەزین ئەنجام دەدرا، ناوچەی کەناریش بۆ هاوولاتیان بەشێوەیەکی گشتی ببو بە ناوچەیەکی قەدەغە کراو، هەروەها بەهۆی تۆڕی دیبلۆماسیەتی وڵاتە هاوپەیمانەکان زانیاریان دەست دەکەوت و ناوەناوەش مۆڵەتی سەربازەکانی هەڵدەوەشاندوە، هەروەکوو هەندێك لە فرۆکەوانە ئەڵمانیەکان تێبینیان دەکرد لە گواستنەوەی ئامێرەکان کە زۆر بە ڕوون و ئاشکرا بەرەو باشوور دەچوون. هەروەها هاوپەیمانان بۆیان ببو بەسەرچاوەیەکی گرنگ، بەڵام نایدەتوانی وەکوو پێویست زانیاری زۆر کۆبکەنەوە، بۆیە گرنگیەکی تایبەتیان دا بەناوچەی دەوروبەری دورگەی (وایت) تاکوو دەگەیشتە ئاستی (بورد پموپ)، بەڵام بیرکردنەوەی ئاسایش لەوێ بەشێوەیەکی تایبەتی زۆر بی هێزبوو.

رۆنشتدو دەستەی ئەرکانەکەی لەساڵی ١٩٤٣ بیروڕای راستەقینەیان وابوو کە هێرشی هاوپەیمانان لەنێوانئەوستند و هافر دەبێت، لەدواییدا هێدی هێدی هاتنوە سەرخۆو بەشێوەیەك کە بیروڕایان رۆژ لە دوای رۆژ لە زیادبووندابوو کە هێرش بەرەو (نورماندی) یان (بریتانی) دەکرێت.

رۆنشتد پێی وابوو کە ناوچەی دورگەی (وایت) بۆی هەیە بەئاسانی ببێتە مۆڵگەیەکی قەڵەم بازی، بۆیە هەموو ئەو راپۆرتانەی کە یەك لەدوایەك بۆ هیتلەر بەرز دەکرانەوە لایان وابوو کە هێرشی چاوەڕوانکراو لەدژی (نورماندی) ببێت. بەندەرە دەستکردەکانیش تا ئەو کات بەرێژەیەکی کەم ناسرابوون تەنها کەمێکیان نەبێت(١)، وایان دانابوو کەوا دوژمن لە دەشتاییەکی رووت ئاشکرا هەڵدەستێت بەدابەزین.

بەتایبەتی لەو بەندەرەی کە شوێنی ناردنە دەرەوە بوو.

(شارلبورگ) یەکێك بوو لەو بەندەرانەی نادرنە دەرەوە کە دەتوانرا جیابکرێتەوە لەو دەریایەی کە لە تەکیابوو، گومان لەزیادبووندا بوو لە دەرەوەی ئەو بۆچوونەی کەوا دۆخی کەنارو ئەو ئاوەی کە درژایە ناو (سین) و (شارلبورغ) لە بارنەبوو، وەك بۆ چوونێك کەوا بۆ دابەزین کەشتی بارهەڵگر پێویستی بەشێونێکی فرەوان هەیە، هیچ بناغەیەکی جێگیریش نەبوو پاڵپشتی لەو پێشبینیەی دابەزین بکات، لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی زانیاری سنووردابوون.

بۆیە کاروبارەبان بۆ هۆبەی هەواڵگری هاوپەیمانان زۆر لەوە ئاسانتر بوو!

کەهێزێکی ئاسمانی زۆر کارامەو وسەرکەووتوو لەژێر فەرماندەی ئەوان دابێت: هەموو جۆرە زانیاریەکی چاکیان دەهێنا، دوژمن بەسەر دەریادا

زۆر زاڵبـوو، لـەژێر فەرمانیشـیاندا تـۆڕێکی سـێخوری رێـك و پێکـی لـە ناوجەرگـەی رێکخراوێکـی نێـو دەوڵەتیـدا لـە سوێسـراو وڵاتـانی تـردا هەبوون، لەمەش زیارت خزمەتگوزاری سـیخوری هاوپـەیمانان دەیـانتوانی بـەبێ هـیچ کێشـەیەك لـە وڵاتـانی وەك فەرەنسـاو بـەلجیکاو هۆڵەنـدا کاربکەن. کێ هەبوو بەرامبەریان نارەزایی دەربېڕێت!

هیچ بەرگریەك لەبەرامبەریان نەبوو، هەر وەکوو دەیانتوانی پاڵپشـتیەکی زۆری دانیشتوانیش بەدەست بېێنن، بەتایبـەتی بزوتنـەوە (گـەریلا)کـە مەترسیەکان رۆژ لەدوای رۆژ لە زیادبووندا بوو.

ئێمە دەمانزانی کەوا نزیکەی ٣٠٠ وشـەی نهێنـی هێمـادار هـەبوو، کـە لـە پەیوەندیە نهێنیەکانی نێوان ئینگلتەرەو بزوتنەوەی (گەریلا) لە رۆژئاوادا بەکاردەکات. هر بۆ نموونە:

یەکێك لەم وشە نهێنیانە ئەوە بوو (کلب صدیقتنص الارنب) واتە (سەگی راو کەروێشك راو دەکات) ئەمەش نیشانەیەکە کـەوا ماناکـەی پێچـەوانەی مانـا دیارەکەیـە، مانـای ئـەو وشـە نهێنیانـەش ٥٠٪یـان لـەلای ئێمـە زانراوبـوون، بـەڵام مانـای هەنـدێك لـە وشـەکانیمان نـەدەزانی و تێنەدەگەیشتین.

## بەشی یازدەهەم

### سالّی هێرشەکە

تێگەیشتنەکانی مارشالّ ڕۆنشتد لە ئان و ساتی هێرشەکەی هاوپەیمانان بەم شێوەیە بوو: ڕۆمل لەپاش نوشستی ئەفریقیا بێ کارو بەرپرسیاریەتی بوو، هیتلەریش هیوایەکی زۆری بەو مارشالّە لاوە هەبوو کە هەموو گیانی چالاکی و داهێنان بوو، پیاوەکانیشی زۆر خۆشیان دەویست، ڕۆمل خۆی دەیویست لە کارو چالاکی دابێت، لە هەلێکیش دەگەڕا بۆ ئەوەی بۆشایی نوشستیەکەی ئەفریقا کە شایەنی ئەو نەبوو پڕ بکاتەوە .

مارشالّ (کیسلرنگ)ی سەرۆکی گشتی بەرەی باشووری ڕۆژئاوا لە ئیتالیا دەجەنگا، بەرەکەشی لەو کاتەدا زۆر لە باشووری پێلاوە درێژەکە (نەخشەی ئەو کاتەی ئیتالیا لەسەر شێوەی پێلاوێکی درێژ بوو) دوور بوو، بۆیەش بڕیاریدا مارشالّ رۆمل لە دەستەی ئەرکانی سوپای (ب) لە باکووری ئیتالیا دەست بەکاربێت، ئەرکەکەشی کۆنترۆل کردنی بەرگرییەکانی دورگەی جەنەوا و بوندقیەبوو دژی دابەزینەکانی هێزی هاوپەیمانان، لە هەمان کاتدا بەرپرسی دابین کردنی پالّپشتیەکانی ئەلّمانیا بوو بۆ ئیتالیا لە ڕێگەی چیای ئەلپەوە تا سنوورو پاشان ناردنی پالّپشتیەکان بۆ بەرەی (کیسلرنگ) لە باشوورو ئیشەکەی دیکەشی دامالّینی هێزی ئیتالی بوو بەشێوەیەکی ئاشتیانە لەو چەکانەی کە لەژێر دەستیان دابوو، پاشان ئەو یەکە ئیتالیانە ڕێك بخاتەوە، بەتایبەتی

ئەوانەی بڕوایان بە وەفاداریەتی یەکێتی ئەڵمانیا هەیە، ئەوەش لەو کاتەی کە ئیتاڵیا دەڕمێت.

ئەم ئەرکە تازەیەش لەگەڵ ڕۆمل وەکو سەربازێك هەرگیز نەدەگونجا، دابەش کردنی بەرپرسیارتییەکان لە ئیتالیا هەروەك لە سەرکردایەتی ڕۆژئاوازۆر خراپ بوو، چونکە پێویست بوو بەرپرسیاریەت لەژێر دەستی یەك سەرکردە دابێت، نەك دوو سەرکردە، بۆیە چاوەڕوان دەکرا کێشە لەسەر بەرپرسیارەتیەکان ڕوو بدات، ئەگەرچی هەردوو مارشاڵەکە هاوڕێیەتی و یەك مەبەستیان هەبوو لە دونیادا.

دەتوانیت بەخوازراوی بڵێیت کە ڕۆمل پێشبڕکێی (کیسلرنگ)ی دەکرد، بۆیەش کیسلرنگ داوای لە هیتلەر کرد کە یەکێکیان بۆ سەرکردایەتی هەڵبژێرێت، هەربۆیەش لەدەستەی ئەرکانی سوپای ئەڵمانیا بیرۆکەی هەڵوەشانەوەی دەستەی ئەرکانی سوپای (ب) دروست بوو، بەڵام هیتلەر داوای کرد ئەو دەستەیە پاڵپشتی لێبکرێت چونکە چاوەڕێی دروست بوونی ڕووداوی گرنگی دەکرد لەبەرەی ڕۆژئاوا، یان هەر بەرەیەکی تر، بۆیەش وەکو یەدەگ دەستەکەی هێشتەوە، پاشان ڕۆمل دەستەکەی راسپارد کە لەماوەی داهاتوودا بەرپرسیاریەتیەکی مەترسیداری پێ دەسپێرێت لەشوێنێکی دیاریکراودا، بۆیەش هیتلەر بەرپرسیاریەتی پشکنینی بەرگرییەکانی ڕۆژئاوای بە ڕۆمل سپاردو چەندان ئامۆژگاری کردن، کە سەرکردایەتی ڕۆژوئاوا لە مەبەستی ناوەڕۆکەکەی تێنەگەیشتن.

مەبەست لە دامەزراندنی ڕۆمل بریتی بوو لە :-

١-ئاشنا کردنی بەو یەکەیەی بەرەی ڕۆژئاوا کە پارچەیەکی یەکلاکەرەوەبوو لەبەرەی (قەنال).

٢–پەرەوکردنی توندترین یەکەی بەرگریکردن لەبەرەی رۆژئاوا لەلایەن ئەو مارشاڵە لاوەی کە جێگەی متمانەی تەواوی هیتلەر بوو لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی بەهێزی بە ئەندامانی پارتی نازی و رێکخراوی (تود) و (ئەبسیر) و (کوبلز)ی وەزیر هەبوو، بۆیەش دەتوانێت هەموو شتێکی لێیانەوە دەست بکەوێت.

٣–سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ڕۆمل لەشەڕی دژی بەریتانیەکان.

ئەم خاڵە گرنگانە لەڕاستیدا ناوەڕۆکی تایبەتی پێشنیارەکانی هیتلەر بوو بۆ ڕۆمل، زۆر لە ئەفسەرە کۆنەکانی سەر بەهیتلەر پێشنیارەکانیان جێبەجێ کرد، سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئەڵمانیش فەریق (جودل) بۆ جێبەجێ کردنی ئەو هێڵانەی هیتلەر داینا پەیوەندی بە ڕۆمل کرد، هیتلەریش لەلایەن خۆیەوە داوای لە ڕۆمل کرد کە ئەنجامی پشکنینەکانی بۆ رۆنشتد ڕوون بکاتەوە.

ئەم ئامادەکارییانە بەپێی سروشتی کارەکان چاك نەبوو وەکو ئەوەی پێشتر لە ئیتالیا پێشنیاری بۆ کرابوو، یان ئەو ببووایە بە سەرکردەی گشتی یان ئەوی تر، چونکە دەبوایە یەك سەرکردە هەبێت و بەرپرسیاریتەکان وەربگرێت نەك دوو سەرکردە.

هیچ جیاوازیەك لە نێوان رۆنشتد و ڕۆمل دا نەبوو بەقەد ئەوەی لە نێوان سەرۆك ئەرکانەکاندا هەبوو، بەڵام نەشدەتوانرا ڕێگە لەو بەیەکداچوونانە بگیرێت کە لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی ئەرکەکاندا دروست دەبوو.

ڕۆمل هەموو کات رێزی لە پیاوەتی رۆنشتد دەنا، رۆنشتد بەهۆی تەمەن و کولتور و پێگەیاندنی جێگەی رێزی کەسانی دەوروبەری بوو.

ڕۆمل لەسەر حەق بوو کاتێك ڕاستەخۆ پەیوەندی بە هیتلەرەوە کرد، بۆیە نەیدەتوانی ڕێگری لەبەرپرسیاریەتی سوپا بکات کە بەسەرکردایەتی ڕۆنشتد بوو، ڕۆنشتد یان ڕۆملی پشکێنەر! ! ئەم بەرپرسیارییەتە کێبرکێی لەنێوان خەڵکی هەردوو بازنەکەدا دروست کردبوو، لە سەرکردایەتیش ئەم کێبرکێیە ڕەنگی دابووەوە بەتایبەتی لەسەرکردایەتی هێزی چەکداری ئەڵمانیا و هێزی ئاسمانی سێیەم و دەریایی ڕۆژئاوا.

پشکنینەکەی ڕۆمل بۆ ئامادەکارییەکانی بەرگری کەناری ڕۆژئاوا تا دانیمارك درێژدەبووەوەو، هەتاکو لە ناوچەی ڕۆنشتدیشی ڕەت دەدا.

لە تشرینی دووەمی ١٩٤٣ مارشاڵ(کایتل) لەسەر فەرمانی هیتلەر گەیشتە پاریس بۆ ئەم مەبەستە، هەروەها ڕوونیکردەوە کە هیتلەر بڕیاری گۆڕینی کەسەکانی داوە، (ڕۆمل)یش دەبێت لەژێر فەرمانی ڕۆنشتد دابێت کاتێك سوپای (ب) ئامادەکاری دەبێت بۆ شەڕکردن.

لەسەردانەکەیدا کایتل ڕای هیتلەری دەربارەی ڕۆمل گوێ لێبوو (ڕۆمل سەرکردەیەکی ستراتیژی نییە، ئەو سەربازێکی ئیشکەری زیرەك و پێشکەوتووە لە مەسەلەی ئامادەکارییەکاندا)، پێویستە لێرەدا باس بکەین کە هیتلەر، هەردەم ئاماژەی بەڕۆڵی مارشاڵ (کلوکا) دەکردو دەیگوت ئەو جێگەی ڕۆنشتد دەگرێتەوە ئەگەر نەخۆش بکەوێت یان نەمێنێت.

ڕۆمل پاش ئەوەی گەیشتە ڕۆژئاوا لەگەڵ (کوز)ی سەرۆك ئەرکانەکەی حەزی کرد گفتوگۆی پێشەکی لەگەڵ ڕۆنشتد دا بکات، هەروەها ئارەزووی کرد بارەگاکەی نزیك بێت، ڕۆنشتد بەم داواکارییە ڕازی بوو،

هاوکاری گواستنەوەی ڕۆمل و سەرۆك ئەرکانەکەی کرد (بارەگای پێکهاتەی سوپای (ب)) بۆ (فونتنبلۆ). لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ ڕۆنشتد، ڕۆملی لە بیرۆکە تایبەتیەکانی هەلوێستی گشتی لە ڕۆژئاوا ئاگادارکردەوە، هەروەها باسی ویستەکانی هەوپەیمانانی بۆ کرد لە هێرشکردنە سەر مۆڵگەکان، لەگەڵ توانا راستەقینەکانی بەرگری، بیرۆکەی ئەو ئامۆژگارییانەیش بەم شێوەیە بوو:-

لەئینگلتەرە نزیکەی (٦٠) تیپی تەواوی ئامادەکراو هەیە، پیاوەکانی لەپلەی یەکەمن بۆ شەڕکردن، ئەو تیپانە چەندان ڕاهێنانیان لە بواری دابەزین دا کردووە، هەروەها تیپی تۆپهاوێژو چەترداره‌کانی لە نێوان ٨-١٠ تیپ خەملێنراوە، زانیاری زیاتر لەم زانیاریانەش دەست ناکەوێت، چونکە چاودێرییەکانمان بێ هێز بوون، نەتوانراوە زانیاری بەسوودی دیکە وەربگیرێت.

هەرچەندە ئەم زانیاریانە بەردەست بوون، بەڵام نەتوانرا تا ئەو کاتە شوێنی دابەزینی دوژمن بزانرێت، تەنانەت ڕۆژی دابەزینەکەش نەزانرابوو، چونکە سوپای ئەنگلۆ-ئەمەریکی لەسەر هێڵی (دۆفر - بلایمۆس) بوو، بۆیەش هێرشەکە لەبەشێکی ئەو بەرەی شەڕەدا ڕوودەدات، ئەو کەشتیانەی هاوپەیمانان کە لەکەنارەکانی ئینگلترە بوو، دەتوانرا لەهەر خاڵێك بیانەوێت کۆی بکەنەوە، دەستەڵاتی ڕەهای ئاسمانیی لەژێر کۆنترۆڵی هاوپەیمانان بوو، بۆیەش هێزی ئاسمانی سییەم لە هەلۆێستێك دا بوو کە کاریگەری بەسەر شەڕدا نەدەبوو، لەو کاتەدا داوای پاڵپشتی و هاوکاری ئاسمانی کرد.

لەوانەبوو کاتی هێرشەکە لە رۆژەکانی مانگی مایس و ئەیلوولی (١٩٤٤) دابێت، ئەو کاتە کەش و هەوا لەبار دەبێت و کەناری (قەنال)یش لەژێر هەرەشەدابوو، چونکە نزیکترین رێگابوو بۆ ناوچەی (راین) کە بەرگری لێ نەدەکرا، ئەم جۆرە هەڵچوونەش دەبێتە هۆی لێك دابڕاندنی سەرکردایەتی رۆژئاوا لە ئەڵمانیا بە یەك لێدان.

شەڕ لە هۆڵەندا چاوەڕوان نەدەکرا، چونکە زەویەکەی یارمەتی گواستنەوەی یەکە گەورەکان نادات، ئەی ئەگەر ئەو یەکانە تانکیشی لەگەڵدا بێت!!.

لێکۆڵینەوەی ئەم باسانە بەدوور نەدەزانرا کە دابەزینەکە لە نورماندی بێت، ئەم باسانە جموجۆڵەکانی درێژە پێ دەدا، چونکە ڕێگەی نورماندی بۆ ئەڵمانیا دوور بوو، بەڵام مەترسیدار نەبوو وەکو ڕێگەی (کالیە) بۆ ئەڵمانیا.

لە کۆتاییدا بەدوور نەدەزانرا چاوەڕێی هێرش بکرێت بۆ هەردوو لای (هاڤر)، بۆ ئەوەی بگەن بە پاریس و بە پاڵپشتی هۆی سیاسی و گەڕاندنەوەی شکۆ.

دابەزین دەگونجا لە (بریتانی) بێت تەنانەت لە بەرەی دورگەی (باسکای)ش بەڵام بەهۆی پاڵپشتی یەکەو سەرزەمینەکان بێت، دابەزین لە دورگەی (باسکای) هیچ ئەنجامێکی ستراتیژی بەدەستەوە نەدەدا، چونکە ڕێگاکەی بۆ ئەڵمانیا دوور بوو، بەپێچەوانەشەوە کەناری فەرەنسی دەریای سپی ناوەڕاستیش لەژێر هەرەشەدا بوو، دەتوانرا لەڕێگەی ئیتالیا یان ئەفریقیا یان سەردینیا و کۆرسیکا هێرشی بکرێتە سەر، بۆیە گفتوگۆی زۆرهەبوو بۆ ئەوەی هێزەکان لە کەناری باشووری

فەرەنسا جێ بهلێن و بەرەو ناوچەی ناوەڕاستی دەوروبەری پاریس بگوازرێنەوە.

رۆمل چەندان زانیاری تری دەربارەی یەکەکان و ئامادەکاری و چەك و بەرگرییەکانی پێگەیشت، رۆنشتد لەکاتی گفتوگۆی لەگەڵ رۆمل ئاماژەی بە (دیواری ئەتلەسی)، دەداو بە دیواری پروپاگەندەی وەسف دەکرد، لەکۆتاییدا رۆمل زانی ئاسانکاری نابێت بکرێت لە بەرگریەکان و تیپی سەرزەمینی، چونکە هیچ باسێکی لەدواوە نەبوو، تەنها هێلێکی دیاریکراو هەبوو لە (سوم — ساوون — سنوری سویسرا).

گفتوگۆی رۆنشتد و رۆمل تەواو بوو بە وتەیەکی رۆنشتد (بارەکە بەتاریکی بەدیاردەکەوێت).

کاریگەریەکانی رۆمل بە ئاشکرا دیاربوو، بەڵام هیوا بڕاو نەبوو لە چارەسەرکردنی هەڵوێستەکە، بە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هیتلەرو پیاوەکانی (رایخ)، لە پروپاگەندەکانی (گۆپلز) بە ئاشکرا ناوی رۆمل دەهات، تەنانەت باسی رۆمل لە هەواڵەکانی هەفتانەش بڵاودەکرایەوە.

لەڕاستیدا پشکێنەری گشتی بە پەرۆشیەکی مەزنەوە ئەرکەکانی جێبەجێ دەکرد، و بەبێ ماندوو بوون هەمووناوچەکانی بەرەی کەناری بەسەر دەکردەوە، لە سوپایەکەوە بۆ سوپایەکی ترو لە تیپێکەوە بۆ تیپێکی تر، هەوڵی دا داواکارییەکانی هیتلەر بۆ پاڵپشتی کردنی بەرگری جێبەجێ بکات، بەڵام نەیدەتوانی فەرمان بەسەر سوپادا بکات، چونکە ئەو پشکێنەرێك زیاتر نەبوو، هەندێك جار بەیەکهەڵشاخانی سەخت لەنێوان (رۆمل) ی پشکێنەر و سەرکردە ناوچەییەکان رووی دەدا کە

لەژێر فەرمانی رۆنشتد دا بوون، ئەمە وایکرد کەلەبەرێکی گەورە لەنێوان سەرکردایەتی رۆژئاواو رۆمل دا رووبدات.

رۆنشتد داوای لە هیتلەر کرد هەڵوێستەکانی بگۆرێت، رۆمل بەو ئەرکانەی پیێ سپێرداربوو، ئەرکی زیاتری دەکردو خۆی لە زۆرشت هەڵدەقورتاند، بۆیەش رۆنشتد چەند پێشنیارێکی ئاراستەی هیتلەر کرد لەسەر حەزو ئارەزووەکانی رۆمل:-

رۆمل دەستەی ئەرکانی سوپای (ب) بکرێتە دامەزراوەیەکی بەرگریکاری و بەرپرسیاربێت لە :-

١- سەرکردایەتی کردنی یەکەکانی بەرگری لەزەوییە نزمەکان، لە کەناری هۆلەندا.

٢-سوپای پازدەهەم لەنێوان (ئاوستند) و رۆژئاوای هاڤرو ئاورێژی (لوار)، نیمچە دورگەی نورماندی و بریتانی بگرێتەوە،

بۆیەش رۆمل مەترسیدارترین یەکەی هەبوو کە یەکەی قەنال و هەردوو نیمچە دورگەی ناوبراوان، ئەو کاتە رۆمل دەبێتە بەرپرسیاری ئەو ناوچانە و دەتوانێت فەرمان لەوناوچانە بدات کە لەژێر دەسەڵاتی دایە وەکو سەرکردەیەك.

سوپای (ج) بەسترابووە لەگەڵ سەرکردایەتی تیپی (بلاسکوولیتس) و ئەم یەکانەی لەژێر دەسەڵاتدا بوو:-

١-سوپای یەکەم لە ئاورێژی لوار تا (بیارتیس)، یان بەرەی دورگەی باسکای.

٢-یەکەکانی باکووری برانیس.

٣-سوپای نۆزدەهەم لە دەریای سپی ناوەڕاست لە (فندرس) تا (منتون).

٤-یەکەکانی چیای ئەلپ لە (منتون) تا (مۆنت بلانك).

بەمجۆرە هێزەکانی رۆژئاوا کە لەژێر فەرماندەیی رۆنشتد بوو ئەمانەبوون:-

١-پێکهاتەی سوپای (ب) لەژێر سەرکردایەتی رۆمل.

٢-پێکهاتەی سوپای (ج) لەژێر سەرکردایەتی بلاسکوویتس.

لەوەش زیاتر رۆنشتد هاوکاری گەلەکەشتی دەریایی سێیەم و سوپای دەریایی رۆژئاواو هەردوو سەرکردەکەی تری دەکرد، پاش چەندان ڕوون کردنەوەی تر لەلایەن هیتلەرەوە، ڕازی بوو لەسەر پێشنیارەکانی رۆنشتدو، فەرمانی دا ئەم پێشنیارانە جێبەجێ بکرێن، ئەگەرچی سستەمی سوپای (ج) تا ئەکاتە شێوەی ئاسایی خۆی وەرنەگرتبوو.

هیتلەر گۆڕانکاریەکی گەورەی دروست کرد، بەڵام گۆڕانکارییەکان تەنها ڕوالەتی بوون، لەباشووری فەرەنسا چاوەڕوان دەکرا بلاسکوویتس لە سەرکردایەتی سوپای (ج) بمێنێتەوە، بەڵام ئەو لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت بەخۆی ئەم کارەی نەکرد، گەرچی بلاسکوویتس سەربازێکی نایاب بوو، بەڵام هیتلەر خۆشی نەدەویست، بەتەنها گەیشتبووە سەرکردایەتی سوپا، رەنگە هیتلەریش حەزی نەکردبا بیکاتە هاوشێوەی رۆمل، لەو کاتەش پەیوەندی ڕوون لەنێوان رۆنشتد و رۆمل دروست ببوو، هەر یەکەیان ئەرکی دیاری کراویان هەبوو و وە بەرپرسیار بوون لەسەر ئەنجام دانی، لە رۆژەکانی یەکەمی گۆڕانکارییەکان چەند بارگژییەك دروست بوو، چونکە رۆمل تا ئەو کاتە پشکێنەری هەموو کەنارەکان بوو،

حەقی ئەوەی هەبوو سەرپەرپشتیاری هەموو بەرەکانی جەنگی بلاسکوویتس بکات لەلایەنی بەرگرییەوە، بەڵام ئەو حەقەی کەم ببووەوە چونکە ئەو سەرقاڵی بەهێزکردنی ناوچەکەی خۆی بوو.

لە دەستپێکی ١٩٤٤ لە پاریس چەند ڕاهێنانێك دەربارەی تفاقدان ئەنجام درا، کە بەرپرسی خۆراکی سوپا ئامادەی بوو، ڕاهێنانەکە لەکارەکانی بەرپرسی هۆبەی جموجۆلی سەرکردایەتی رۆژئاوا (زمرمان) بوو.

ناوەڕۆکی راهێنانەکان تاڕادەیەکی زۆر ڕاستی پێوە دیاربوو، ڕاهێنانەکان وەکو ئەوە بوو کە لەشەرێکی راستەقینەدا بێت، وا دانرا کە هاوپەیمانن لە ئاسمانەوە دابەزینە بۆ (نورماندی) و لە کەناری باکووریش دابەزیونەتە سەر (کونتنتین).

هیتلەر زۆر شپرزە بوو بە ئاگادارکردنەوەکانی رۆنشتد کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ پێشکەشی کردبوو، دەست بەجێ سەرۆك ئەرکانی سوپای ئەڵمانی (جودل) ی ناردە رۆژئاوا، ئەمە شتێکی ئاسایی نەبوو، چونکە هیتلەر هەرگیز نزیکەکانی دەوروپشتی خۆی نەدەنارد تەنها بۆ کارێکی زۆر گرنگ نەبوایە.

لەسەر (جودل) پێویست بوو پشکنین بۆ کەناری قەنال (سوپای پازدەهەم) و سوپای لیوا بارۆن فۆن لە (بتلر) و سوپای حەوتەم لە (نورماندی) و (بریتانی) و لیوا (ویرلی مونت) لە کەناری باشوور بکات و هەموو هەڵوێستەکانیش بە هیتلەر رابگەنێت.

(جودل) بارودۆخەکانی سوپای بە رۆنشتد راگەیاند، رۆنشتد هەلەکەی قۆستەوەو بێ پێچ و پەنا راوبۆچوونی خۆی بەسەرۆك ئەرکانی سوپای

ئەڵمانی ڕاگەیاندو شێوازی سەرکردایەتی باڵای ڕوون کردەوەو دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی کورت دوو ڕای جیاواز لە ڕۆژئاوا هەبوو:-

١-ڕۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکان و سەرۆکی ژووری جموجۆڵ وای دەبینن، پارێزگاری لە کەنار بکرێت لە دووری دووهەزار و پێنچ سەد میل و چەند یەکەیەکی بێ هێز تیایدا بهێڵرێتەوە، ئەگەر دوژمن توانی ئەو خاڵانەی بەرگری ئەڵمانی ببڕێت، ئەوا یەکەکان کە لەو دوورییەدان دەتوانن دابەزینی هاوپەیمانان دوابخەن، بەڵام دەبێت بەرگرییەکان لە ڕۆژئاوا پاش ئەم ڕووداوە بەخێرایی بێت و بەرگرییەکی چونەپێش بێت، بۆیەش پێویستە یەدەگێکی ناوەندی گەورە لەدەوروبەری پاریس دا هەبێت کە چەندان جاری تریش ئاماژەی پێ درا بوو، و وە پاڵپشتی ئاسمانی بەردەوام هەبێت.

٢-ڕۆمل بەهۆی ئەزموونی خۆی لە ئەفریقیا و ئیتالیا وای دەبینێت بەهەموو هێزەکانەوە لەنێویشیاندا تیپی تانکەکان لە بەرەی کەنار، پارێزگاری لە کەنارەکان بکرێت.

ڕۆنشتد بیروڕایەکی ڕەوانەکردنی هێز هەبوو، بەڵام ڕۆمل بیروباوەڕێکی ئامادەکاری و خۆسازادنی هەبوو.

ڕۆنشتد سەرکردەی گشتی هێزەکان بوو، لەسەری پێویست بوو چاوی لەسەر هەموو بەرەکانی جەنگ بێت، بەڵام ڕۆمل تەنها پەیوەست بوو بە ناوچەکەی خۆی کە سەر بە سەرکردایەتی ڕۆژئاوا بوو.

ئەو تێگەیشتنە بە شێوەیەك بوو کە ڕۆمل بایەخ بدات بەیەکەکانی قەناڵ و بەس، بەڵام ڕۆنشتد سەرکردایەتی ئەوشەڕەی دەکرد کە چاوەڕواندەکرا

له دورگەی باسکای و کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست روبدات، چار چیە بۆ ئەوە؟

لەو کاتەی شەڕ دروست ببوایە، هەموو تیپەکانی سەرزەمینی کە توانی کارکردنیان هەبوو وە هەمو تیپە زرێپۆشەکانی ناوچەی کەناریان نزیك کەنار، نە دەتوانرا پاشە کشەیان پێ بکرێت، یان زۆر بەزەحمەتی لەژێر ئاگری دوژمندا پاشەکشەیان دەکرد، ئەو جێگرەوانە چی بوون کە لەلای رۆنشتدا بوون بۆ بەرگری کردن لە ناوچەی بەرفراواندا؟

رۆمل چەند هۆیەکی بە هێزی هەبوو کەهیچ شارەزایەك نەیدەتوانی گفتوگۆی لەگەڵ بکات (رۆنشتد) یش بەهەمان شێوە لەوکاتەدا دوو بیرۆکەی دژ بەیەك و بەرپرسایەتیەکی هاوبەش هەبوو لەیەك کاتدا، گەر رۆمل سەرکردەی گشتی بوایە لە رۆژئاوا، ئەوا چەند یەکەیەکی زرێپۆشی لە دەوروبەری پاریس جێگیر دەکرد ، بۆ ئەوەی لەو بەرانە بەکاربهێنێت کە (٢٥٠٠) میل دووربوون لێیەوە.چەندین گفتوگۆی ئەکادیمی لەم بارەوە کرا، بەڵام لەراستیدا زۆر سادەبوون، ئەگەر هەست بکرابوایە کە لەچ بەرەیەکەوە دابەزینی هاوپەیمانان ئەنجام دەدرێت، ئەوا هەموو هێزەکان لەم شوێنەدا کۆدەکرایەوە، بەڵام ئەگەر شوێنی دابەزینەکە نەزانرێت سەرکردایەتی باڵا چۆن دەتوانێت هێز لە شوێنێکی دیاریکراو کۆبکاتەوە، جودل هەردوو بۆچوونەکەی بە هیتلەر گەیاند، نێردراوەکەی هیتلەر چەند بۆچوونێکی نوێی لە قسەکانی لیوا(مارکس) پیاوێکی ناسراوی سوپا بوو، بێباکانە بە (جودل)ی راگەیاند کەئەو هێزەی لە ژێر دەستی دایە نەك هەر ناتوانێت ئەرکی بەرگری کردن، تەنانەت ناتوانێت ئەرکی دواخستنی هێزی هاوپەیمانانیش بگرێتە ئەستۆ، گەر هێزەکانی ئەویش تێك شکا، ئەوا بەرەی کەناری دەبێتەپارویەکی نەرم و بە ئاسانی و بەماوەیەکی

کـەم داگـیر دەکرێـت. جـودل گەیشـتە ئـەو قەناعەتەکـەی کـە بەهانـە هێنانەوەیە گەر بڵێین بەو هێزە بچوکەی نورماندی دەتوانرێت پارێزگـاری لـە نورمانـدی بکرێـت و هێڵێکـی بـەرگریش بـۆ بـەرەی کـەناری دروسـت بکرێت، لەگەڵ بۆچوونەکانی رۆنشتد هاوڕابوو پێویستە هێزێکی بەهێز لە زرێپۆشەکان لەدەوروبەری پاریس کۆبکرێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە یـەدەگێك بۆ ئەم بەرەیە.

هیتلەر لەسەر بۆچوونەکانی بڕیاری دا کە پارێزگاری لەکەنارەکان بکرێت لەسەر بۆچوونەکەی رۆمل، رایگەیانـد دەبێـت هێزێکـی یـەدەگ کـە پێـك هاتبێت لـە زرێپۆشـەکانی رۆژهـەڵات و بەشـێوەیەکی تـر ڕێـك بخرێتـەوەو لەدەوروبەری پاریس جێگیر بکرێن، ئەگەر نـەتوانرا یەکـەی نـوێ دروسـت بکرێت و لەژێر سەرکردایەتی خۆیدابێت.

هیتلـەر زۆر حـەزی بـە پیاهەڵـدانی سیسـتەمی بـەرگری دەکـر، وا بـڕوای دەکرد کە رۆخـی کـەنارەکان چـەند هێـزی ئامادەباشـی تیایـدا جـێگیرەو فێڵی هونەری بەکاردەهێنێت بۆ داخستنی کەنارەکان بـەرووی دوژمـن دا، ئەو لەسەر ئەو نەخشانە بۆچوونەکەی بنیات دەنا کە ٩٠٠ میل لە شـوێنی راستەقینەی ڕووداوەکان دوور بوو! !

ئەو نەخشانەی سەرمێزەکەی زۆرچاك بـوون بـۆ دامرکاندنـەوەی تـوڕەیی هیتلەر.

هیتلەر حەزی دەکرد ئەڵمانیا لە نەگبەتی و نوشست هێنان دووربخاتـەوە بەهۆی بەرگری کردن بە ئاسن و کۆنکریتەوە.

هیتلـەر زۆر دوو دڵ بوو، چـونکە بۆچـوونەکەی ڕۆمـل کـاری لـێ کردبـوو، هیتلـەر هـەرگیز خـاوەنی ئیرادەیـەکی چەسپاو نـەبوو وەکـو بـە ڕواڵـەت

دەبینرا، تەنها رۆنشتدو ئەوانەی لە چواردەورییەوە بوون چاکیان دەناسی، کە زۆر لە بڕیاردان بەگومانەو زۆر بەئاسانی دەتوانرێت کاری لیّ بکرێت. بۆ ئەو کەسانەی کە حالەتی دەروونی هیتلەریان دەزانی، (هیدەر) کە سەرۆك ئەرکانی سوپا بوو لەرۆژهەڵات زۆر هەوڵی دەدا هیتلەر بە بۆچوونێك ڕازی بکات، هەر لەو کاتەدا ڕازی دەبوو بەڵام پاش کەمێك ڕایەکەی خۆی بەپێچەوانەوە دەگۆڕی، ئەمەش لەبەر ئەوەی بوو کە کەسێکی تر بۆچوونێکی تری بۆ پێشنیار کردووە.

ڕۆمل هەموو ڕۆژێك پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ هیتلەر دەکرد، بەڵام رۆنشتد ئەو کارەی نەدەکرد، گەر بە ڕوونی سەیری گفتوگۆیەکانی ڕۆمل و هیتلەر بکرێت، دەردەکەوێت هەردووکیان زۆر بەگەرمی باسی شتەکانیان دەکردو هەردووکیان هەستی یەکتریان بەرز دەکردەوە و زۆر بەدرێژی باسی داهێنانە سوپاییەکانیان دەکرد کە هیتلەر زۆر حەزی بە بیستنی دەرکرد.

ڕۆمل توانی بەهۆی باوەڕی تایبەتی خۆی و یارەمەتی سەرکردە دیارەکانی حیزب بیروباوەڕەکانی هیتلەر لەبیروباوەڕەکانی تایبەتی خۆی نزیك بکاتەوە، بۆیەش پێش دەستپێکردنی هێرشەکە دەستبەرداری دەزگای بەرگری ڕۆژئاوا بوون بەتەواوی، ئەو دەزگایە ماوەیەکی زۆر خەریکی ئامادەکردنی بوون بەپێی بنەما سەرەکیەکانی سوپا، لێرەدا پێویست بڵێین گەرچی جیاوازی و بەیەکداچوون هەبوو بەهۆی ئەو ڕاستیانەوە، بەڵام ڕۆمل و رۆنشتد هەرگیز دەستبەرداری ئەو پەیوەندییە نەبوون کە لەنێوانیاندا بوو.

رۆمل لەسەر ڕایەکانی سووربوو، پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ هیتلەر هەبوو، بەمەش خۆی بەسەر رۆنشتدا سەپاندبوو، بەڵام رۆنشتد دڵی فراوان بوو. ئەمە لەسەر سەرۆکی روکنەکەشی سبیدل دەچەسپێ کە لە بەهاری ساڵی ١٩٤٤ جێگەی لیوا (کوز)ی گرتەوە، سبیدل ئەفسەرێکی زیرەك بوو، ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە هێور کردنەوەی ئەو بارە دژبەیەکەی کە لەنێوان دەستەی ئەرکانی ڕۆمل و رۆنشتدا هەبوو.

هەردوو سەرۆك ئەرکانی سەرکردایەتی رۆژئاواو سوپای (ب) لە ساڵی (١٩٢٠)وە یەکتریان دەناسی و کاریان بەیەکەوە کردبوو، زۆرچاویان لەسەر هەردوو سەرکردەکە بوو ، بە ئەرکی خۆیان دەزانی هەرکاتێك کێشەیەك لەنێوان هەردوو مارشاڵەکە دروست بوو ئەوا ئەوان خۆیان تیایدا هەڵقورتێنن.

لە شوباتی ١٩٤٤ مارشاڵ رۆنشتد لە مۆڵەت دابوو لە (بادتویلز) ئەو ئەفسەرەش کە جێگەی ئەوی دەگرتەوە لە هێزی ئاسمانی سێیەم مارشاڵ (سبیدل)بوو، مارشاڵ رۆمل دوای لێکردم بەیەکەوەبەرگرییەکانی کەناری (بریتانی) بپشکنین، هەلێکم بۆ رەخسا لەنزیکەوە رۆمل بناسم، گەشتی پشکنینەکە سێ رۆژی خایاند لە (سنت نازیر) دەستی پێکرد بۆ (لۆرین) و (بریست) و (سنت بریوس) و پاشانیش بۆ سەرکردایەتی سوپای حەوتەم لە (ریمس) کە لەلایەن (دولمان)ەوە سەرکردایەتی دەکرا.

رۆمل بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستاو کاتژمێر هەشت دەستی بەکارەکانی دەکرد، بێ ئەوەی ماندوو بێت یان نارەزایی دەرببڕێت، سەری لەهەموو یەکەکان دەداو لەگەڵ بەرپرسەکانی گفتوگۆی دەکردو

داوای ڕوونکردنەوە لێ دەکردن دەربارەی سیستەمی بەرگری کردن، کاتێك هەستی کردبوایە ئیشەکان وەکو پێویست و بە ئارەزووی ئەو بەڕێوە ناچن ڕەخنەی توندی دەگرت. وام تێبینی دەکرد بەرپرسی یەکە سەربازییەکان زۆر لە ڕۆمل دەترسان و هەناسەی خۆشیان هەڵدەمژی کاتێك ڕۆمل بەجێیدەهێشتن و خواحافیزی دەکرد.

ڕۆمل زۆر بایەخی بە ئەندازیارەکانی دەدا و بە خۆشحاڵیەوە رایدەگەیاند کە هونەری ئەندازەیی لای ئەو زۆر گرنگ بووە کاتێك قوتابی کۆلیژی سەربازی بووە، لەگەشتەکانی پشکنین هەموو جارێك سەرکردەی ئەندازەیی سوپای (ب) لەگەڵدابوو کە ناوی دکتۆر (میز) بوو، لەگەڵ راوێژکاری دەریاریی ئەدمیرالد (رانج).

ڕۆمل شەو و ڕۆژ چەند کێشەیەك لە مێشکیدا دەخولایەوە:-

١-کێڵگەکانی مین:- نەیدەتوانی ڕێژەی پێویستی لە مین دەست بکەوێت، ئەو داوای ملیارەها مینی دەکرد بۆ ئەوەی کێڵگەی فراوان دروست بکات، ئەڵمانیا نەیدەتوانی ئەو رێژەیە بەرهەم بهێنێت، بۆیە ڕۆمل داوای لە کارگەکانی فەرەنسا کرد مین دروست بکەن.

مێشکە فراوانەکەی هەردەم بیری نوێی بۆ دەهێنایە خەیاڵ، دەیویست مین لە ژێر هەموو دەرختەکاندا بچێنێت و مینی ساختەی دروست دەکرد بۆ ئەوەی دوژمن رێگەی لێ تێك بچێت.

٢-(میوە نایابەکانی ڕۆمل) ئەو ناوە گاڵتەجارییە بوو کە یەکە سەربازییەکان لەو دارستانە بەرفراوانەیان نابوو کە ڕۆمل لە (مێخ)ی دروست کردبوو، مەبەستەکەشی لەو مێخانە دواخستنی هاوپەیمانان بوو لەکاتی دابەزینیان و دروست کردنی کۆسپ و تەگەرە بوو بۆ

سەربازەکانی دوژمن کە لەئاسمانەوە دەهاتنە خوارەوە بە تایبەتی لەو دارستانانەی کە دارودرختەکان بەرزییان ١٠ تا ١٥ پێ بوو، داوای لە دانیشتوانانی ناوچەکانی نزیك ئەو دارستانانە کرد یارمەتی بدەن و تەنانەت موچەشی بەو جوتیارانە دەدا کە هەماهەنگیان لەگەڵدا دەکرد.

٣-رۆمل زۆر بایەخی بە بەندەرەکانی کەناری ناوەند دەدا، تاکو دوژمن دوابخات، بەدرێژایی کەناری بەندەرەکان هێلێکی چڕوپڕی مێخەکی چاندبوو و هەر سەرێکی مێخەکێکیش پۆپکەیەکی دڕکاوی هەبوو.

ئەگەرچی ئەمە کارێکی گران و قورس بوو هەموو دار مێخەکانی دەوروبەریان گواستەوە کەنارەکان، بەڵام ئەو کارانە لە ئارەزووەکانی مارشاڵیان جێبەجێ نەکرد، بیرۆکەی چاندنی هەر مینێکی لەژێر دارمێخەکێرا هاتبوو مێشکیەوە، بەهەر حاڵ کات و ئیش کردن نەدەتوانرا لەهەموو بەرەکاندا بقۆزرێتەوە، بۆیەش زیاتر کارکردنیان خستبووە سەر ئەو بەرانەی کە لەژێر هەرەشەدا بوون، ڕۆمل زۆر تووڕە دەبوو کاتێك هەستی دەکرد یەکە سەربازییەکان بەکارەکانی خۆیان هەڵناستن و هیچ بەهانەیەکی بەڕەوا نەدەبینی!!

کاتێکیش دەستەی ئەرکانی سوپاکەی لە چواردەورەی مێزی نان خواردن دا کۆدەبنەوە، وا هەست دەکرا ڕۆمل زۆر هەستی لێیان دوورە، مێشکی بەردەوام لە بۆچوونی نوێ دەگەڕا،

هەرگیز بایەخی بەدیمەنی سروشتی و باڵەخانەی مێژوویی نەدەدا، ئەو تەنها سەربازێك بوو و بەس...

زۆرجار قەڵەم و کاغەزێکی لەدەست دەگرت لەکاتی نان خواردن دا، چەند بۆچوونێکی خۆی دەکردە پلان و پێشکەشی سەرکردەی ئەندازەیی

دەکرد بۆ ئەوەی لە بەیانی دا کاری لەسەر بکات، هەندێك جار داوای لە پیاوە ئەندازیارەکانی دەکرد یارمەتی یەکەکانی تر بدەن و بۆچوونی نوێش دروست بکەن.

رۆمل ئێواران زوو دەخەوت، بۆ ئەوەی بەئاسانی لە بەیانیدا لەخەو هەلبستێت، هەردەم دوو پەیامنێری ڕۆژنامەوانی لەگەڵ خۆیدا دەگێڕا، ئەو دوو کەسە وێنەی (ڕۆمل) یان دەگرت و هەواڵەکانیشیان بە رۆژنامەکان دەگەیاند.

رۆمل تەنها تامەزۆری و چاونەترس و چالاك و خاوەن بیری نوێ نەبوو، ئەو خاوەنی بەهرەی تێڕوانینیش بوو، مەبەستی بوو چەند یەکەیەك لەژێر زەویدا جێگیر بکات، بەڵام رۆنشتد ئەو پێشنیارەی رەت کردەوە، چونکە بێ بایەخی بوو بەرامبەر دانیشتوانانی فەرەنسی ئەو ناوچەیە، بەڵام لە لایەنی ئامادە باشیەوە بیرێکی سەرکەوتوو بوو، کە کۆتایی بەگەشتەکەی هێنا بۆ (دنیس)ەوە بەرەو پاریس گەڕاینەوە، دەست و پێوەندەکەی لە ئۆتۆمبێلەکانی لە پێشەوە دەرۆیشتن و من و (ڕۆمل)یش بەیەکەوە لەنێو ئۆتۆمبێلێك دا بووین کە خۆی لێی دەخوری، رۆمل ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا ئەوەی لەنێو دڵی دایە بۆمنی هەڵبڕێژێت.

هەرکە (دنیس)مان بەجێ هێشت، دەستی بە قسەکانی خۆی کرد، بەشێوەیەکی سەرەکی باسی شەڕی باکوری ئەفریقیای دەکرد، رەخنەی زۆری لە هەندێك کەسایەتی خاوەن بڕیار گرت، کە لێرەدا ناویان ناهێنین، باسی ئەو کێشەو ئەستەمیانەی کرد کە لە سەرکردایەتی ئەفریقیاوە بەسەری هاتووە، ئەمەش بەهۆی نەرم و نیانی سیستەمی رێکخستنی سوپاوە بووە، بڕیارەکانی لە هیتلەرو مۆسۆلینی و

سەرکردایەتی سوپای ئەڵمانی بۆ دەردەچوو و تەنانەت سەرکردایەتی باڵای (رۆما)ش فەرمانی بەسەردا دەکرد، پیاوێکی وەکو رۆمل چۆن دەتوانێت لەو بارودۆخەدا بۆچوونی خۆی دەربڕێت کاتێك ئەو ژمارە زۆرەی بەرپرس وخاوەن بڕیارەکانی بەسەرەوەیە و لەژێر کۆنترۆڵی ئەوان دایە.

بارودۆخی ئەفریقیای زۆر بە بارودۆخی رۆژئاوای دەشوبهاند، رۆنشتد داوای لێکردبوو ئامادەکاری گونجاو بکات، چونکە چەندان بەرەنگاری هاتۆتە پێشەوە کە ئازادی بڕیاردانی بەرتەسك دەکەونەوە.

سوپای بەریتانیا زۆر قازانجی کرد کاتێك پاشەکشەیان بە ئاراستەی سنورەکانی میسر کرد، لەپاش شەڕێکی بەردەوام، بەمەش خالی تفاقدان و بنکەکانی زۆر لێیەوە نزیك بوون لە (سویس)ەوە، بەڵام لەلایەکی تردا رۆمل دڵی تێك شکابوو، چونکە نەدەتوانرا یارمەتی بۆ ڕەوانە بکرێت لەسەر هێلی گشتی دا.

لەو کاتەدا رۆمل هەشتا فرۆکەی بچوکی شەڕکەری (جیکەر)و هەندێك سوتەمەنی و تفاقی هەبوو، ژمارەی زرێپۆشەکانی تا دەهات کەم دەبوونەوە بۆ رێژەیەکی مەترسیدار و یارمەتیەکانی لەسەر ڕێگای دەریایی لێ بڕا بەهۆی کاریگەری هێزی دەریایی و ئاسمانی بەریتانیا و هەردوولای دەریایی و ئاسمانی دەریای سپی ناوەڕاستی لەدەست دا، و چەندان کەشتی ئەڵمانی کە یارمەتی و سوتەمەنی و چەکیان تیادا بوو نقوم بوون.

رۆمل چەندان راپۆرتی لەسەر ئەم مەترسیانە گەیاندە هیتلەر، بەڵام گۆڕانکاری ڕووی نەدا!

چونکە نەدەتوانرا یارمەتی لەڕێگای ئاسمانیەوە بۆ سنووری میسر بگوازرێتەوە.

رۆمل خۆی بە فڕۆکە سەفەری کرد بۆ لای هیتلەر، بۆ ئەوەی بەدەمی خۆی کێشەکانی بۆ باس بکات، هیتلەر چەندان وشەی ناخۆشی بەرامبەر رۆمل بەکارهێنا، و بارەگای سوپای ئەڵمانیش بە ئاگادارییەوە پێشوازییان لێکرد، چونکە لەشەڕەکەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابوو لەو کاتەدا.

رۆمل هۆی تووڕەبوونی خۆی بۆ دارو دەستەکەی هیتلەر روون کردەوە، بەڵام فۆهرەر پاش نیوەڕۆی ئەو سەردانەی داوای لێکردبوو سەردانی بکات و بەیەکەوە چایان خوارد بۆوەو بالۆرەی بۆ هەلوێستی رۆمل هێنابووەوە، بۆیەش دارو دەستەکەی هیتلەر هەوڵیان دابوو لەلای رۆمل خۆیان شیرین بکەنەوە.

لەمە شەوی مانگی شوبات دا رۆمل هیچ رەخنەیەکی دژی هیتلەر نەگرت، بەڵام چەندان وشەی ناخۆشی بەرامبەر رژێمەکەی بەکارهێنا، و ئەو هەردەم بایەخ بە لایەنی سەربازی دەدات و لایەنی سیاسی لەلا گرنگ نییە، رۆمل وتی تا مانگی مایس ئەگەر هاوپەیمانان نەیەن زۆرچاکە، بەڵام پاش ئەو مانگە دەتوانن بێن.

مەبەستی ئەوەبوو تا مانگی مایس یەکە بەرگرییەکانی بەهێز دەکات لەکەنارداو زۆر باسی چۆنیەتی و شێوازی شەڕی هێزی بەریتانیای کرد لە ئەفریقیا.

رۆمل لەگەشتەکەیدا باسی لایەنی مرۆڤایەتی خۆی کردو وتی ئارەزووی مەزنم پاش جەنگ بریتی دەبێت لە دروست کردنی چەندان کێڵگەی

میوەیی و سەوزەی نێو ماڵە شوشەییەکان، کە لە هۆڵەندا زۆر سەرنجی ڕاکێشا بوو، لێرەدا ئارەزووەکانی ڕۆمل و ڕۆنشتد یەك دەگرنەوەو هەردووکیان حەزیان لە چاندنی نەمام و بەخێوکردنی ئاژەڵ بوو، ڕۆنشتد زۆر زیرەك بوو لە کێشانی نەخشەی کێڵگەی میوە و سەوزەکان، زۆر دڵگران دەبوو کاتێك باخچەکەی بە نارێکی دەبینیّ.

ڕۆمل زۆر بەقووڵی باسی ژیانی خۆی کرد، بۆیەش زۆر ماندوو ببوو، کاتێك هەستمان کرد لەگەڕەکەکانی (پاریس)ین، ڕۆمل و دەستەی ئەرکانی سوپای (ب) لە (لاروش- کویون) نیشتەجیّ دەبوون و منیش لە هوتێلی جۆرجی پێنجەم لە پاریس دەگیرسامەوە.

بەو چەند کاتژمێرە زۆر دڵخۆش بووم بەناسینی ژیانی مرۆڤایەتی ڕۆمل، گوێم لە گلەیی و تامەزرۆیی بوو بۆ جەنگی ئەفریقیا.

بەڵام هەڵوێستی سیاسی و سەربازی و مرۆ ڤایەتی ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٤٤) گەیشتبووە ڕادەیەکی پێگەیشتووی دوو دڵی، مین و مێخەك و ڕێگرییەکان کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر دوژمنەوە نەبوو.

هیتلەر زۆر دڵگران بوو بە توانای سەرکردایەتی بۆ سەرکەوتن و بەرگری کردن کە پێنج سەد میل لێیەوە دوور بوو، هیچ داهێنراوێکی نوێش نەیدەتوانی ئەم ڕاستیانە بگۆڕێت.

هێرشەکان لە ٦ی حوزیرانی ١٩٤٤ دا سەرکەوتوو بوون بێ ئەوەی ئەو ڕێگەیانەی کە باس کران هیچ لە ڕاستیەکان بگۆڕن، چونکە زانیاری هاوپەیمانان زۆر ڕاست بوو لەو سەرچاوانەی کە لەڕێگەی وێنەی ئاسمانی و دەریایی یەوە گیراون لە خزمەتگوزارییەکانی هەواڵگرییەکانەوە

بەدەست کەوتبوون، ئەڵمانیەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو ڕێگریانە ناتوانن بەرگری بکەن.

لە مانگەکانی زستاندا بارەگای سەرکردایەتی ڕۆژئاوا کە لە هوتێلی جۆرجی پێنجەم لە پاریس بوو، بەڵام لە بەهاردا گوێزرایەوە (سانت جیرمان)، بەهۆی کەمی سوتەمەنی لە هۆتێلەکانی پاریس دا.

ڕۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەی و یارمەتیدەرەکانی لە ماڵێکی لادێیی لە کێڵگەیەکی (سانت جیرمان) نیشتەجێ بوون، ئەم خانووە لەگەڵ ئارەزووەکانی ڕۆنشتد دەگونجا چونکە باخچەی تیادابوو، ڕۆژانەش لەگەڵ جوتیارە فەرەنسیە پیرەکان قسەی دەکرد.

لە ساڵی ١٩٤٣ ئەو خانووە هیچ حەشارگەیەکی دژی هێرشی ئاسمانی نەبوو، هەر مووشەکێك دەیتوانی خانووەکە تەخت بکات و هیچ پاسەوانێکیشی نەبوو.

ڕۆنشتد بۆ ماوەی کاتژمێرو دوو کاتژمێری بەیانی لە سانت جیرمان ڕۆژانە پیاسەی دەکرد بەنێو باخچەو کێڵگەکاندا، بێ ئەوەی هیچ چەکێك هەڵبگرێت یان کەسێکی تری لەگەڵدا بێت.

ڕۆنشتد لەلایەن دوو پیاوی هەواڵگری ئەڵمانیەوە چاودێری دەکرا لە دوورەوە، بەڵام زۆر بەخێرایی هەستی پێ کردن و بەگاڵتەجارییەوە ئاماژەی بۆ کردن و خۆی لێیان دەشاردەوە.

زۆر جار لە پیاسەکردنیدا ڕوداوی دڵخۆشکەری بەسەر دەهات، زۆرجار مارشاڵ پارچە کێك و شیرنەمەنی بەسەر منداڵاندا دابەش دەکرد و منداڵەکانیش کاتی پیاس کردنی ڕۆنشتدیان دەزانی، هەندێك جار پیاوێکی ئاینی یان ئەفسەرێکی فەرەنسی دەبینی بەجلی شارستانی.

هیتلەر بە نەبوونی حەشارگەو بێ پاسەوانی سەرکردەی گشتی هێزەکانی زانی، لە سانت جیرمان تەنها چەند تۆپهاوێژێکی دژە فڕۆکەی لێ بوو، دانیشتووانانی سانت جیرمان دەیانگوت (مارشاڵ رۆنشتد باشترین پارێزگارییە بۆمان)

رۆنشتد رێگەی نەدەدا هیچ ژێرزەمینێک لە بیناکان تاوەکو لە کێڵگەکانی سانت جێرمان دروست بکرێت و دەیگوت مردن لەهەموو شوێنێك دێت، ئەگەرچی هیتلەر دەیزانی مارشاڵ پێشنیازی دروست کردنی حەشارگەیەك ڕەت دەکاتەوە، بەڵام هیتلەر داوای لە ڕێکخراوی (تود) دەکرد کە حەشارگە دروست بکەن و پاشان بە کۆتایی هاتنی پێی ڕابگەیەنن.

کاتێك رۆنشتد مۆڵەتی وەرگرت و چوو بۆ (بادتویلز) لەساڵی (١٩٤٣) هەموو شتێك ئامادەکرابوو بۆ دروست کردنی حەشارگەیەك لە نهۆمی خوارەوەی باڵەخانەیەك، کاتێك تەواو بوو هیتلەر داوای کرد لەژێر زەویدا رێگەیەکیشی بۆ دروست بکەن بۆ دەرەوەی کێڵگەکانی سانت جێرمان.

کارەکان تەواو بوون و رۆنشتد سەیری کردو دڵخۆش بوو کە هیچ کێڵگە و دارو نەمامێکیان تێك نەداوە، حەشارگەکەیان بە کۆنکریت داپۆشیبوو، لەناویشیدا چەند ئامێری لاسلکی و تەلەفۆنی تیادابوو، بۆئەوەی هەرچەندە بارودۆخیش دژوار بێت بتوانن بە بەردەوامی کاربکەن. لەگەڵ ئەوەش باقی خەڵکەکەی تر بە بێ ژێرزەمین بوون بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لە سانت جیرمان مانەوە تاکو نیوەی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٤.

## بەشی دوازدەهەم

### خەباتی زرێپۆشەکان

(رومل) دەیویست تیپی زرێپۆشەکان لە خوارووداو نزیک لە کەنارەکە جێگیربن، بەڵام (رۆنشتد) داوای دەکرد کە شوێنەکەیان دوورتربێت، لەبەر ئەوەی وەکو یەدەگێك بۆ بەرەی سەرکردایەتی رۆژئاوا بەکاردەهات. هەریەکە لە لێکۆڵەرەوەی یەکەی زرێپۆشی گشتی (کودریان) و سەرکردەی یەکە زرێپۆشەکانی رۆژئاوا فۆن (گوین بیرك) پاڵپشتی بیروراکانی رۆنشتدیان کردو، وەك رۆنشتد داوایان کرد کە یەدەگێکی بەهێز ئامادەبکەن بۆ سەرکردایەتی رۆژئاوا لە پاریس.

هیتلەر جارێکی دیکە مەیلی بۆ بیروراکانی (رۆمل) چوو، هەردوو لامان بینی کە بەدوای هۆکاری بروا پێهێنەردا دەگەڕان، بەڵام بارەکە گەیشتبووە ئەو قۆناغەی کە دەبێت ڕای یەکێکیان بە تەواوی جێبەجێ بکرێت.

هەرشتێك ئەگەر بچووك بوایە یان گەورە پەیوەندی بە هیتلەر هەبوو، بڕیاری بەکارهێنانی زرێپۆشەکان لە دەستی ئەودا بوو.

نەخشەکانی سەرکردایەتی رۆژئاوا لە ساڵەکانی (١٩٤٣ – ١٩٤٤) ئاماژەی بە بوونی ١٠ تیپی زرێپۆشی دەکرد، بۆیە دەبووایە ئەو تیپانە بەس بوایە ئەگەر پێکهاتەکەی راستەقینە بوایە، بەڵام زۆربەیان لە رۆژهەڵاتدا توشی گورزی کوشندە بووبوون، تەنها چەند ژمارەیەکی کەمیان لێ مابووەوە، ئەو تیپانەی دیکەش کە باسیان لێوەدەکرا هێشتا دروست نەبووبوون و زرێپۆشیان نەبوو، ئەمانە هەموو تراویلکە بوو.

رۆنشتد چەند راهێنانێکی لەسەر سەرکردایەتی هێزی زرێپۆشی لە رۆژئاوا چەسپاند، مەبەستیش لەم راهێنانە بەرگریکردن بوو دژی دوژمن، (رۆمل) خۆی و سەرۆکی دەستەی ئەرکانەکەشی لیوا (سبیدل) ئامادەی راهێنانەکە بوون، لە راهێنانەکەدا چەند دابەزینێکی ئاسمانی لە ناوچەی کەناری (نورماندی) جێبەجێ کرا، هەروەها چەند دابەزینێکی تری ستراتیژیش لەدووری کەنارەکان کرا، چونکە لە چەند راپۆرتێکدا کە لە (یورما)ەوە هاتبوون ئاماژەی بە ئەگەری دابەزینی ئاسمانی دەکرا، هەروەها (کیرفۆن جۆبن بیرك) کە بەپێی ئەوەی پاشکۆیەکی سەربازی پێشوو بوو لە لەندەن، زۆر بایەخی بە ئامادەکارییە ئاسمانییەکانی بەریتانیا دەدا.

سەرکردایەتی رۆژئاوا لای روون بوو کە هیچ شتێکی نییە بۆ ئەوەی بەرگری لە دابەزینێکی ئاسمانی بکات لە دەوروبەری پاریس یان بۆ پاشکۆی لەشکری پازدەهەم، هیچ ئامادەکارییەکی گشتی یان ئامادەکارییەکی خێرا نەبوو، ئامادەکارییەکان هەمووی لە نزیك کەنارەکان بوو.

ئەم راهێنانە چەند بیرۆکەیەکی دیکەی لای رۆنشتد دروست کرد، ئەگەر دوژمن لەسەرەتادا دابەزینێکی گومڕاکردنی کرد ئێمەش بەهەموو توانایەکەوە بۆ رێگە لێگرتنیان تۆپبارانمان کردن، ئەو کاتە هێرشی راستەقینە بۆ هەموو خاڵەکانی تر دەکرێت.

کۆمەڵەی سوپای (ئەنگلۆ — ئەمەریکی) کە لە باشووری بەریتانیادا بوون ئەم دەرفەتەیان هەبوو، دەیانتوانی چەند هێزێکی بێهێز بۆ گومڕاکردن لە نزیك (ئامیانس) یان لە هەر شوێنیکی تر دابەزێنن بۆ ئەوەی هێزی

ئەڵمانی بۆ ئەو شوێنە بهێنن و لەوانەش بوو پاشان هێزی دابەزینی سەرەکیان لەسەر (نورماندی) یان (بریتانی) بێت، ئەوکاتەش ئەڵمانیەکان هیچ یەدەگێکی سەربازییان نەبوو.

بەلام چارەسەر چیە ئەگەر دوژمن هێزەکانی لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست دابەزاند؟ بیرۆکە کۆنەکان دووبارە دروست دەبێتەوە و سەرکردەش ناتوانێت لە شەڕکردندا سەرکەوتووبێ ئەگەر هێزی ئامادەباش و یەدەگی نەبێت، بەلام ئەم بیرۆکەیە لە سەر بەرگریکار دەچەسپێت وەکو ئەوەی لەسەر هێرشبەر دەچەسپێ، چونکە وەکو لە هونەری شەڕوجەنگدا هاتووە کە بەرگریکار کاری پاراستنی هێڵە پارێزراوەکانە.

لیوا (کیرفۆن جوبن بیرك) داوای لە رۆنشتد کرد کە بیروڕاکانی کە بە شێوەیەکی داڕێژراو رێکخرابوون، بۆ خودی هیتلەر بخاتەڕوو لە بارەگاکەی لە (برختسکادن)، رۆنشتدیش لەسەر ئەم داواکارییە رازی بوو، ئەنجامەکەشی لە کۆتاییدا دروست کردنی یەدەگێك بوو لە چوار تیپی زرێپۆش، بەلام ئەمە دوا چارەسەری نەبوو، چونکە سەرکردایەتی رۆژئاوا نەیدەتوانی ئەم یەدەگە بەکاربهێنێت تا هیتلەر رازی نەبێت، بۆیە دووبارە شتەکان دەستاو دەست کران.

بێجگە لەمەش ئەم چوار تیپە نەیاندەتوانی وەکو کۆمەڵەیەك لە ناوچەکانی دەوروبەری پاریس جێگیربن، بۆ دابەشکردنیشیان کات پێویست بوو، تیپی وێرانکەری زرێپۆشی دوازدەهەمین و تیپی راهێنەرانی زرێپۆش لە رۆژئاوای پاریس جێگیربوون، تیپی وێرانکەری زرێپۆشی یەکەم لە بەلجیکا، تیپی وێرانکەری زرێپۆشی حەڤدەهەم لە

باشووردابوون، لە دواییشدا دەرکەوت کە تیپی وێرانکەری زرێپۆشی حەڤدەهەم تا ئەوکاتەش لە قۆناغی دروست بوون دابوو.

لەسەرکردایەتی رۆژئاوا پێویست بوو کە هەموو تواناکان بخاتە کارو هەموو جۆرە راهێنان و کارێك بکات بۆ دروست کردنی یەدەگێك بۆ خۆی، دروست کردنی تیپی تۆپهاوێژەکان شێوازێکی نوێ بوو، لە رابردووشدا ئەم شێوازی دەست گرتن بە یەدەگی تۆپهاوێژەکان بەکارهاتبوو، ناپلیۆنی یەکەم لە یەکێك لەو تیپانە کاری کردبوو، بەڵام لەوکاتەدا ئەوان ئامانجێکی تریان هەبوو.

رووسەکان لە رۆژهەڵات دا هەڵسان بە دروست کردنی تیپی تۆپهاوێژێکی جیاواز و بە قەبارەی جیاجیا و ئامێری نوێ، ئەم تیپانەش وەکو ئامرازێکی چالاك بوو بە دەست سەرکردایەتی باڵا، سوپای ئەڵمانی لە ساڵەکانی (١٩٤٤ – ١٩٤٥) چەند تیپێکی تۆپهاوێژی هەبوو کە لە شەش جۆر یان زیاتری تۆپهاوێژ پێکهاتبوو ئەندازەکانیشیان لە نێوان (٥ ,٧) تا (٢١) سانتیمەتر بوو، ئەم تیپە تۆپهاوێژانەش زۆر چالاك بوون لە جەنگی (ئاخن).

بەڵام دروست کردنی تۆپهاوێژەکان تا بەهاری ١٩٤٤ جێ بەجێ نەدەکرا، پێویستی بەکاتی زیاتر هەبوو، لەنێوان سێ سەد سەرە تۆپهاوێژ بڕیاردرا کە ١٠جۆری ئەندازە جیاواز بۆ دروست کردنی چوار تیپ بەکاربهێنرێت، بەڵام جیاوازییە گەورەکانی کاتی ئیش کردن، وای کرد کە دروست کردنەکەی تا کاتی بەرپابوونی شەڕ دوا بکەوێت.

شارەزای گشتی زرێپۆشەکان کە (کودریان) بوو، سەردانی بەرەی رۆژئاوای کرد لە نیسانی ١٩٤٤دا، بۆ ئەوەی چاودێری چۆنیەتی دروست

بوونی یەکەی زرێپۆشەکان و راهێنانەکانیان بێت و گفتوگۆی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو زرێپۆشانەش بکات.

ئێمە دەمانزانی کە (کودریان) پشتگیری بیروڕاکانی رونشتدی دەکرد بۆ بەکارهێنانی ئەو تیپە زرێپۆشانە لە ناوچەی کەنارەکان دا نەك لە کەنارەکاندا، لەو سەردانەیدا لەگەڵ ڕای سەرکردایەتی رۆژئاوا کۆك بوو کە ئاگاداری لەو شوێنانەوە بڵاوبکرێتەوە کە دوژمن تیایدا دادەبەزێت، پێشنیارەکانی (کودریان) گواستنەوەی یەکە زرێپۆشەکانی کەناربوو بۆ ئەو شوێنەی کە دەتوانرێت کۆنترۆڵی ڕاست و چەپی پێ بکرێت، ئەگەر چی وێرانکردنی پردەکان بەهێرشی ئاسمانی و تێکدەرانە کارێکی چاوەڕ وانکراو بوو، بۆیە پێویستی دەکرد کە رێڕەوی پەڕینەوەی کاتیی بۆ شوێنی ئەو پردانە دروست بکرێت، (کودریان) داوای کرد کە ئەو گۆڕانکارییانە و گواستنەوانە لەرێگە لاوەکیەکانەوە بێت و لەسەر زەویە چۆلەکان بکرێت دوور لە رێگا گشتیەکان و ئامادەکاری تەواویشی بۆ بکرێت.

هیتلەر بەم شێوەیە وەلامی پێشنیارەکانی (کودریان)ی دایەوە (( ئەو پێشنیارانە زۆر باشن، بەلام من زۆر متمانەم بەراستیەکانی رۆمل هەیە ! ! برۆ بۆ لای رۆنشتد و رۆمل پاشان هەواڵم بدەرەوە))

(کودریان) بەئۆتۆمبێلەکەی خۆی لە (سانت جێرمان)ەوە بۆلای رۆمل رۆیشت لە (لاروشت کویون)، بەلام نەگەیشتنە هیچ رێککەوتنێك.

رۆمل سوربوو لەسەر بیروڕایەکانی خۆی و باری کەرتە زرێپۆشەکانی نزیك کەنار، (کودریان) لەرێگەی گەڕانەوەی بۆ (سانت جێرمان)

پەیوەندی بەڕۆنشتد کردو هەردووکیان لەسەر بڕیارەکانی پێشوویان سوربوون....

لەسەرەتای مایس (کودریان) ئەنجامی ئەو گفتوگۆییانەی بە هیتلەر ڕاگەیاند، ئەویش پشتگیری (ڕۆمل)ی کرد.

وەکو لە پێشوتردا باسمان کرد ڕۆنشتد پێشنیلری دروست کردنی لەشکرێکی نوێی کرد کە لەو لەشکرەی کە لە دورگەی (بسکای)و دەریای سپی ناوەراست پێك هاتبێت و پاشان چەند یەکەیەکی نیشتەجێ (ئەلپ)یشی بۆ زیاد بکرێت، سەرۆکی گشتی ئەو لەشکرەش بۆ لیوا (بلاسکو ویتس) و سەرۆك ئەرکانەکەشی لیوا (فۆن کیلرن فیلدت)ی بۆ دەست نیشانکرا بوو.

بڕیاربوو کە دەستەی ئەرکانی ئەم لەشکرە لە ڕۆژی ١٠ مایس دا ئامادەبن، بەڵام ئەو دابەزینەی کە ڕۆنشتد چاوەڕوانی دەکرد تا دەهات زیاتر دەبوو لە مانگەکانی ئازارو نیسان و مایس دا، چالاکیە ئاسمانیەکانی هاوپەیمانان بە پلەی یەکەم زیادی کرد، کاتێك (کودریان) سەردانی سەرکردایەتی ڕۆژئاوای کردو هەستی بەفراوانی کۆنترۆلی هاوپەیمانان کرد، هێرشی هاوپەیمانان بەردەوام بوو، تەنها بۆ سەر فڕۆکەخانەکانیش نەبوو، بەڵکو ناوچەی ڕاهێنان وهێلی شەمەندەفەریشی گرتەوە، بۆیەش ئەو یەکانەی کە دەیانویست بچن بۆ پاریس، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەمتر دەبۆوە، هێرشەکان سەنتەری گەیاندنی ڕۆژئاوای لە هۆلەنداو بەلجیکاو باشووری فەرەنساشی گرتەوە، هێرشەکانی هاوپەیمانان بەربەستی لەبەردەم کۆمەکی ئەڵمانیەکان دروست کرد، لەمانگی مایس دا

دەست کرا بە خاپوورکردن و وێرانکردنی پردو بەربەستەکان، هەردوو ناوچەی (نورماندی) و (بریتانی) لەباکوور و باشوور لەیەکتر جیاکردەوە.

ئێمە هەستمان بەوە کردبوو کە دوژمن مەبەستی ئەوەیە تیپی لەشکری پێنجەم نەگوازینەوە رۆژئاوا، و رێگە بگرێت لە جموجۆلی هێزی ئەڵمانیا لە باشووری فەرەنساوە بۆ باکوور، بەشێوەیەکی رێکو پێکیش دەیویست هەردوو ناوچەی (بریتانی) و (نورماندی) لەناوچەی سەرکردایەتی رۆژئاوا جیابکاتەوە، هێرشەکانی بزوتنەوەی بەرگریکارو کارەتێکدەرەکانیان تادەهات زیاتر دەبوون، ئەمەش مانای ئەوەبوو دوژمن مەبەستی هێرشێکی یەکلاکەرەوەیە.

پاریس هەر بەئارامی مایەوە، سەنتەری بزوتنەوەی بەرگریکاری فەرەنسی لە ناوچەی ئەلپ بوو لە رۆژهەڵاتی رۆن، بە شێوەیەکی بەردەوامیش (تۆلۆز) و (لی مۆکس) و (کلێرمونت – فیرانت)یان کردبووە ئامانج، زۆربەی زۆریشیان لە ناوچەی (براینس) و بریتانی) بوون.

ئەوان بزوتنەوەیەکی هەماهەنگی کارو رێکخراو بوون و لەلایەن ئەفسەرانی فەرەنسیەوە بەڕێوە دەبران، بێجگە لەمانیش چەندان دەستەی چەتەگەر هەبوو جلی شارستانی و هەندێك جاریش جلی میریان لەبەردابوو، ئەو چەتانە بەزۆری لە ئیسپانی و خوێن رێژە پەرتو بڵاوەکانی سوپای ئیتالی هەڵوەشاوە بوون لە ساڵی ١٩٤٣دا، بۆیەش دایشتوانانی فەرەنسا داوای پاراستنی گیانی خۆیان لە ئەڵمانیەکان دەکرد.

لە ساڵی ١٩٤٤ دا کارگەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە کاروانی چەکداری دروست بکرێت لە باشووری فەڕەنسادا، بۆ پارێزگاری کردن لەو بارە خۆراك و کەلوپەلانەی کە دەگوازرانەوە بۆ شوێنە ئارامەکان.

لادانی شەمەندەفەرەکان لە هێڵی راستەقینەی خۆیان و ئەنجام دانی هێرشی زەمینی و خاپورکردنی وێستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەباو ئامرازەکانی گواستنەوە، تەنگیەکی گەورەی دروست کرد، تەنانەت مەترسیەکی گەورەبوو بۆ بەشی دواوەی بەرەی ئەڵمانی.

هەردوو سەرکردەی سەربازی لە پاریس و برۆکسل هەوڵیان دا کە کۆنترۆلی جموجۆلی بزوتنەوەی بەرگریکاری بکەن بە یارمەتی پۆلیسی نهێنی، سەرۆکی پۆلیسی فەڕەنسا ئاماژەی بەوەدا کە هێزەکانی ژمارەیان کەمەو، چەکدارکردنیان ماوەیەکی زۆری دەوێت بەجیاوازی کردن لەگەڵ پەناهەندە دوژمنەکانیان.

سەرکردەی سەربازی لە پاریس داوایەکی پێشکەش بە هیتلەر کرد بۆ ئەوەی ژمارەی پۆلیسی فەڕەنسی زیاد بکات و بە باشترین چەکیش چەکداریان بکات، رۆنشتد فەرمانەکەی جێبەجێ کردو بڕواشی وا بوو کە ئەو چەکانە دوولایەنە دەبن، هیتلەریش زۆر بەئاگا بوو بەڵام هەر رازی بوو لەسەر زیادکردنی پاسەوانە میللیەکان بۆ شەش هەزار کەس و پاشان بە باشترین چەکیش چەکداربکرێن، بە تایبەتی بەدەمانچەی بەریتانی، کە شەوان بۆ بزوتنەوەی بەرگریکاری فرێ دەدرایە خوارەوە.

لەکاتی شەڕدا زۆرجار چەند یەکەیەکی تەواوی پۆلیسی فەڕەنسی لەگەڵ یەکە ئەڵمانیەکان یەکیان دەگرت.

رێژەی بزوتنـەوەی بـەرگریکاری هـەرگیز نـەدەتوانرا بەشـێوزەیەکی ورد دیاری بکرێت، دەسەڵاتدارانی فەڕەنسا هێـزی بزوتنـەوەی بـەرگریکارییان بە شەست تا نەوەد هەزار کەس دەخەملاند، بـەڵام زۆربـەی ئەڵمانیـەکان ژمارەکەیان لەوە زیاتر دەزانی، سیفەتی هەر بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی ئەوەیە نایـەوێت رێـژەی بەشـداربووەکانی بـدرکێنێت، چـونکە ناوبـەناو ژمارەیان زیاد و کەمی دەکرد.

بـەرحاڵ گەشەسـەندنی ئـەم بزوتنەوەیـە بـەم شـێوەیە مەترسـیدارە لـە کۆتایی بەرەی کەنارەکان، بەڵگەیەك بوو لەسەر نزیك بوونەوەی بەرواری هێـرش کـردن، زۆربـەی دانیشـتوانەکان ئـارام بـوون، بـەڵام بەشـێکی زۆریشیان دڵیان لەگەڵ ئەواندابوو.

هیتلـەر مـانگی نیسـان یـان ناوەراسـتی مایسـی ١٤٤ بەسـەرکردایەتی رۆژئاوای راگەیانـد، کـە هەنـدێك راپـۆرت ئامـاژە بەدابـەزینێك دەکـەن لـە نورماندی.

رۆنشـتد داوای هاتنـە خـوارەوەی سـوپای ئـەڵمانی کـرد، ئـەو تیپـەی راهێنـانی تۆپهاوێـژەکانیان دەکـرد گواسـترانەوە بـۆ ناوچـەی باشـووری رۆژئاوای پاریس ئەگەرچی تا ئەوکاتـە بەتـەواوی رێـك نـەخرابوون، تیپـی وێرانکـاری تۆپهاوێـژەکانی دوازدەهـەمیش لـە باشـووری پـاریس لـە ئامادەباشـیدا بـوون، بـەڵام ئـەو دووە تیپـە وەکـو یـەدەگێکی گشـتی بـەکاردەهاتن، ئەمـەش مانـای ئـەوەبوو هیتلـەر خـۆی سەرپەرشـتی بەکارهێنانیان دەکات.

ژمارەی کۆتایی تیپەکان گەیشتە شەست تیپ، هاوپەیمانان لـە بـەریتانیا هێزێکـی زیاتریـان لـەو هێزانـەی ئەڵمانیانـە بـوو، بـەڵام جیاوازیەکـە

لەوەدابوو ئـەڵمانیا هـەزار پێـنج سـەد میلـی لـەژێر دەسـت دابـوو، بـەڵام هێزەکانی هاوپەیمانان دەیانتوانی لەهەر ناوچەیەك بیانەوێت کۆببنەوە.

تیپە ئەڵمانیەکان زۆر جیاواز بوو لە تواناو سیفەتە سەربازییەکان، بـەڵام لـەڕووی چـەك و سـوتەمەنی و کەلوپـەل هـەژاربوون، ئەگـەر جیاوازیمـان لەگەڵ یەکەی هاوپەیمانان پێکرد.

لە بەهاری ١٩٤٤ هیتلەر زانیاری باوەڕپێکراوی وەرگرت کـە هاوپـەیمانان لە نورمانـدی دادەبـەزن، بـەڵام سـەرکردایەتی رۆژئـاوا ئـەم زانیارایانـەی نەدەزانی، بۆیەش لەم ناوچەیەدا هێزێکی زۆریان کۆکردەوە هەر لەیەکەی یەکـەم و نـەوەدی ئاسمـانی و چـەند یەکەیـەکی بـەهێزی تیپـی (٢٤٣)ی زەمینی، وەدەستەی چەترداری (جیکر)ی دووەمیشیان نارد بۆ ئەوشوێنە کە ئەو کات تازە دروست کرابوو.

لــە دەوروبــەری پاریســیش لیــوای تــانکی دەیــەم (أ) کــە لەلایــەن سەرکردایەتی رۆژئاواوە دروست کرابوو جێگیربوو کـە بۆماوەیـەکی کـاتی ئامادەکرابوو و چەندان تـانکی فەڕەنسیان هـەبوو، ئامادەکارییـەکان تـا (کونتنتین) بەردەوام بوو، سوپای حەوتیش بۆ ئەم ناوچە هێرش لێکـراوە گوازرایەوە، سەرکردەی سەربازی پاریس دەستەیەکی پاراسـتنی بـۆ ئـەم مەبەستە تـەرخان کـرد، ئـەم خۆرێکخسـتنە سـودێکی زۆری نـەبوو بـەڵام کارێك بوو دەبوایە بکرابوایە.

سـەرکردایەتی رۆژئـاوا هـیچ هێزێکـی تـری نـەبوو بێجگـە لـەم هێزانـە، دەتوانرا چەند یەکەیـەك بەتـەواوی لەناوچـەی سـوپای پازدەهـەم بگـوازر بوایەوە، بـەڵام کـەس نەیـدەزانی ئـەم ناوچـە گرنگـە، لـە لایـەکی تـرەوە هێرشی بۆ ناکرێت، دەتوانرا وا بزانرێت کە نورماندی تەنها ناوچەیەکە بـۆ

خەلەتاندنی ئەڵمانیەکان بۆ ئەوەی هەموو هێزەکانیان تیایدا کۆبکەنەوە، یان ئەوەتا هێرشی سەرەکی لە (سوم) و (سین) یان لە باکووری (سوم) روو دەدات؟ ئەم هەموو پرسیارەبوون بە مەتەڵێك، وەکو ئەو بارەی کە لە کەناری دەریای س پی ناوەراست بوو، ئایا دابەزینی تیادا روودەدات یان نا ! !رۆمل هەڵوێستی خۆی لەبەرەی سوپای (ب)پێش دابەزینەکە بەم شێوەیە دەربڕی:-

ئامێرە لاسلکیەکانی بەریتانیا بۆ ماوەیەکی زۆرە بێ دەنگن، بەڵام لە ٣٠ی مایس چالاك بوونەتەوە و لە ١ی حوزەیراندا چەندان نامەی لاسلکی کۆد ئامێزیان بە ئاراستەی بزوتنەوەی بەرگریکاری فەرەنسی ناردووە، لەبەر ئەوەی گواستنەوە لاسلکیەکان زۆربوون، بۆیەش نەدەتوانرا بزانرێت ئایا دوژمن لە چ ناوچەیەك دادەبەزێت.

هێرشە ئاسمانیە بەردەوامەکانی سەر بەرەی کە شاری (دانکرك - دییب)و پردەکانی (سین) و (ئەیسن) ئاماژەیەکی دیاربوون کە گەڕانی هێرشی سەرەکی بۆ سەر ناوچەی سوپای یازدەهەم دەبێت.

پێش دەست پێکردنی هێرشەکان، رۆمل هەستی بەدابەزین کرد بۆ سەر یەکەی سوپای حەوتەم و ناوچەی سوپای یازدەهەم، بۆیەش بیروراکەی لەگەڵ (هیتلەر) و (رۆنشتد)یەکی گرتەوە.

(سبیدل) کە سەرۆك ئەرکانی دەستەی رۆمل بوو، ژمارەی هێزەکانی دوژمنی بەچوار لەشکر مەزندە کرد کە زۆربەیان هێزی سەربازی بن، رۆنشتد و رۆمل و سبیدل لەو بڕوایەدا بوون کە ئەگەر دوژمن لەم شەڕەدا سەرکەوت ئەوا راستەوخۆ بەرەو ناوچەی پاریس دەچێت.

ئامادەکارییەکان لەسەر داوای مارشاڵ رۆنشتد کران بۆ ئەوەی چارەسەری هەموو هێرشەکان بکرێت، ئەگەر کرانە سەر بەرەی سەرکردایەتی رۆژئاوا کە (٢٥٠٠) میل بوو، دەکرا چەند یەکەیەك لە کەنارەوە بگوازرێتەوە ئەو شوێنانەی کە چاوەڕوانی هێرشی لێدەکرا.

ئەو فەرمانانە تەنها ئەو هێزانەی نەگرتەوە کە بەرپرسیاربوون لە شوێنی هێرشەکە بەڵکو ئەو هێزانەش ئاگادارکرابوونەوە کە لە شوێنەکانی تردا بوو، تەنانەت ئەو ڕێگایانەشی بۆ دیاریکرابوو کە لێیەوە جموجۆلی تیادا بکەن، هەموو ئەوکارانەش خرابوونە ئەستۆی سەرۆکی هۆبەی جموجۆلی سەرکردایەتی رۆژئاوا کە ناوی (زمرمان) بوو، لە پێشوشدا زۆرمان باسکردووە.

سەرکردەی گشتی لەشکری حەوتەم کە لە نورماندی و بریتانی جێگیربوون، راهێنانێکی سەربازی لە (ریمس) دەست پێکرد، چەندین بەرپرسی یەکە سەربازییەکان تیایدا بەشداربوون، هەر لەوکاتەدا ئەو لەشکرە بڕیاری دا کە ئاگاداری سەخت بۆ سەر یەکە سەربازییەکان بڵاونەکاتەوە، چونکە ماندوبوونیان پێوە دیاربوو، رۆمل بارەگاکەی خۆی بەجێهێشت و گەڕایەوە (ئۆلم)و مۆڵەتی لە سەرکردایەتی هێزەکانی ئەڵمانی وەرگرت لەبەر چەند هۆیەکی خێزانی و بۆ ئەوەش لە (برخستکادن) هیتلەر ببینێت و بەشداری کۆنگرەیەکیش لەوێ بکات.

یەکەم زەنگی ئاگادارکردنەوە بۆ سەرکردایەتی رۆژئاوا بریتی بوو لە نامەیەکی لاسلکی نهێنی کە لە کاتژمێر نۆو چارەگ و نۆو نیوی شەو بوو، لە نامەکەدا بەریتانیا داوای لە بزوتنەوەی بەرگریکاری فەرنسی کرد لە شەوی ٥/٦/ی حوزەیران شەڕ بکەن.

(زمرمـان) یەکـەم کـەس بـوو کـە ئـەو نامەیـەی بەدەسـت گەیشـت و بارەگاکەی ئاگادار کـردەوە بـۆ کـارکردن و پرسـی بـە سـەرۆکی ئـەرکانی سـەرکردایەتی رۆژئـاوا کـردوو، نامەیـەکی ئاگادارکردنـەوەی بـۆ بارەگـای لەشـکری (ب) و لەشـکری (ج) لـە باشـووری فەڕەنسـا و هێـزی ئاسمـانی سـێیەم و هێزەکـانی دەریـایی رۆژئـاواو هـەردوو سـەرکردەی سـەربازی (پاریس) و (برۆکسـل)ی ئاگـادار کـردەوەو لـە سـەعات دەو نیـودا هـەموو ئامادەییەکان جێبەجێ کرابوون، لەشکری پازدەهەمیش کە لە گۆرەپـانی شـەڕەکە دا بـوون ئاگـاداری سـەربازەکانی کـردەوە کـە لـە ئـەو پـەڕی ئاگاداری و خۆپارێزی دابن.

پاش ئەنجامدانی ئەم کارە سەرەتاییانە، بەنامەیەك (رۆنشتد)یان ئاگـادار کـردەوە لـە ئـیش و کارەکانیـان، ئـەمیش لەلایـەنی خۆیـەوە کۆمـەڵێك بروسکەی بۆ هەموو سەرکردایەتی و بەرپرسـانی ناوچـەکە نـارد، سـەعات بیست و یەکی بەیانی رۆژی (٦)ی حوزیران لاسلکیەکان ئـەو بروسـکەیان گەیاندە دوا وێستگە، ئەمەش مانای خێرایی و وەرگرتن بروسکەکان بـوو، هـەمان هەڵوێستیشـیان بـە (مـیرد لیترنـك) بەرپرسـی ژووری هـەواڵگری بارەگای هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا راگەیاند.

لیوا (سبسیدل) لە (٦)ی حوزەیران دا خـۆی بـە سـەرکردایەتی رۆژئـاوای راگەیاند کە لـەنێوان کاتـژمێر دوو وسـێی بـەیانی هێـزە چـەترداره‌کان و یەکەکانی هاوپـەیمانان هێرش دەکەنە سەر دورگەی (کونتنتین)، لـە کـاتی خۆئامادەکردن دا لە خولەکی (٣٠)ی پاش نیوەشەوداو لە کاتـژمێر یـەکی نیـوی بەیانیـدا بـۆ مـاوەی کاتــژمێرێك لـە ئاسمانـەوە چـەتردارەکانی هاوپـەیمانان دابـەزین، راپۆرتـەکان ئاماژەیـان بـە هـیچ فڕۆکەیـەك نـەکرد

هێرش بکاتە سەر نورماندی، یەکەکانی سوپاش لەگەڵ دوژمن دا کەوتنە شەڕ بەڵام ئەنجامی شەڕەکە لەو کاتەدا نەزانرابوو.

رۆنشتد چاوەڕوانی دابەزینێکی سەختی لەو جۆرەی نەدەکرد، وای دەزانی دابەزینەکە درۆو هەڵخەلتاندنە، چاوەڕوانی دەکرد دابەزینی سەرەکی زۆر مەترسیدار دەبێت، بەڵام چاکی دەزانی کە بەرەی باکووری کەناری (نۆرماندی) لەژێر هەرەشەدایە، و لەوانەشە دەروازەکانی روباری (وۆرن) و (فایر) ببنە شوێنی دابەزینێکی تر، بەڵام هەرچەندە سەرکردایەتی رۆژئاوا توانای تێگەیشتنی ئەو بیرۆکەی نەبوو کە ئەو رووداوانەی لەو چەند کاتژمێرە رویدا سەرەتا شەڕێکی راستەقینەیە، بەڵام هەندێك گومان هەبوو لەوەی ئەو هێرشانە تەنها هێرشێکی مام ناوەندییە و پشتی بەدابەزینی ئاسمانی بەستووە، و هیچ هێرشێکی دەریایی لەپشت نەبووە تا ئەو کاتە، سەرکردایەتی رۆژئاوا وای دانابوو هاوپەیمانان ناتوانن هێرشەکان تەنها بە دابەزینی ئاسمانی بکەن ئەگەر هێرشی دەریایی نەکەن، چونکە دابەزینی ئاسمانی خۆبەکوشت دانی راستەقینەی ئەو هێزە دەوڵەمەندەیە و بەس، رۆنشتد لە بەرەبەیاندا بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر دوژمن بۆ رێگە گرتن لەو یەکە چەتردارانەی لە ئاسمانەوە دادەبەزن، ئەگەر هێرشەکە سەرکەوت، ئەوا نیەتەکانی دوژمن دەردەکەوێت و دەزانرێت ئایا بیر لە هێرشی راستەقینە دەکاتەوە بۆ سەر کەنارەکان.

نەدەتوانرا چاوەڕێ بکرێت بۆ ماوەیەکی زۆر، پێویست بوو لەشکری (ب) کە ناوچە مەترسیدارەکان بوو بەهۆی هێزە تایبەتیەکانەوە داخی دڵی خۆی بەدوژمن دابمرکێنێتەوە. ئەو ئامانجانە ئامادەکارییە خێراو دووربینە کانی (رۆمل) بوو.

رۆمل لە سەرکردایەتی رۆژئاوا بوو و هەموو ئامرازەکانی خستبووە کار بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن، نەدەتوانرا لە بیست و چوار سەعاتی یەکەم دا هیچ زیادەیەکی بۆ بکات، ئامێرەکان کەوتنە کارو لە بیست وچوار سەعاتی دوایدا، چەندان هێزی ئامادەکراوی گەورە لە گۆڕەپان دا بەرچاو دەکەوتن، پێش ئەوەی ئەو هێزانە بەشداری شەڕ بکەن، هیچ دەست تێوەردانێکی تایبەتی نەبوو ، لە شەوی ٥/٦ی حوزەیران دا رۆمل بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بەرەو بەرەی شەڕ بەرێ کەوت.

لەشکری حەوتەم زۆرماندووبوو لە شەڕی بەرەنگاربونەوەی چەتردارەکانی هاوپەیمانان، تەنها تیپی بیست و یەکی وەکو یەدەگ هەبوو، و ئەم تیپەش ئامادەکاری تازەی بۆ کرابوو هەر لە تانکی فەڕەنسی کە دەسکەوت بوو، ئەو تانکانە سلیان نەدەکردەوە لە بەرەنگابونەوەی تانکە تازە بابەتەکانی هاوپەیمانان.

رۆنشتد لە نیوەی شەوی ٥/٦ی حوزەیران بروسکەی بۆ هەردوو ناوچەی سەربازی هەردوو تیپی زرێپۆش نارد بۆ ئەوەی ئامادەباش بن هەرکاتێك فەرمانیان پێکرا بە ئاراستەی (کان) و (سنت لو) بجولێن، لەلایەکی ترەوە لە نێوان کاتژمێر دوو نیوو سێو نیوی بەیانیدا فەرمانی بەسەر هەموو شوێنەکان دا راگەیاند، و بەرپرسیاریەتی خستە سەر شانی هەردوو ئەو تیپەی سەر بە بارەگای هێزە چەکدارە گشتیەکانی ئەڵمانیان بەم شێوەیە:

(( تیپی وێرانکاری زرێپۆشی دوازدەهەم بەخێرایی بەرەو ئاراستەی (لی سیوکس) دەروات و تیپی راهێنەرانی زرێپۆشیش لە ئامادە باشی دابن لە جموجۆلیان بەرەو وێستگەی (ئلبرت) و پاشان هەردوو تیپەکە کاتێك

چوونە گۆرەپانی جموجۆڵەکان دەکەونە ژێر سەرکردایەتی لەشکری (ب)، بۆیەش ئەو یەکانەی لەو دوو تیپە زرێپۆشەکە ئێوارە دەچنە نێو شەڕەکە.

سەرۆکی دەستەی ئەرکان و سەرۆکی هۆبەی جموجۆلی سەرکردایەتی رۆژئاوا چەند پەیوەندیەکی تەلەفۆنیان لەگەڵ بارەگای گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا کرد بۆ ئەوەی رەزامەندی بدەن لەسەر دەرچوونی ئەو دوو تیپە، پەیوەندییە تەلەفۆنیەکان لە نێوان کاتژمێر سێ و شەشی بەیانیدا بوو، لە نێوان ئەم کاتژمێرانەدا هێزی ئاسمانی سێ هەواڵیان نارد ئەو پالپشتیانەی کە بەڵنیان پی دابوون ناتوانن جێی بەجێ بکەن چونکە هەلوێستی ئەوان لە رۆژهەلات لاوازە، ئەمەش مانای ئەوەبوو هەموو ئەو ئامادەکاریانەی لەپێشوتردا بڕیاری لەسەر درابوو لە پلانەکانی سەرکردایەتی رۆژئاوا لەگەڵ بادا رۆیشت.

هێزی ئاسمانی سێیەم لە بەرەبەیانی ٦ی حوزەیران تەنها (٩٠) فڕۆکەی هەبوو کە توانای کارکردنی هەبێت لەگەڵ (٧٠) فڕۆکەی شەڕکەریش، نەدەتوانرا هیچ دابەزینێك بەرێژەیەکی گەورەی ئەو هێزانە بکرێت.

سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا بڕیاری جولەی هەردوو تیپە زرێپۆشیەکەی ڕاگرت، ئەو بڕیارەی رۆنشتد لەسەر ئەرکی خۆی دایبوو.

لە بەشی باکووری (کونتنتین) چەندان هێزی ئەمەریکی لە هێزە ئاسمانیەکان لە شەڕدابوون، ژمارەیەکیان نزیك لە نیمچە دورگەکە دابەزیبوون، ئەمەش لەوانەیە لەبەر هۆی باوبۆران بێت، ئەو یەکە ئەمەریکیانە دژی تیپی حەفتاویەکی ئاسمانی ئەڵمانی و چەند یەکەیەکی

زەمینی دووەم دەجەنگان، بۆیەش ئەو یەکانە سەرگەرمی شەڕبوون لەگەڵ هێزە سەرەکیەکانی دوژمن، زۆربەی یەکە دابەزیوەکان لە کەنارەکەدا کۆبونەوەو پاشان لە دەریایەوە پشتگیریان لێوە کرا.

وەکو لە پێشوتردا باسمان کرد سەرکردەی تیپی نەوەدو یەکی ئاسمانی لە ٥ی حوزەیراندا لە (ریمیس) بوو، پاش گەڕانەوەی لە شەوی هێرشەکەدا بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی کەوتە نێو بۆسەی یەکەی چەترداره ئەمەریکیەکان و خۆی و هاوڕێکانی کوژران.

ئەو ڕوداوانە لە نیوەی شەو کاتژمێر شەشی بەیانی لە بەرەی کەنارەوە ڕویاندا، هەر لەم کاتەدا بەرگرییەکانی کەنار خۆیان ئامادەکردبوو بە بەرگریکردن، وا دەرکەوت ئامادەکارییە پێش وەختیەکانی چەتردارو یەکە ئاسمانیەکانی هاوپەیمانان هێرشی سەرەکی بەدوادا دێت.

لەشکری (ب) سەرکردایەتی رۆژئاوای لە نێوان کاتژمێر شەش و شەش و نیوی رۆژی ٦ی حوزەیران لە دابەزینی یەکەی هاوپەیمانان لە ناوچەی بەرفراوانی نێوان (لاوون) و (فایەر) ئاگاداركردەوە کەبەردەوامیش دابەزاندن هەبوو، ئەم دابەزینەش لە ژێر تۆپبارنێکی سەخت لەلایەن تۆپهاوێژەکانی دەریاو هێرشی ئاسمانی بەڕێوە چوو، ئەم ڕاپۆرتەش بۆ هەموو ناوچەکان و سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان نێردرا.

لەو کاتانەدا سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا فەرمانێکی بۆ ناوچەکە ناردو هەر لەو فەرمانەدا جموجۆلی هەردوو تیپە تۆپهاوێژە بەناوبانگەکەی ڕاگرت، بۆ ئەوەی تیپی دوازدەهەم بەردەوام بێت لە جموجۆلی بەرەو (لی سیوکس)، و تیپی راهێنەرانی تۆپهاوێژیش لە شوێنی کۆنی خۆیان لە رۆژئاوای پاریس بمێننەوە، و سەرکردایەتی رۆژئاواشی ئاگادار کردەوە

که تەقەبولی رەخنەلەخۆگرتن بکەن بەهۆی بەکارهێنانی ئەو دوو تیپە تۆپهاوێژە لەسەر بەرپرسیاریەتی خۆیان و بێ ئەوەی فەرمانی فۆهرەر وەربگرن.

کاتێك بەرپرسی ژووری جموجۆلەکان (زمرمان) بەو ئەفسەرەی راگەیاند کە بۆ سەرکردایەتی بالأی ئەلّمانی دەنارد، دابەزینەکان بەردەوامن و داواشی کرد هەردوو تیپی زرێپۆشەکان بەکاربهێنن.

ئەفسەرەکە گوتی ( تۆ ناتوانی بڕیاری لەسەربدەی چونکە دابەزینی سەرەکی لەوانەیە لە شوێنێکی تر بێت).

سەرکردایەتی رۆژئاوا زۆر هەولّی دا بۆ ئەوەی سەرکردایەتی بالأی ئەلّمانیا رازی بکات بەوەی کە کاتی بەرگری کردن هاتووە، و نابێت دوا بکەوێت و ئەگەر دوژمن هێرشی کردە سەر بەرەیەکی تر دەبێت بتوانرێت پالّپشتی بۆ ئەو بەرەیە ڕەوانە بکرێت و ئەگەر هاوپەیمانان لە نورماندی سەرنەکەوتن، ئەوا هێزی زیاتر دەنێرنە ئەو بەرەیە.

بەتەلەفۆن پەیوەندیم بە بارەگای هێزە چەکدارەکانی ئەلّمانیاوە کرد لەمەڕ ئەم بابەتەوە، لە بەیانیەوە تا چەند کاتژمێرێکی دوای نیوەڕۆش هەر خەریکی پەیوەندییەکان بووم، بەلأم بێ ئەنجام بوو، وەلأمەکانیان دووبارە بوو دەیانگوت: دەبێت فۆهرەر بڕیاری بدات!!

هیتلەر تا کاتژمێرەکانی بەیانی کاری دەکردو نیوەڕۆیانیش دەخەوت، بۆ یەش لە بارەگای سەرکردایەتی بالأی ئەلّمانیا کەسێك نەبوو بتوانێت هیتلەر لە خەو هەلّسێنێت، بۆیەش زانیارییە گرنگەکانی پی نەگەیشت تا چەند کاتژمێرێکیش کە دوژمن پەلی هاوێشت بوو، لە کۆتایدا هیتلەر لە کاتژمێر سێ و چواری شەو بڕیاری بەشداری پێکردنی هەردوو تیپە

زرێپۆشەکەی دا تا بەشداری بکەن، بەڵام ئەوکاتە زۆر درەنگ بوو، چونکە ئەو دوو تیپە تا ٧ی حوزەیران نەیان دەتوانی بەشداری شەڕ بکەن، تەنانەت وابیردەکرایەوە کە بۆ ٨ی حوزەیران بەشداری دەکەن لەبەر چەند هۆیەکی خەتەرناکی ئاسمانی، ئەو کاتەش هاوپەیمانان زەفەری بە چەند بنکەیەکی کەناری دەگەیەنن، و چەند پردێکی دروستکراویش بنیات دەنێت، بۆیەش لەو باوەڕە دانەبوون هێرشی بەرامبەر سەرکەوتوو بێت.

رەشبینی باڵی کێشابوو و شەڕەکەش لە داخورپان بوو، هەردوو تیپە زرێپۆشەکە لە نیوە شەوی ٦ی حوزەیران بەڕێ کەوتن، بەهەر حاڵ رۆنشتد و سەرۆکی دەستەی ئەرکان لە هەڵوێستەکە دوو دڵ بوون کە ئایا دەتوانرێت بەم شێوەیە رێگە لە دابەزینی دوژمن بگیرێت.

ئەگەر ئەو دوو تیپە زرێپۆشە لە کاتژمێر یەکی بەیانی جموجۆڵیان بکردایە، یەکە پێشکەوتووەکانیش نەیاندەتوانی لە بەرەبەیانی ئەو رۆژەدا بگەنە شوێنی شەڕەکە کە ئامانجی هێرشی ئاسمانی هاوپەیمانان بوو.

تیپی کاولکاری زرێپۆشی دوازدەهەم زۆر لەناوچەی دابەزینەکە نزیك بوو، و دەیتوانی لە نیوەڕۆدا بەشداری شەڕەکە بکات، یان بەلایەنی کەمەوە لە شەودا بەشداری بکات، چونکە (١٠٠) میل لە دابەزینەکە دوور بوو، ئەگەر ئەو دوو تیپە زرێپۆشە پێکەوە بڕۆ یشتبانایەوە لەبەرەبەیانی رۆژی ٧ی حوزەیران دا بەشدارییان بکردابوایە، بەڵام ئەو لێکدانەوانە لە راستیەوە زۆر دوور بوون.

هێرشی هاوپەیمانان ناوچەی کەناری گرتەوەو بەرگرییەکانی ئەڵمانیا لەژێر هێرشی ئاسمانی سەخت دابوو، ئەگەر چی هێرشەکان سەخت بوون

بەڵام کاولکاری نەبوون، بۆیەش هەموو یەکەکان ئاگادار کرانەوە کە ئەوان لەژێر هێرشێکی تۆپبارانی سەخت دان لەلایەن تۆپهاوێژە قورسەکانی دەریایی.

سەرکەوتنی هاوپەیمانان بە ئاسمانی بوو، بەڵکو بەهۆی ئەو لایەنە هونەری و ماددیەی کە هەیان بوو، کەمێکیش سودیان لە هەڵەی ئەلمانەکان وەرگرت، چەکی ئەڵمانی لە ساڵی (١٩٤٤)ەوە پێشکەوتنی بەخۆوە نەبینبوو، هەندێك لە تیپەکان باش بوون و هەندێکی تریان زۆر خراپ بوون، هاوپەیمانان لەبەرەیەکەوە بەهەموو هێزی ئاسمانی و ماددیەوە هێرشیان کرد، بەرگریەکانی ئەڵمانیایان تێك شکاند، وەکو بەرگرییەکانی ساڵی (١٩٤٤-١٩٤٥).

ئێوارەی ٦ی حوزەیران شتەکان ڕوون بووە و هیچ هیوایەك نەما بۆ هەوڵی ڕێگەگرتن لە دابەزاندنی ئەو هێزە مەزنە، لەوانەشە دژە هێرشیش هەبێت کە ڕەنگە سەریش بکەون، بەڵام ئەمەش بارودۆخی گشتی ناگۆڕێت. تیپی هەشتاو هەشتی ئەمەریکی جەختی کردبووە سەر دەوروبەری فالۆن، هەروەها تیپی سەدو یەکی ئەمەریکیش لە نزیك کارینتان بوو، ناوچەکانیشی درێژ دەبووەوە تاکو ئۆرن، ڕاپۆرتەکانیش ئاماژەیان بەوە دەکرد کە سنووری هەردوو تیپەکان تاکو رۆژئاوای بابۆکس درێژ دەبووەوە، شەڕکردنی زووی دژ بە تیپی هەشتاو دووی ئەمەریکی سەرکەوتوو بوو، بەڵام دژە هێرشەکانی ئەڵمانی سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەیان بەدەست نەهێنا.

هاوپەیمانان ئێستا دوو ئاراستەیان هەیە کە دەتوانن هێرشی لیَ بکەن: بەرەو ئارون بە ئاراستەی پاریس، هەروەها بەرەو باکووری کۆنتنتین بە ئاراستەی قەڵای شاربۆرگ.

## بەشی سێزدەهەم

### دواهەمین تیر

ڕۆنشتد لە (٦)ی تەمووزەوە تا سەرەتایەکانی مانگی ئەیلوولی ١٩٤٤ بەخانەنیشن کراوی مایەوە، بەڵام بۆ ئەوەی مانای دووبارە بانگ کردنەوەی بزانین بۆ دووبارە وەرگرتنی سەرکردایەتی شەڕ، پێویستە باسی هەموو ئەو ڕووداوانە بکەین کە لەماوەی خانەنشینی ڕۆنتشد دا ڕوویان دابوو.

پاش چەند ڕۆژێك لەوەرگرتنی پۆستەکەی سەرکردەی گشتی (فۆن کلوکا) هەستی بە هەڵوێستی ئەڵمانیەکان کرد کە لە ڕۆژئاوادا دژی هاوپەیمانەکان شەڕیان دەکرد. هاوپەیمانان کۆنترۆڵی ئاسمانیان کردبوو. هەستی کرد ئەو هەڵوێستەی ئەو پێشتر چاوەڕوانی دەکرد زۆر جیاوازترە لە هەڵوێستی راستەقینەی ئێستا. لەسەرەتا زۆر بەتوندی لەگەڵا ڕۆمڵ بەگژ یەکداچوون، ئەو داوای لە ڕۆمڵ دەکرد هەموو فرمانەکانی جی بەجیٚ بکات، کلۆکا زۆر چالاك و بەهەڵوێست بوو، هەردەم لە هێڵەکانی پێشەوەی شەڕ بوو، پێویست بوو لەسەری پێش هەموو شتێك ڕێکخستنی سەرکردایەتی ڕۆژئاوا ڕێك بخاتەوە، ئەو ڕێکخستنەی کە پێشتر لە بەرەی ڕۆژهەلات ئەزمونی ئاوای نەبینیبوو، لە نورماندی نە تەنها هەڵوێست لە خراپەوە بۆ خراپتر دەچوو،بەڵکو لە بەدبەختیەوە سەرکردەی پێکهاتەی سوپای (ب) (ڕۆمڵ) زۆر بەخەستی برینـدار بوو، ئەمەش کاتێك چەند فڕۆکەیەك هێرشیان کردە سەر ئۆتۆمبێلەکەی لەو کاتەی بەرەو بەرەی ڕۆژئاوا لەسەردانێك دابوو، شوفێرەکەی کوژراو ئۆتۆمبێلەکەشی خۆی بە

درەختێك  داداو ڕۆملیش خۆی فڕی دابووە دەرەوەی، چەند ئەندامێکی لەشی زۆر خراپ شکا بوو، چارەسەری سەرەتایی بۆ کراو گواسترایەوە نەخۆشخانەی (فینسنت) لەیەکێك لەگەڕەکەکانی پاریس. هیتلەر بەم هەواڵەی زانی و داوای لە کلوکا کرد ببێتە بەرپرسی سوپای (ب) ش بێجگە لە کارەکەی خۆی، لەو هەڵوێستە ناخۆشەدا فۆن (کلوکا) لە هەڵوێستێکی دژواردابوو کە نەدەتوانرا بەردەوام بێت، چونکە ئەو لەیەك کاتدا سەرکردەی بەرەی رۆژئاواو سەرکردەی گشتی پێکهاتەی سوپای (ب) بوو. کلوکا بڕیاری دا بچێتە (لاروش – کویون) واتە بۆ بارەگای پێکهاتەی سوپای (ب)، بۆ ئەوەی شەڕی نورماندی لەوێوە بەڕێوە ببات، لەهەمان کاتدا کارەکانی خۆی بەهۆی دەستەی ئەرکەکانی لە سانت جیرمان بەڕێوە دەبرد، بەمەش دوو بارەگای گەورەی هەبوو کە (٤٠) میل لە یەکترەوە دوور بوون. لەنێوان هەردوو بارەگاکە پەیوەندی بێتەل هەبوو، منیش هەموو رۆژێك سەردانی (لاروش–کویون)م دەکرد بۆ ئەوەی هەرچی ڕوداوی نوێیە پێی ڕابگەینم و ڕاپۆرتەکانی وەر بگرم. لەم هەڵوێستانەدا لە ٢٠ ی تەموز چەند ڕوداوێکی ناخۆش ڕوویان دا،(هەوڵی کوشتنی هیتلەر– و) لە (١٥) ی ئاب هاوپەیمانان هێزەکانیان لە کەناری دەریای سپی ناوەڕاستی لای فەڕەنسا دابەزاند، و ئەنجامەکانی ڕووداوی (٢٠) تەموزیش بە ڕوونی پاش هەفتەیەك دەرکەوتن، لە ناوەڕاستی مانگی ئاب بەرەی رۆژئاوا ببووە مەترسیدارترین بەرەکانی جەنگ.

(کلوکا) لەرێگای گەڕانەوەی بۆ لای کەس و کاری لە (متن) ژەهر دەخوات و، مارشاڵ (مودل) لەجێگای ئەو دا دەست بەکار دەبێت، سەرکردەی سەربازی لەپاریس لیوا (فۆن ستول بناگل) لە ٢١ ی تەموز هەوڵی خۆکوشتنی دا کاتێك لەرێگای گەڕانەوەی بوو بۆ بەرلین و هەردوو

چاوی له دەست دا. لەڕاستیدا ئەو رۆژانە رۆژانێکی سەخت بوو. (مـودل) هەروەکو سەرکردەی گشتی له رۆژئاوادا سەرکردەی گشـتی سـوپای ( ب) بوو له بارەگـای سـوپای (ب)، کاتێـك هاوپـەیمانان هێرشـیان کـردە سـەر (سین) لەناوەڕاستی مانگی ئاب دا، مـودل بارەگـای هێنایـەوە دواوە، مـن فەرمانی گواستنەوەی بارەگای گشتی سوپام وەرگرت بۆ ناوچەی چـیایی نزیك (ریمس)، بەمەش دووری نێوان هەردوو بارەگاکە بووە نزیکـەی (٦٠) میل. (مودل) له بارەگای پێکهاتەی سوپای (ب) سـەرقاڵ بـوو بـە شـەڕی سـەختی بـاکووری فەڕەنسـا، مـن و سـەرۆکی ژووری حـەرەکات سـەرقاڵ بـووین بـە دروسـت کردنـی پەیوەنـدی لەگـەڵ فڕۆکـە ئاسمـانی و هێـزی دەریایی و سوپایی ( ج) له باشووری فەڕەنسا. لەبارەگای سـەرکردایەتی رۆژئـاوا چـەندان دەنـگ داوای گەڕانـەوەی (ڕۆنشـتد ) یـان دەکـرد بـۆ خزمەت، پاشان چـەند گفتوگۆیـەك لەگـەڵ (زمرمـان) ی سـەرۆکی هۆبـەی حەرەکات، بڕیارم دا نامەیەك بۆ فەریق (جـودل) بنێـرم، لـە نامەکـەدا بـۆ سەرکردایەتیم ڕوون کـردەوەو گـوتم سـەرکردەی گشـتی تاکـە کەسێکە و بەرپرسی دووبارەگایە کە له یەکتریەوە دوورن و بەرپرسـی دوو ئەرکیشـە و داوام کـرد فـۆن رۆنشـتد وەکـو سـەرکردەی گشـتی لـە رۆژئـاوادا دابمەزرێتەوە. مودل ئەم داواکارییەی گەیانـد بـە بارەگـای سـەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا، پاش چەند رۆژێك هەواڵی خۆشمان پێگەیشت، ئـەوە بـوو هیتلەر داوای له مارشاڵ ڕۆنشتد کردبوو جارێکی تر پۆستی سەرکردایەتی هێزە گشتیەکانی لەرۆژئاوادا وەربگرێت، هەڵوێسـتەکەی هـیچ ئامـانجێکی لی چاوەڕوان نەدەکرا، بەڵام دووبارە مارشاڵ گەڕایەوە. له مارشاڵ فۆن رۆنشتد یان پرسی: بۆچی گەڕایتەوە پۆستی سەرکردایەتی لـە رۆژئـاوادا، هەرچەند ئەوەش دەزانیت هەڵوێستەکە بۆ ئەڵمانیا سەختە، بەڵام وەڵامی

دایـەوەو گـوتی (هۆیەکـە زۆر ئاسـانە، مـن ئـەرکی سـەربازی جێبـەجێ دەکەم، ڕێگرنیم لە ئەرکی خۆم جا لـە هـەر مەترسـیەکدا بێت، دەشـزانم یەکە سـەربازییەکان دڵگران بـوون بەخانەنشـین کردنـی مـن لـە (١٩٤٤)، هەروەها ئەوەش دەزانم کە هەڵوێسـتەکە سـەخت بـووە بەتێکـەڵ کردنـی سەرکردایەتی ڕۆژئاواو سەرکردایەتی پێکهاتەی سوپای (ب).

سـەرکردە گـەورەکانی هاوپـەیمانان و هەرێمـەکانی تـر هەسـتیان بـە گەڕانەوەی مارشاڵ ڕۆنشتد دەکرد و لە ناوەڕۆکی گەڕانەوەی دەگەیشـتن و وەکو ئەوەبوو وڵاتەکەیان مەترسیەکی بەسەردا هاتبێت. ڕۆنشـتد دوور بوو لە هـەر مەبەسـتێکی تاکەکەسـی لەگەڕانەوەیـدا. ڕۆنشـتد لـە (١٩٤٠) گەیشتووە پلەی (مارشاڵ) پاش ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی کـە بەدەسـتی هێنا بوو، ئەمەش بەرزترین پلەیە کە ئەفسەرێکی سوپا هەوڵی بـۆ بـدات، ئەو هەرگیز پێویستی بە نیشانەی ئازایەتی و لاواندنەوە نەبوو، جانتاکەی پڕبوو لەو دیاری و بەخشینانەی کە لە ماوەی خزمـەتی درێـژدا بەدەسـتی هێنـابوو، دەیتـوانی لـە ئـەڵمانیا دوور لـە هـەموو بەرپرسـێتیەك بـژیت. ڕۆنشتد چەندین جار هەستی بە هەڵوێستە مەترسیدارەکان دەکرد هەر لـە دەست پێکردنی هەڵمەتەکان بۆ سەر ڕووسیا، لەسـاڵی (١٩٤٣) نـەیتوانی هەڵوێستە مەترسـیدارەکانی بگۆڕێـت و بـوونی لـە نێـو پیاوەکانیـدا بـەرز ببـووەوە، چـونکە لـەکاتیَ تەنگانـەدا بـەجێی نەهێشـتبوون. ئـەو وڵاتانـە چەند دڵخۆشن کە پیاوی لەو جۆرەیان هەبێت، ئەوانەی خزمـەتی دەکـەن بەبێ بەرامبەر.

لەتــەموزی (١٩٤٤) داوام کــرد بمگوازنــەوە یەکــە چــالاکەکان بــەڵام سەرکردایەتی باڵا داوایەکـەی ڕەت کردمـەوە، بـەڵام ئێسـتاو لەسـەرەتای

ئەیلوول داواکەیان قبول کردم، لەپشتی منەوە لیوا(ویستفال) هەبوو کە ئەفسەریکی خاوەن ئەزمونی مەزن بوو لە ئەفریقیا و ئیتاڵیا.

لەسەرەتادا پۆستی سەرکردایەتی فەیلەقێکی وەرگرت پاشان بوو بە سەرکردەی سوپا لە رۆژئاوا، بەم دووریە زۆر دڵتەنگ بووین، بەڵام بڕیارەکانی هیتلەر هەرگیز هەوڵی رەت کردنەوەی تیا نەبوو.

لە ٥ ی ئەیلوول دا ئۆتۆمبیلەکەی مارشاڵ گەیشتە سەرکردایەتی رۆژئاوا لە (ئارن بێرك) نزیکی (کوبلنز)، هەموو ئەفسەرو سەربازەکان بەدەم زەردەخەنەوە سڵاویان لە سەرکردەکەیان کرد.

رۆنشتد زانیاری تەواوی وەرگرت و هەڵوێستی گشتی لەلا ڕوون بووەوە، لە کاتێك دا سەرۆك ئەرکانی نوی لیوا (ویستفال) لەبارەگای هیتلەر کاری دەکرد. رۆنشتد هەڵوێستەکەی بەم شێوەیە ڕوون کردەوە :-

((ئێستا ئێمە لەسەرەتای ئەیلوولی (١٩٤٤)داین، ئایا هاوپەیمانان دەتوانن چی بکەن؟ هێڵی گشتی جموجۆڵەکان وەکو لە پێشتردا باسمان کرد لە نورماندیەوە بەرەو هەردوو لای پاریس و هەردوو لای(ئیخن) درێژ دەبێتەوە بەئاراستەی رۆر و باکووری ئەڵمانیا و ، بۆ ناوەوە بە ئاراستەی بەرلین، بۆیەش باکووری ئەڵمانیا زیاتر لەباشووری ئەڵمانیا و ناوچەکانی تر مەترسیدارترە بۆ شەڕکردن.

((بەریتانیەکان هێڵی جموجۆڵەکانی تایبەت بەخۆیان گۆڕی و بەلجیکایان بڕیوەو بەرەو ڕاین هاتن بەرەو باکووری ئەڵمانیا و کەنارەکانی، فەرەنسیەکانیش لەگەڵ هێزێکی بی هێزی ئەمەریکی بەرەو پێش دەهاتن بە ئاراستەی ڕاین لە باشووری ئەڵمانیا، بەپێی پلانە کۆنەکەیان لەسەردەمی لویسی چواردەهەم، ئایا بەشێکی ئەو هێزە سەرکوتکەرەی

ئەمەریکا بەرەو کویّ دیّت؟ ئایا دەتوانن بە هەماهەنگی سوپای باشووری هاوپەیمانان، بەرەو (فرانکفۆرت)بیّت، یان هاوکاری لەگەلّ هیّزە بەریتانیەکان دەکەن و بە ئاراستەی (ئیخن- رۆر - بەرلین) دیّن؟؟ بڕوام وابوو بەشیّکی مەزنی سوپای ئەمەریکا بەرەو باکووری رۆژهەلاّت دیّن لە سەر هیّلّی ( تریر - ئیخن)و بەئاراستەی یەکەی (کولون-رۆر) باشوور بەرەو باکووری ئەلّمانیا، پاش ئەوەی هاوپەیمانان دەگەنە سنوری ئەلّمانیا، ئەلّمانیای باشووریش کە بەرگەی هیّرش ناگریّت بە ئاسانی دەکەویّتە دەستیان.

((کاتیّك جموجۆلەکان ڕیّڕەوی خۆیان گرت هەستم کرد ڕایەکانی خۆم زۆر ڕاست دەرچوون، پیّشبینیم کرد هاوپەیمانان پیّش رووسیەکان هەولّ دەدەن بگەنە بەرلین)).

بیرۆکەی ڕۆنشتد کەپەیوەست بوو بە باشترین پلانی هاوپەیمانان لە پایزی (١٩٤٤) دا زۆر دلّخۆش بوو، چونکە دەستەی ئەرکانەکانی بەریتانیا و ئەمریکا و فەڕەنسا و کتیّبە سەربازیەکان ماندوو ببوون بە باسکردنی ئەو کیّشەیە. وادیترابوو مارشالّ (مونتکۆمری) بیرۆکەکانی زۆر لە مارشالّ (ڕۆنشتد)نزیك بوو، پیّشبینی کردبوو لە ئەیلوول دا ئەم ڕوداوانە ڕوودەدەن:-

ئەرکی سەرەکی سەرکردایەتی ڕۆژئاوا بریتیە لە ڕاوەستاندنی جموجۆلی پاشەکشەکردنی گشتیە و بەهیّزکردنی یەکەی بەرەکەیە. لەبەرئەوەی سەرکردایەتی بالاّ زۆر دەست وەردەداتە ئەرکەکان، بۆیە ئەم هەولّدانە سەرکەوتنی تەواو بەدەست ناهیّنیت، هۆلّەندا کە لە بازنەی لای ڕاستی بەرەی گشتی بوو، دەبوایە پاریّزگاری لیّ بکریّت جا بەهەر شیّوەیەك

بێت، دوور له چۆڵکردنی ئەو وڵاته بەشێوەیەکی ڕێکخراو. وه بەشێکی ڕێك نەخراوی یەکەکان کەبە سوپای نۆزدەهەم ناسرابوو، دەبوایە پارێزگاری بکرابوایه دوور له ڕۆژئاوا چونکه هیتلەر فەرمانی دابوو هێزی زرێپۆشی پێنجەم هێرش بکاته سەر دەشتی (لانکرس)، ((سوپای نۆزدەهەم لەسەری پێویست بوو زۆر بەخێرایی هێڵی ڕۆژئاوای چیایی فۆجی (بلفورت) بگرێت، بۆئەوەی لەو شوێنەدا سوپاکەی ڕێك بخرێتەوه و بە هاوکاری سوپای یەکەمیش کە ئامادەباش بوو له باکووردا پارێزگاری بکەن له بەرەکە. ڕۆنشتد بەسەیرکردنی توانای بەرگری، هەڵوێستی بەم شێوەیه ڕوون کردەوه: من دەتوانم بڕیار لەسەر ڕاستەقینەیی (دیواری ڕۆژئاوا) دا بدەم کەهیچ گونجاو نییه، دیارترین کەم و کوڕیەکانی ئەم دیواره درێژ بوونەوەیەتی لەیەکەی باشوورەوه بۆ (شاربورغ)، دەبوایه درێژ بونەوەکەی لەچیاکانی فۆجەوه بەئاراستەی (بلفورت) بوایه لەکاتێکی گونجاودا. ئەم هێڵەش لەسەر نەخشه ئاماژەی بۆ کراوه، بەڵام هەرگیز دروست نەکراوه. قەڵای میتزیش هەمان ڕۆڵی خەمناکی بینی وەك ئەوەی قەڵاکانی کەنارەکانی فەڕەنسا بینیان. ئینجاش هیچ بڕیارێك دەرنەکرا بۆ ئەوەی لەکاتێکی گونجاودا فەرامۆش بکرێن، ئەمەش پاش ئەوەی بەره بەره بایەخی نەدەما له بەرەی جەنگ، ئەو قەڵایانەش بەردەوام دەبوونه هۆی ئەوەی سەربازەکانمان قووت بدرێن به بێ ئەوەی بتوانێت دوژمنەکانمان ڕابگرێت.

((هیچ بەرگرییەك نەبوو بۆ (ڕاین)، پارێزگاریەکەش بەشێوەیەکی گونجاو نەبوو، سەرکردە هەرێمیەکانی نازیەکان چەندان بەرگریان بە هاوکاری دانیشتوانانی ڕۆژئاوای ڕاین لەنێوان دیواری ڕۆژئاوا و ڕوبارەکان دروست کردبوو، بەڵام له لایەنی سەربازییەوه ئەو بەرگرییانە سوودیان

نەبوو)). بیرۆکە سەربازیەکان پێیان وابوو دەبێت بەرگرییەکی سەخت بکرێت بۆ ماوەیەکی زۆر لە رۆژئاوادا، بۆ ئەوەی کات بەدەست بهێنریت، پاش ئەوەش دەتوانریت پاشەکشە بکرێت بۆ دواوەی راین. کاتێك رۆنشتد گەڕایەوە سەرکردایەتی رۆژئاوا لە ئەیلوولی (١٩٤٤) دا بەرەکە بەم شێوەیە درێژ بووەوە:—

(ئەوستند — ئەنتویرب — ماستریخت — لییج — ولاتی لۆکسمبۆرگ — میتز — نانسی — بەرەو باشووریش)، هیچ پەیوەندیەکیش لەگەڵ (بلفورت) نەبوو تاکو سنوری سویسرا، دەبوایە پەیوەندی هەبوایە لەگەڵ سوپای نۆزدەهەم لەباشووری فەرەنسا، بەلام ئەو سوپایە لەم رۆژانەدا شەڕی دەکرد لە رۆژئاوادا. سەرکردایەتی رۆژئاوا لە دوو تێکەلە سوپا پێك دەهات کە بەم شێوەیە بوو :—

١— پێکهاتەی سوپای (ب) بەسەرکرایەتی (مودل) بوو هەریەکە لە سوپای پازدەم و سوپای چەتردارەکان و سوپای (حەوتەم) ی لەخۆ گرتبوو.

٢— پێکهاتەی سوپای (ج) بەسەرکردایەتی بلاسکویتس بوو هەردوو سوپای یەکەم و نۆزدەهەمی لەژێر کۆنترۆل دا بوو.

سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەردوو پێکهاتەی سوپاش لە (هۆزدن) درێژدەبۆوەو بە (بیت بیرگ) ەوە دەچووە (ئەندەرناخ) و ئینجا بۆ راین.

رۆنشتد لە لایەنی سەربازیەوە هەستی دەکرد کە شەڕەکەیان دۆڕاندووە و سیاسیەکانیش بە ئاراستەیەکی خراپ هەنگاو دەنێن، بەلام لە گۆشە نیگای سەربازی و لاوەکییەوە بێجگە لەمە چارەسەری تر نەبوو کە گونجاو بێت، مارشاڵ کاتێك گەیشت درکی کردو:— فەرمانی دەرکرد بۆ

هەردوو سوپاکە تاکو بەرەکانیان بگوازنەوە بۆ هێڵی (زۆول) — لیسل — ئارینم —مۆن— دیواری رۆژئاوا — لایەنی رۆژئاوای چیاکانی فۆج—بلفۆرت) وە دووربکەونەوە لە هەر شەڕێك کەپێویست نییە و رێگا بگرن لە هاتنە ژوورەوەی دوژمن، بەمەش کات بەو یەکە ماندووانە دەدات لەشەڕەکەدا زیندوییەتی و رێکخستنی خۆیان وەربگرنەوە بۆ بەرگری کردن، بەپێی بڕیارەکانی رۆنشتد یەکەی زرێپۆشەکان دەبوایە شوێنی خۆیان بگرن لە دوورەوەی ئەو بەرەیەی کە بۆیان دەست نیشان کرابوو. لەو کاتەدا هاوپەیمانان پێویستیان بە راوەستانێکی کورت دەبێت بۆ رێکخستنەوەی هێزەکان، ئەم ڕاوەستانەش سوود بە ئەڵمانیەکان دەگەیەنێت. بەلام ئەو هەموو بیرۆکانە چ سوودێکی هەیە کاتێك فەرمانی سەرکردایەتی باڵا بە (نا) وەلام بدرێتەوە !!! وەکو پێشتر وتمان رۆنشتد حەزی دەکرد واز لە هۆڵەندا بهێنێت و هەموو هێزە بەرگرییەکان بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست دا بەکاریان بهێنێت. بەهەرحاڵ رۆنشتد دەیزانی دوژمن پاشەکشێ ناکات و ئەویش ناتوانێت لا ببرێت یان گۆڕانکاری تیادا بکرێت، هۆڵەنداش کارێگەریەکی ئەوتۆی نییە لەلایەنی سیاسیەوە، ئەگەرچی هیتلەر بیری لێ دەکاتەوە. پارێزگاری کردن لە زەوییە نزمە کشتوکاڵیەکان بایەخێکی ئابووری هەبوو، بەلام هۆڵەندا خۆی تووشی کێشەیەکی خۆراکی و کەمی خۆراکی ببوو، بنکەیەکی چەکی سەرکەوتنیش لە باکووری هۆڵەندا بوو، بۆیە دەبوایە پشت لەو بنکەیە بکرێت، بەلام ئەو بنکەیە کارێگەری بەسەر جەنگەوە نەبوو. هاوپەیمانان بەرەو رۆژهەلات دەهاتن و گەیشتنە هێڵی (بلفورت — فۆج —میتز—لیونج) و هەندێك لە یەکە سەربازیەکانیش ئاراستەیان بەرەو باکوور بوو بۆ راینی خواروو، بەلام هێزەکان لاواز بوون. بیرۆکەیەك هەبوو بۆ ئەوەی لە

هۆڵەنداوە ئەڵمانیەکان هێرش بکەن بەرەو (ئەنتویرب) و بەرەی هاوپەیمانان لە باکوور کۆنترۆل بکەن، بەڵام لە ساڵی (١٩٤٤) ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە گونجاو نەبوو، چونکە ئەوهێزانە دەبوایە ئامادەباشیەکی چاکیان هەبووایە و کارێگەری دوو هێزیان تیا بوایە، لە هەمان کاتدا دەبووا هێزی ئاسمانی ئەڵمانی بەهێزتر بکرابووایە. هەروەها زۆر ئەستەم بوو هێزە ئەڵمانیەکان بەربەستە تەکنیکی و زەوییە تەنگەکانی خوارەوەی راین و مۆز و ناوچەی ژێر ئاوکەوتووەکان ببڕن.

لە مارتی (١٩٤٤) دا رۆنشتد بڕوای وا بوو کە روبارو ناوچە بەرزاییەکان شوێنیك نین کە بتوانریت پارێزگارییان لێ بکرێت بۆ ماوەیەکی زۆر، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت کێشە دروست ناکات. جارێکی تر لێڵیەك دروست بوو لە پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردە ناوخۆییەکان، راین لە نێو دەشتەکانی ئەڵمانیا بوو، بەمەش بۆیە نەدەکرا دەسەڵاتی ناوەخۆیی بارەگاکان سەرقاڵ بن بەو ناوچەیەوە، سەرکردە نازییەکانیش هەوڵیان دا لەگەڵ خەڵك دا ڕێگریان درووست کرد بۆبەرگرییەکانی راین بەمەش هەوڵەکانی رۆنشتدیان سەخت تر کرد بۆ پارێزگاری کردن لە رووبارەکان. لە دواییدا بڕیاردرا دەسەڵاتی پارێزگاری کردن لە ڕووبارەکان بدرێتەوە دەست سەرکردایەتی رۆژئاوا، لەم کاتەشدا رۆنشتد تەنها توانای دەرکردنی بڕیاری پارێزگاری کردنی لە راین لە دەست دا بوو، ئەگەر چی هەستی دەکرد کاتەکە زۆر دواکەوتووە. ڕووداوەکانی لایەنی ئەڵمانی لە رۆژئاوادا لە نێوان ساڵەکانی (١٩٤٤-١٩٤٥) جەنگێکی دۆڕا بوو کە پیاوە سیاسیەکان دەستیان لێ شوشتبووەوە، لە ناوەڕۆکیشدا پاڵەپەستۆیەکی گەورەیان لەسەر بوو لە هەردوو لایەنی رۆژهەڵات و رۆژئاوا دا، رووسیەکان زۆر بەخێرایی بەرەو رۆژهەڵاتی سنوری ئەڵمانیا و باشوور

دەرۆیشتن و ئاراستەی وڵاتی هەنگاریا. هاوپەیمانان پاڵەپەستۆیان خستبووە سەر باکووری ئیتالیا و لە ناوچەی دۆڵەکانی (ئەلبو) و (ئەلەب) نزیك دەبوونەوە، دوژمن هەنگاوەکانی بەرەو سنوری رۆژئاوای ئەڵمانیا رێکخستبوو، هێزە ئاسمانیەکان دەیانتوانی لە چوار قۆڵەوە هێرشی ئاسمانی بکەن و، گواستنەوەی بەروبوومە پیشەسازی و خەلوزو ئاسن و ماددەی تریش کارێکی گران بوو لەژێر هێرشی هێزە ئاسمانیەکانی هاوپەیمانان. لە مانگی ئەیلوولی ساڵی (١٩٤٤) شەڕ لە رۆژئاوا زۆر سەخت بوو، سەرکردایەتی باڵاش بڕیاری دابوو کە دەبێ پارێزگاری لە هەموو زەوییەکان بکرێت جا بە هەر شێوەیەك بێت، سوپای پازدەهەم و خۆی لە بارێکی مەترسیداردا دەبینیەوە لە باشووری هۆڵەنداو باکووری بەلجیکا. لە چرکەی کۆتاییدا رێگە درا بەپاشەکشێ کردن بۆ خوارەوەی (سکیلدت)، بەڵام ئەم پاشەکشێ کردنە لە راستیدا بەزین بوو. سوپای (ب) توانی بەرەیەکی هەماهەنگ دروست بکات بۆ پارێزگاری کردن لە هۆڵەندا. رۆنشتد توانی بەرەیەکی پتەو دروست بکات ئەگەرچی دەستەی ئەرکانی هێزە گشتیەکانی ئەڵمانیا هونەری جەنگیان بەرەو گاڵتەجاری گۆڕیبوو، چاوەڕوان دەکرا پاش چەند هەفتەیەك هاوپەیمانان بتوانن ئەم هێڵە ببڕن. تیپی چەترداراني (جیکەر) تا ئەو کاتەش توانایەکی باشی شەڕیان هەبوو، چەند تیپێکی زرێپۆشیش دەیانتوانی چارەسەری بارە ناهەموارەکانی بکەن، بەڵام ئەم تیپە زیاتر لە چل تا پەنجا زرێپۆشی هەبوو. جەنگەکە تا دەهات سەختتر دەبوو، چونکە هیتلەر بەردەوام فەرمانی دەدا کە جێگاکانی خۆیان جێ نەهێڵن و یەکە سەربازییە ئەڵمانیەکانیش رۆژ بەرۆژ لەبەر یەك هەڵدەوەشایەوە. ئایا بۆچی هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان ئەم هەلەیان بۆ شەڕ نەقۆستەوە؟

لەسەریان بوو بە ئاراستەی ناوچە زیندوەکان بچن و بەرەی ئەڵمانی ببڕن، ئەگەر هیچ بەرگرییەك نەبوایە ڕێگریان لێ بکات. ڕۆنشتد چاوەڕێی هێرشێکی گەورەی ئینگلتەرا و ئەمریکای دەکرد بە ئاراستەی باکووری ڕۆژئاوا لە ناوچەی (ئایخن–ڕۆد)تاوەکو بەرلین. ڕۆنشتد خۆشحاڵ بوو کە هاوپەیمانان هەلێکی تریان داوەتی تاوەکو بۆ ماوەیەکی کاتی تیشك بخاتە سەرسنوری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا. سەرکردە ڕۆژئاواییەکانی هاوپەیمانان لەوانەیە چەند هۆیەکیان هەبوبیت بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ هێرش نەکەن، لەوانەیە دیواری ڕۆژئاوایان بە بەربەستێکی سەخت دانابێت لەبەردەم هێرشەکانیان، یان ئامادەکاری پاڵپشتی هێزەکانیان نەبوبێت،بۆیەش بۆ کاتێك لە جموجۆل وەستان، ئەم بیرو بۆچوونانە لەکاتدا لە سەرکردایەتی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا باس دەکرا، بەلام هۆی سەرەکی وەستانی جموجۆلی دوژمن نەدەزانرا لە ساڵی (١٩٤٤)دا. هەواڵگری ئەڵمانیا هێزەکانی دوژمنیان بە نۆ یەکەی ئاسمانی بەریتانی مەزەند دەکرد، نیوەی ئەو هێزانە لە ناوچەی نورماندی بوو بەلام نیوەکەی تر نەدەزانرا لە کوێیە؟ سەرکردایەتی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا پێشبینی دابەزینی دوژمنیان لە ناوچە زیندووەکانی بەرەی (دیواری ڕۆژئاوا)و نزیك (بلفورت) دەکرد و، ئەوکات لەگەڵ ئەو هێزە ئەڵمانیەی کە پاشەکشێیان کردبوو دەکەوێتە جەنگەوە، سەرکردایەتی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا هەستی کرد کە لە ناوەڕاستی ئەیلوول دا، بەریتانی و کەنەدییەکان هێرش دەکەنە سەر راین، چونکە دوژمن هەموو ناوچەکانی خوارەوەی راینیان لەڕێگەی ئاسمانەوە وێنە گرتبوو، لەگەڵ پێشبینی دابەزانیان لە ناوچەی (ئایمرج)و(ئارن هایم). هێزە چەتردارەکانی یەکەمیش لەو ناوچەیەدا بوون،لە (١٧)ی ئەیلوول دا ئەوەی چاوەڕوان

دەکرا، ڕوویدا. لە (١٧)ی ئەیلوول دا ڕۆژێکی خۆش بەدەرەوە بوو، بۆیە چاوەڕوانی شتێك دەکرا..بارەگای پێکهاتەی سوپای (ب) بەسەرکردایەتی مارشاڵ مودل گوازراوە بۆ ناوچەی (ئارینم)، بۆ کاتی فریاکەوتن. ناوچەی دابەزینی چەتردارەکانی هاوپەیمانان و یەکە ئاسمانیەکان زۆر بەفراوان بوو، ناوچەی (ئارینم-کلیفس-هوفن-تیبل)ی گرتەوە، بەڵام کوا دابەزینی ستراتیژی لە راینی خواروو وەك ئەڵمانیەکان پێشبینیان دەکرد؟

ڕۆنشتد وای دەبینی کە دابەزاندن لە ئاسمانەوە هیچ مانایەکی نییە گەر مەبەستێکی ستراتیژی بەدواوە نەبێت،واتە داگیرکردنی راین، یاخود مەگەر هێرشێکی پیادەی لەگەڵ نەبێت کە سوپای ٢١ ی بەریتانی پێی هەڵسێت.

ڕۆنشتد زۆر دڵخۆش بوو، چونکە سەرکردەیەکی زیرەکی وەکو (مودل)سەرکرایەتی هێزەکانی دەکردو نزیکیش بوو لە ناوچە ترسناکەکان. هێرشی بەریتانیەکان لەسەر زەمین دا سەرکەوتوو نەبوو، سەرکردایەتی ڕۆژئاوای ئەڵمانیا ئەو هێزانەی هاوپەیمانانی بە شەش تا حەوت تیپی سەرزەمینی و چوار تا پێنج تیپی زرێپۆش مەزندە کردبوو، وای چاوەڕوان کردبوو کە بازگەکانی راین لە رێگەی (ویسل)و(ئارینم)ەوە دەبڕن. لە (١٨)ی ئەیلوولدا هێرشی دووەمی بەریتانیەکان بەهۆی زرێپۆشەکانیانەوە بەرەو ناوچەی (ئایتر هوفن) دەهاتن، لەوێش توانیان بگەن بەو هێزانەی کە لەو ناوچەیە دابەزیبوون. لەهەمان ڕۆژدا لە ناوچەی (ئارینم) دابەزینی دوژمن تا دەهات زیاتر دەبوو، توانرا یەکەی بەریتانی یەکەم و تیپی دووەم و هەشتەم و سەدویەکی ئەمەریکی لە یەکتر جیا بکرێتەوە، تەنانەت بەپێی راپۆرتی هەواڵنێرەکان لیوایەکی

پۆڵەندیش بەشدار بوو تیایدا. لەرۆژەکانی دوای ئە بەرواره شەڕێکی سەخت روویدا لە نزیك (ئارینم) کە لە ٢٣ی ئەیلوولەوە تا ٦ ی ئەیلوول بەردەوام بوو. هێزەکانی بەرتانیا هێرشەکانیان سەرکەوتوو بوو بەئاراستەی (راین) ی خواروو. بەهەر حاڵ کوشت و بڕ لە هەردوولا دا زۆر بوو، سێ هەزار ئەلمانی بریندار بوون و کوژران، ئەمەش سەختی شەڕەکە دەسەلمێنێت. سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیا هەردەم چاوەڕێی جموجۆلی تری دەکرد لە رۆژئاوا، وا بیریان دەکردەوە کە دەتوانرا بەهێرشی پێچەوانەوە ئەو زەویانەی کە کەوتبووە دەست دوژمن جارێکی تر بگەڕێتەوە ژێر کۆنترۆڵیان. لەئەیلوول دا سوپای زرێپۆشی پێنجەمیان بە سەرکردایەتی(مانتوفل) لە رۆژئاوای (ساربیرك) جیگیر کرد، بەڵام ئەو هێزە تا ئەو کاتە ئامادەباشی شەڕی تیادا نەبوو، چونکە لەشەڕەکانی پێشووتردا یەکەکانی تووشی زەبرێکی کوشندە ببوون. بڕیاردرا تیپی زرێپۆشی دوازدەهەم بهێنرێت، پلانەکەی هیتلەر و راوێژکارەکانی بۆ رەوان کردنی ئەو هێزە بۆ رۆژئاوا لە ناوچەی (ناسنی) بۆ ئەوەی بگاتە هێڵی (مۆزل)، بۆ ئەوەی یەکەکانی ئەمریکا لە یەکتر بترازێنێت، بەڵام رۆنشتد بەم هەنگاوانە دڵخۆش نەبوو، چونکە وای دانابوو ئەو هێزانە دەبێت بۆ ناوچەی (ستراسبۆرغ) بنێردرێت، کاتێك فەرمانەکانیان جێبەجێ کرد ئەوسا رەوانەی سوپای ناوچەی (ئیخن) بکرێت. سوپای زرێپۆشی یەکەم توانی رێگەبگرێت لە هاتنە ژوورەوەی ئەمەریکیەکان. هیتلەر بە بێ پرس کردن بە راوێژکارەکانی چەندان سەرکردەی خاوەن ئەزموونی لەسەرکردایەتی هێزەکانی ئەڵمانی دوورخستەوەو سەرکردەی دیکەی لە جێگە دانان، بۆئەوەی چارەسەری ئەو هەڵوێستە مەترسیدارە بکەن. لەم چەند هەفتەیەی کۆتایی ئەیلوولدا (بلاسکویست)ی

لەسـەرکردایەتی گشـتی پێکهاتـەی سـوپای (ج) دوورخسـتەوە مارشـاڵ (بالك)ی لە جێگەی دانا، کەپێشتر لەبەرەی رۆژهەلاّت دا بوو. هیتلەر وای بیرکردبووەوە کە گۆڕینی سەرکردەکان دەتوانێت ئـەم بـارە ناهـەموارەی هێزەکانی ئەڵمانیا بگۆڕێت. (بلاسکویست) سەرکردەیەکی گەورە بـوو بـە لابردنی ئەوسەرکردەیە رۆنشتد زۆر پێی ناخۆش بوو، ئەگـەر چـی (بالـك) زۆر ناسرابوو لە رۆژهەلاّت دا بەلاّم بۆ ناوچەی رۆژئاوا کەسـێکی نەناسـراو بوو. رۆنشتد کاتێك سەرکردایەتی رۆژئاوای وەرگرت لە ئەیلوولی ١٩٤٤ دا زۆر بایەخی بە ناوچەی (ئـیخن) دەدا، پێشبینی دەکـرد کـە هاوپـەیمانان بەرەو باکووری ئەڵمانیا دەچـن لـەرێگای ناوچـەی(ئـیخن-رۆد)ەوە بێـت، بەلاّم ئەم بۆچوونەی راست دەرنەچوو. رۆنشتد بڕوای وا بوو کە سەربازی ئەڵمانی لەو ماوەیەدا (١٩٤٤-١٩٤٥) بەرزترین تواناو متمانەیان هەبوو بە خۆیان بە جیـاوازی کـردن لەگـەڵ سـەربازەکانی ساڵی (١٩١٨). جـەنگی (ئـیخن)دەسـتی پـێ کـردو بەشـێوەیەکی سـەرەکی زرێپۆشـەکان لولـەیان بەرامبەر یەکتر بەرز کردەوە وەکـو ئـەوەی لـە جـەنگی یەکـەمی جیهـانی روویدا و هاوپەیمانان توانیان دیـواری رۆژئـاوا بـبڕن بـە ئاسـانی، سـوپای ئەمـەریکیش تـوانی هیڵـی ئەڵمانیـەکان ببـەزێنێت لـە (ئـیخن) تـاوەکو ناوچەی (رۆر)، (ئیخن) کەلێرەدا باسی دەکەین تەنها شارێك نییـە بـەڵکو ناوچەیەکی گەورەی لە دەوروبەر دابوو وەکو (ئیخن-کیلن کیرجن).

لەسەرەتای ئەیلوول دا بە تەواوی شەڕ دەستی پـێ کـرد، وەکـو شـەڕی شامبین لـە ناوچـەی (فـردون)و (سـوم)و (فلانـدرس) لـە جـەنگی یەکـەمی جیهانی دا روویدا. چەند هەفتەیەك شەڕێکی تونـد بـەردەوام بـوو، دواتـر شـەڕەکە کـەمێك ئاسـایی بـووەوە، هـەروەها رۆژ هـەبوو شـەڕەکە گـەرم دەبـوو، رۆژیـش هـەبوو شـەڕەکە سـارد دەبـووەوە، ئەڵمانیـەکان ئـەم

ڕووداوانــەیان بــەم شــێەیە دابــەش کردبــوو: شــەڕی یەکــەم و دووەم و سێیەمی (ئیخن). بەڵام هاوپــەیمانان بــە جەنگەکــەیان دەوت (بــەرەوپێش چوونی هێڵــی سیکفرید) و (ئــیخن) و (بــەرەوپێش چــوون بــەرەو روبــاری رۆر) جەنگی یەکــەم لــە (٤-٢٣)ئــەیلوول بــوو، جــەنگی دووەم (٢تشــرینی یەکەم -٢٢ تشرینی یەکەم ) و سێیەمیش (٢کانونی یەکەم - ناوەڕاستی کانونی یەکەم)، لەئەنجامی ئەو جەنگە کە لە دەوروبەری دیواری رۆژئـاوا روویدا ناوچەی (ئیخن) کەوتە دەست هاوپــەیمانان و ناوچــەی (رۆر) یــش کەوتــە ژێــر دەســتی هاوپــەیمانان. رۆنشــتد هــەر کــاتی گەڕانــەوەی لــە ئەیلوولی ١٩٤٤ دەیوسـت جەنگەکـە بـە شـێوەی بـەرگری بـەڕێوە ببـات، بۆیەش داوای کرد هێزەکانی ئەڵمانیا پاشەکشێ بکەن بۆ (دیواری رۆژئاوا فۆج) ە لەویدا بەرەیەکی رێك دروست بکات و تاوەکو هاوپەیمانان خۆیـان بۆ شەڕەکە بێن نەك ئەڵمانیا هێرش بکات.

شەڕی (ئادین) رۆڵێکی گەورەی هــەبوو لــە ئــەڵمانیاو دەرەوەو لــە ئـابی ١٩٤٤ دا لەو کاتەی شەڕ لـە نۆرمانـدی بـوو هیتلــەر ناوچــەی ئـاردینی بـۆ هێرش کردن دەست نیشان کرد (رۆنشتد) و (مودل) ئاگایان لەو بڕیارەی هیتلەر نەبوو، هەردوو مارشاڵەکە بێ ئاگا بوون، بۆئەوەی کارەکە زۆر بـە نهێنی بکرێت (جودل) چوار جموجۆلی وەسف کرد :-

١- هێــرش لــە ناوچــەی (فلنــو) بــۆ ســەر (مــۆز) دەســت پێــدەکات بــە ئاراستەی (ئانتویرب).

٢-هێرش لـە بـاکووری (لوکسـمبۆرگ) بـەرەو بـاکووری رۆژئـاوا دەبێـت، ئاراستەکەی بەرەو باکوور دەگۆڕێت تاوەکو ناوچــەی بـاکووری رۆژئـاوای ئیخن

٣–دوو هێرشی تر لە ناوەڕاستی (لوکسمبۆرگ)و (متز) دەست پێدەکات و لە ناوچەی (لونك وی) بەیەك دەگەن

٤–دوو هێرشی تر لە (متز) و ( بکرات) بۆ سەر (نانسی) دەست پێ دەکات.

٥_دوو هێرشی تر لە (ئابینال)و ناوچەی (موین بل کار) دەست پێدەکات بۆ سەر (فیسول).

هیتلەر لەگەڵ راوێژکارانی باسی ئەو پێنج پێشنیارانەی کرد، پلانی سێ یەم و چوارەم و پێنجەمی رەتکردەوە،چونکە هیچ ئەنجامێکی ستراتیژی نەدەدایە دەست،ئێمە دەزانین کە هیتلەر ئەو بەهرەیەی هەبوو کە بتوانێت باشترین ئاراستە هەڵبژێرێت بۆ هەڵمەت بردنەسەر دوژمن، بەڵام لە کاتەدا پێویست بوو بزانێت کاتەکە و بەرەی شەڕ و هێزەکان چۆنن و شارەزایی دەربارەیان هەبێت. گفتوگۆی هیتلەر لەگەڵ کەسە نزیکەکانی لە سەرەتای تشرینی یەکەم گەیاندیە ئەوەی بڕیار لەسەر پلانی دووەم بدات بە وردەکاری زیاترەوە. واتە حەرەکەی شەڕی ئەردین، پاشان مودل و رۆنشتد بەپلانەکەیان زانی بەتایبەتیش سەبارەت بە پلانە سەرەکیەکە. هاپەیمانان دەستیان بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامانەدا گرت، ئەو کاتەی کە مێژووی شەڕەکان بە تەواوی دەنووسرێتەوە ئینجا دەسەلمێندرێت کە هەموو ئەو حەرەکانە لە بیرو بۆچوونی هیتلەرەوە هەڵقولاون. ئەو فەرمانانەش دواتر گەیەنرایە رۆنشتد و ناوی ئەویان لەسەر دانا، کە لەڕاستیشدا ئەو پلانە هی ئەو نەبوو، بەڵکو تەنها جێبەجێ کردنەکەی لەسەر ئەو بوو.

ئەو هۆیانەی کە وای لەهیتلەر کرد بڕیار بدا هێرش لە رۆژئاواوە بێت ئەمانەبوون:

١- ئاواتی دەخواست کتوپڕ هێرش ببرێتە سەر هاوپەیمانان، لەکاتێکدا کە ئەوان وادەزانن هێزەکانی ئەڵمانی ماندوو و هیلاکن.

٢- ورەی گەلی ئەڵمانی بەرزبکاتەوە، چونکە لەو کاتەدا دڵەڕاوکێ رووی لە ئەڵمانیەکان کردبوو، بەتایبەتیش کە هێزەکانی هاوپەیمانان لە رۆژئاواو رۆژهەلاتی ئەڵمانیا نزیك دەبوونەوە.

٣- بەدەست هێنانی کاتی زیاتر ، بۆ ئەوەی دەرفەت هەبێت چەك و کەرەستەی جەنگی نوێ دروست بکرێت.

٤- وا بکات کە نزیك بوونەوەی دوژمن لە ناچەی (رۆ) زیاتر زەحمەت بێت.

٥- هیتلەر وای بینی کە رووخانی ئەڵمانیا لە رۆژهەلات و رۆژئاواوە دێت، هەروەها لەبەرئەوەی رووسیا لە رۆژهەلات بالادەست ترە لە ئەڵمانیا لەهەر خاڵێك لە خاڵەکانی بەرەی شەڕ لە رۆژهەلات، بەلام لەبەرەی رۆژئاوا هێزەکانی هاوپەیمانان بەو شێوەیە نییە وەك لە بەرەی رۆژهەلات هەیە، بۆیە هیتلەر بەو ئاواتە بوو بە هێرشێکی کتوپڕ و لەناکاو هێزەکانی هاوپەیمانان بشلەژێنێ، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە، کە دەڵێن بۆچی پلانی شەڕی ئەردین داڕێژرا؟

هیتلەر لە رۆژی ٢٠ ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٤) هەردوو مارشاڵ (مودل)و(رۆنشتد)ی بانگ کرد بۆبارەگاکەی خۆی، بەلام لەدواییدا بیروڕاکەی گۆڕی و هەردوو سەرۆك ئەرکانەکەی بانگ کرد کە(ویستفال) لەسەرکردایەتی رۆژئاواو (کریبس) لە پێکهاتەی سوپای(ب) بوو

پێیگوتن"هەڵوێست لەرۆژئاوادا ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت بەبەرگری کردن، بەڵکو دەبێت هێرش بکەین".

هیتلەر بۆ ئەوەی دوورکەوێتەوە لەناڕەزایی هەردوو مارشاڵەکە بۆیە راستەوخۆ بانگی نەکردن، بۆیە بەهەردوو سەرۆك ئەرکەکانیان فەرمانەکەی رەوانەکرد. هیتلەر باسی سێ هەزار فڕۆکەی جۆری (جیکەر)ی کرد کە ئامادە کرابوو بۆ هێرشەکە.

بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەی تەواوی فڕۆکەکانی نەدەزانی بۆیە تەنها باسی هەزارو پێنج سەد فڕۆکەی کرد..........لەوانەش هەشت سەدیان ئامادەبوون بۆ خزمەت کردن، لەو ژمارانەش نزیکەی ١٠٠ فڕۆکەی نوێ و تازەیان تیابوو. .

نزیکەی سێ ملیۆن گالۆنی سوتەمەنیان خەزن کردبوو بۆ داواکاریەکانی یەکەم، لەباکووری بەرەی رۆژئاواش بارەگایەك بۆ سوپای سێیەم کرایەوە بۆئەوەی بەرپرسیاریەتی لە پێکهاتەی سوپای(ب) وەربگرێت، چونکە مودل بەپێی فەرمانەکان دەبوایە زۆر بەخێرایی هێرشەکانی جێبەجێ بکات.

کاتێك لیوا (ویستفال) سەرۆکی دەستەی ئەرکانی رۆنشتد کۆتایی هێنا بە خوێندنەوەی راپۆرتەکەی، ماشاڵ رۆنشتد بەم شێوەیە رای خۆی دەربڕی: (من دڵخۆشم کە لەکۆتاییدا لەگەڵ هێزێکی مەزنی رۆژهەڵات بەیەك دەگەین، پێش ئەوەی بەگژداچوونەکەش دەست پێبکات (راین) رزگاردەبێت، دەتوانم بڵێم کەئامانجی دوور بریتیە لە(ئانتویرب)، ناشتوانرێت بەم هێزەی هەیە بگەینە ئەوێ، چونکە لەوکاتەدا هەردوو لای هێرشەکە ئاشکرادەبێت))

لەسەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی(١٩٤٤)لەبارەگای هیتلەرەوە دەستنووسێکی هێڵە گشتیەکانی جموجۆلی هێزەکان کەدەستەی ئەرکانی هێزە چەترداەرکانی ئەڵمانیا ئامادەیان کردبوو، گەیشتە دەست رۆنشتد، (رۆنشتد) یش لەلایەن خۆیەوە رەوانەی لای (مودل)ی کرد کەبەرپرسی گشتی بەڕێوەبردنی هێرشەکە بوو. هەلۆێستەکان لە رۆژهەلات و رۆژئاوا تادەهات مەترسیدارتر دەبوو، هیتلەر ویستی لەنزیکترین کاتدا هێرشەکان دەست پێبکات، بۆیە بڕیاری دا لە (٢٥) تشرینی دووەمی (١٩٤٤)هێرش بکرێت، بەلأم هەر بەروارەکە دوادەخرا، تا لەدواییدا رۆژی(١٦)ی کانونی دووەم بۆهێرشەکە دانرا.

هیتلەر وەکو ساڵی(١٩١٨) بیری دەکردەوە، بەلأم نەیدەزانی قەدەر چی ئامادە کردووە، چونکە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ساڵی(١٩١٨)و ئێستا هەبوو.

پێش ئەوەی هێرشەکە دەست پێبکات هیتلەر چاوی بەرۆنشتد کەوت، رۆنشتد زۆر رەخنەی لەهیتلەر گرت، بەلأم هیتلەر بەرۆنشتدی گوتی (من لەتۆ بەتواناترم بۆبڕیاردان لەسەر ئەم بارە، ئەی مارشاڵ من هاتووم یارمەتیت بدەم)) رۆنشتدیش رووی لی وەرگێراو قسەی نەکرد.

هێرشەکەش لە لایەن دوو سوپای زرێپۆش و هێزێکی پیادە جێبەجێکراو، بەرەو باکوور هەنگاویان نا، سوپای بروسك ئاسای زرێپۆشی شەشەم بەسەرکردایەتی (سیب دیترج) کە لەچوار تیپی زرێپۆشی و تیپێکی پیادە پێك دەهات، دەبوایە بەرەوپێشەوە بڕۆن و لەناوچەی(مونس جاو) باشووری (ئیخن) دەربچن و بەرەو (ئانتویرب)بچن.

لەلای راستیشەوە (لەباشوور) سوپای (مانتوفل)ی زرێۆشی پێنجەم هەبوو، کەلە چوارتیپی زرێپۆش و سێ تیپی پیادە پێك دەهات دەبوایە بەرەوپێش بڕوات و (نامور–برۆکسل) ببڕێت و بەرەو(ئانتویرب) بڕوات، سوپای حەوتەمیش کە لەشەش تیپی پیادەو تیپێکی زرێپۆش پێك هاتبوو بەرپرس بوو لەپاراستنی ئەوهێزانە و ئامانجەکەی لەباشووربوو.

فەیلەقی تێکدەری حەوتەم ئەرکەکەی لەباکوور بوو هەر لەناوچەی باشووری(رویرمونت) بەپێی پلانەکەی رۆنشتد ماوە بەلام هیتلەر ئەم پلانەی رەت کردەوە.

لە(١٦)ی کانونی دووەم بەدرێژایی بەرەی (ئیڤل) جەنگ دەستی پێکرد، سوپای ئەڵمانی نەیدەتوانی جەربەزەیی و هێرش کردن بکات، لەکاتژمێری یەکەم ودووەمدا سەرکەوتن هەبوو، بەلام لەدواییدا هێواش تربووەو پاشان یەکە سەربازییەکان گەیشتنەوە شوێنی خۆیان.

شەمەیکیە کان زۆر بەخێرای وەلامی ئەوهێرشەیان دایە، چالاکیان نواندو لەباشووردابەشێوەیەکی تایبەتی چەندان مێرشیان کردەسەر لایەنی بیهێزی سوپای حەوتەم و لەباکوورییش هێزەکان

بەریتانیا بەهانیان هاتن.

پێشبینیەکانی رۆنشتد بە خێراییەکی زۆر هاتەدی، ئێستا ئەڵمانیەکان لەلایەن هاوپەیمانانەوە لە سێ لاوە هێرشیان دەکرێتە سەر، تیپی بروسك ئاسای زرێپۆشی شەشەم هەرچۆنێك بێت کەمێك بەرەو پێش چووبوو لەلای راستەوە، بەلام سوپای (مانتو فیل)ی زرێپۆشی پێنجەم لەلای چەپ دا کە سەرکردایەتیەکەی باشبوو سەرکەوتو بوو لە پێشڕەوی کردن، بەلام بەتەنها نەیدەتوانی شەڕەکە بەرێتەوە، بۆیە بەخێرایی

هێرشـەکەی هیتلـەری، گـۆڕا بـۆ بـەرگریی هیتلـەری، هێـزە ئەڵمانیـەکان خۆیـان لـەبارێکی دژواردا بینیـەوە، لەبـەر ئـەوە پێویسـت بـوو دووبـارە پاشەکشـە بکـەن بـۆ ئـەوەی هێزەکانیـان ڕێکبخەنـەوە، هـەروەك پێشـتر ڕۆنشتد پێشنیاری کردبوو، بەڵام ئەو پاشەکشـەیە کاتەکـەی زۆر درەنـگ بـوو، ئەمـەش بـەهۆی ئـەوە بـوو کـە هیتلـەر نەیـدەتوانی بـەرەنگاری ڕاستییەکان ببێتەوە، چونکە پلانەکەی سەرکەوتوو نەبوو، ئـەنجامی ئـەم دۆڕانەش بووە هۆی ئەوەی زیانێکی زۆر بە هێزەکانی ئەڵمانی بکەوێت و، دوا هیـوای ئەڵمانیـەکانیش بەسـەرکەوتن لەباریـەك بچێت، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەش سوپای ئەڵمانی بێ پسانەوە و بـە جەرگانـە لـەڕۆژئاوا بـەردەوام بـوو لەبـەرگری کـردن لـە(ڕۆر) و (رایـن) و (ویـز) و ئایـب)، بـەڵام ئـەوەی هیوایەکیان هەبێت.

## بەشی چواردەهەم

### چارەنووسی نادیار و تاریك

شەڕێکی سەختی خوێناوی بەدرێژایی مانگەکانی زستانی ساڵی (١٩٤٤-١٩٤٥) درێژەی کێشا، هەروەها بەفەرمانی هیتلەر چەندان گۆڕانکاری یەك لەدوای یەك لەسەرکردایەتی کرا، سەرتیپ (بالك) لەبەرپرسیاریەتی سەرکردایەتی کردنی پێکهاتەی سوپای (ج) لە زاس لادراو لەجێگەی ئەویشدا سەرکردەیەکی حزبی بەناوی (هیملەر) دانرا، کە بۆ ماوەیەکی کەم ئەندامێکی هێزەکانی بروسك ئاسا بوو، دواتریش مارشاڵ (بلاسکویتس) گەڕێنرایەوە بۆ سەرکردایەتی پێکهاتەی سوپای (ج)..هتد، بەدوای ئەویشدا چەندین گۆڕانکاری تریش کرا.

سیاسەت لەوکاتەدا نەیدەتوانی هیچ شتێك بەدەست بهێنێت، تەنها خۆ بەدەستەوەدان مابۆوە، لەباشوور و باشووری رۆژهەڵات هاوپەیمانان بەشێوەیەکی بەردەوام پاڵەپەستۆیان خستبووە سەر ئەڵمانیاو، هێزە ئاسمانیەکانیان بە بەردەوام هێرشی وێرانکاریان لەهەموو لایەکانەوە دەکردە سەر ئەڵمانیا ، چارەنووس لەو شوێنە دەرچووبوو کەبەزەیی پێیان بێتەوە، لەم کاتەدا لە زستانی (١٩٤٤-١٩٤٥) پاش ئەو هەموو گۆڕانکارییە بەردەوامە، بەرەی رۆژئاوای ئەڵمانیا کە لەژێر سەرکردایەتی(رۆنشتد) بوو بە سێ پێکهاتەی سوپا رێکخرا، لەلای ڕاست و باکوور سوپای (ج) بوو بەسەرکردایەتی (ستودنت)و دواتریش(بلاسکویتس).

لەناوەڕاستیش (بەرەی سەرەکی) سوپای (ب) بوو بەسەرکردایەتی مارشاڵ(مۆدل)، لەباشووریش سوپای (أ) بوو کە سەرکردایەتیەکەی جێگیر نەبوو، بەڵکو هەمیشە گۆڕانکاری تیا دەکرا، لەکانوونی دووەمی (١٩٤٥) بەرەی رۆژهەلاتی ئەڵمانیا پێویستی بە فریاگوزاری خێرا بوو، بەلام لەکوێوە دەتوانرێت ئەو فریاگوزارییە دابین بکرێت؟ تەنها دەتوانرێت لەرۆژئاواوە دابین بکرێت. ئەنجامەکەشی گواستنەوەی سوپای (دیتریج)ی زرێپۆشی شەشەم بوو لە رۆژهەلاتەوە، لەگەڵ چەندان یەکەی تری سەربازی.

لەبەردەم هاوپەیمانەکاندا نەدەتوانرا بێهێزی بەرەی رۆژئاوای ئەڵمانیا بشاردرێتەوە، مارشاڵ (رۆنشتد) هەر لەکانونی دووەمی (١٩٤٥)ەوە رۆژانە پێشبینی کۆبوونەوەی هێزەکانی هاوپەیمانانانی دەکرد لەهەموو بەرەکانەوە، هەر لەهێرشەکانیان بەرەو (راین) و پاشان رووەو ئەڵمانیا، پێشبینی ئەوەشی دەکرد بەماوەیەکی کەمیش لەشکری بیست و یەکی بەریتانیاش بەسەرکردایەتی مارشاڵی بەتوانا (مۆنتکومری) بێتە نێو گۆڕەپانەکە.

بەپێچەوانەی ئەمەریکیەکان کە بەتوندوتیژی و زەبروزەنگی شەڕیاندەکرد، بەریتانیەکان ماوەیەکی درێژ پشوویان وەرگرت، مارشاڵ(رۆنشتد) لەوکاتەدا چاوەڕێی هێرشی بەریتانی لەهەردوو لای (فنلو) و (موز)ی دەکرد، هەروەها وای دەبینی کە هێرشی بەریتانیەکان پێش هێرشی ئەمەریکیەکان دەبێت بۆ رێگە گرتن لە هاوکاریەکانی ئەڵمانیا بۆباکوور.

لە٨ی شوباتی(١٩٤٥) وەکو چاوەڕوان دەکرا،بەریتانیەکان هێرشێکی گەورەیان کرد، کەنەدییەکان بەرەو(ریجس وولد)ی نزیکی (کلیفس) هاتن، شەڕێکی خوێناوی لەنێوان(موز) و (راین) روویدا، بەریتانیەکان شەڕیان کردو ململانێیەکی بەهێز لەهەردوو لایەنەوە هەبوو دوژمن توانی بە هێمنییەکی زۆرەوە دەست بەسەرخاکەکەدا بگرێت.

دوژمن پاش چەند ڕۆژێك مانەوە، توانی هێزی چەترداره ئازاکان بەرەو پشتەوەی (راین) و ( ویسل) و (ئایمرج ) بنێرێت، لەسەر لەشکری بیست و پێنجیش پێویست بوو پێکهاتە دوای پێکهاتەی هێز بەرەو لەشکری چەترداری یەکەم بنێرێت کەبەسەرکردایەتی ( جلم ) بوو ، تاکو هاوکاریان بکات .

هێرشی دووەمی بەریتانیەکان کە لە باشوورەوە کردیانە سەر ( فنلو) و مارشاڵ ( ڕۆنشتد ) یش زۆر ترسی لێی هەبوو، نەیتوانی ئامانجەکای خۆی بپێکێ. مارشاڵ (ڕۆنشتد) خۆی سەردانی ناوچەی شەڕی چەتردارەکانی کرد، هەر لەوێشدا لە فەیلەقی چل و حەوتی زرێپۆشەکان گرمەی شەڕی ناوچەی ( کوج) ی بەچاوی خۆی بینی، بەم شەڕەش هەرەشەکانی سەر بەرەی باشووری لەشکری چەتردارەکانی نێوان (موز) و (راین) بەردەوام زیاتر دەبوو، ئەگەر لەشکری ئەمەریکا لەباشوور بەشداری شەڕەکانی بکردبوایە، ئەوا وێستگەیەکی مەترسیدار دروست دەبوو.

لە ٢٣ شوباتی ١٩٤٥ هێرشی ئەمریکیەکان لەرێگەی (رۆر ) ەوە بەرەو (راین) دەستی پێکرد لەسەر هێڵی (کۆلۆن–دۆسلدرۆف)، لە٢٥ی شوباتی ١٩٤٥دا دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت و کۆنترۆلیان کرد، بەم شێوەش

بەریتانی و ئەمەریکیەکان دەیانتوانی بەچەند رۆژێك بگەنە (راین)، پاشان بۆ چەند کاتێك هێرشەکانیان رادەگرن بۆ بەسەربردنی کاتی پشوو و دابین کردنی پێداویستیەکانی پەڕینەوە، بەڵام کاتی هێرشەکە هەرگیز بۆ ماوەیەکی درێژ دواناکەوێت.

لەسەر کەناری (راین)ی رۆژهەڵات هیچ کارێکی پارێزگاری نەبوو، تەنانەت هیچ بەربەستێك نەبوو،

لەباکووری (مۆزل) شەڕێکی رێگری کاری گەورە روویدا لەنێوان هەردوو ناوچەی (رۆر) و (راین)، بەهێواشیەکی مەزنیش توانیان بەرەی ئەڵمانی بەرەو دواوە بکشێننەوە، کشانەوەکە زۆر هێواشتربوو وەکو ئەوەی لەفەرنسادا روویدا.

لە١٠ی مارس دا یەکەکانی ناوەڕاستی لەشکری چەتردارەکانی یەکەم لەبەرامبەر بەریتانیەکان دا پاشەکشەیان کرد رووەو (راین)ی نزیك (ویسل) بێ ئەوەی زیان بەچەك و تەقەمەنیەکانیان بگات.

هێرشەکان بەتایبەتی بەرەی ئەڵمانی کردبووە ئامانج لە (رۆر)ی نێوان(دیورین) و (یرکلنس)، پاشان (بۆن) و (کۆلۆن) و (دۆسل دورف)یان کردە ئامانج، و لەشکری چەترداەکانیان ناچارکرد کە بەئاراستەی (کریفیلد) پاشەکشێ بکەن.

بەرەی ئەڵمانی لە ١ی مارس دا لەباکووری(مۆزل) درێژدەبۆوە لەسەر هێڵی گشتی (تریر-برویم-سجیلدن-ئیرفت-مۆنجین-کلادباج-فنلو-کیلدیرن) بەرەو (ئامریج)ی پشت (راین) (ریمیکن) ناوچەیەکی بچوك بوو لەناوەڕاستی (راین)ی باشووری (بۆن) لەوێدا پردێکی هێڵی شەمەندەفەر هەبوو، کاتێکیش (هیتلەر) لەسەر بیرۆکەکەی خۆی سوربوو بۆدەست

گرتن بەوزەو تواناکانی خۆی، بۆیەش نیگەرانیەکی مەزنی هەبوو بۆ پاراستنی ئەوپردانەی کەلە(راین)دا هەبوون تا بەکاری بهێنێ بۆ رێگەگرتن لەدوژمن، ئەگەرهێزی ئاسمانی هاوپەیمانان وێرانی بکردبووایە، یان ئەگەر تانکەکانی بەریتانی و ئەمەریکیەکان توانیان کۆنترۆلی بەرەی ئەڵمانی بکەن ئەوا بەئاسانی دەست بەسەر پردەکانی (راین) دادەگیرا، ئەوکاتە پاشماوەی بەرەی ئەڵمانی ناتوانن لەرێگای (راین)ەوە بەرەو دواوە پاشەکشێ بکەن.

بێگومان لەهەر دەروازەیەك پارێزگارییەکی بچوك هەبوو کەخۆی لەچەند سەرە پردێکی بچوك دەبینیەوە، هەرپردێکیش بەرپرسیارێکی خۆی هەبوو کەچاودێری دەکرد، بەڵام ئەگەر تانك و زرێپۆشەکان هێرش بکەن و فڕۆکەکانیش لەئاسمانەوە تۆپ باران بکەن، ئەوا بەرپرسیاری پردەکە ناتوانێت هیچ بکات، بۆیەش گرفتی سەرەکی پاراستنی ئەو پردانە لەبڕیارێکدا کۆدەبۆوە: چ کاتێك پێویستە ئەوپردانە بتەقێنرێنەوە.

هیچ کەسێك نەیدەوێرا بیرۆکەی تەقاندنەوەی پردێك بۆ بەرپرسی پردەکە پێشنیاربکات و پێی بڵێت پردەکە بتەقێنەرەوە پێش ئەوەی دوژمن دەستی بەسەردا بگرێت. بۆ ئەوەی دوژمن سودی لێ وەرنەگرێت، بەرپرسی پردەکە چۆن دەتوانێت مەزەندەی بارودۆخی گشتی بکات؟ ئەگەر تانکەکان هێرشیان کرد، ئەوا بێگومان دەبێت پردەکە خاپور بکات، ئەگەر خاپوری نەکات، دوژمن دەستی بەسەردا دەگرێت.

هەرئەوەش بوو کە رووداوی پردی هێڵی شەمەندەفەری (ریمیکن)ی دروستکرد لە ٦ و ٧ ی مارسی ساڵی ١٩٤٥، کە تاکو ئێستاش بڕیاری خاپورنەکردنی ئەوپردە بەنادیاری ماوەتەوە، بۆیەش یەکەی زرێپۆشی

ئەمەریکیەکان داگیریان کردو دوژمنیش توانی (راین) داگیربکات، لەوانەیە تەقەمەنیەکانی کە بۆ ئەم پردە تەرخانکرابوو نەتەقیونەتەوە، یان چەند یەکەیەکی ئەڵمانی ئەو پردەیان بۆ پاشەکشێ کردن بەکارهێنابێ، بەهەرحاڵ ئەوپردە بەئاسانی کەوتە دەست ئەمەریکیەکان، هەواڵی دەست بەسەرداگرتنی پردەکە بۆ هیتلەر زۆر گران بوو، بۆیەش یەکسەر داد گایەکی سەربازی دروست کرد بۆ سزادانی ئەوانەی کە کەمتەرخەم بوون لەم گۆڕەپانەدا. لەو کاتەدا پروپاگەندەی زۆر هەبوو کە دەست بەسەرداگرتنی پردەکە کاری تێکدەران بووبێت، بەڵام تاکە راستی کە گومانی تێدانەبوو، ئەوەبوو کە ئەو پردە بە تەواوەتی کەوتە دەست ئەمەریکیەکان. لە باشووریش تا (مۆزل) بەرەی ئەڵمانی لێکترازا، ئەمەش بە هۆی فەرمانی هیتلەر بوو کە دەیگوت: بە هەمیشەیی خۆڕاگربن و نەرم و نیان و چاوپۆش مەبن. هەر لەسەر نمونەی ئەم قسانەش لەشکری تۆپهاوێژی حەوتەم لە (دیواری رۆژئاوا) ی نێوان رۆژهەڵاتی (برۆم) و (ترير) خۆڕاگر بوون، بەڵام بەرەی لەشکری پازدەهەم لە باکوور بەرەو رۆژهەڵاتی (راین) پاشەکشەیان کرد، چەندان هەڵوێستی سەیر روویانداو لە سەر نەخشەش وێنەی سەرسوڕهێنەر بەدیار کەوت. مارشاڵ (رۆنشتد) خۆی ئەو هەڵوێستانەی بە (هیتلەر) راگەیاند، بەڵام هیتلەر و راوێژکارەکانی ئەم هەڵوێستانەیان بە هیوابڕاوی لەقەڵەم دا. بەرەی ئەڵمانی لە ١٠ ی مارسی ١٩٤٥ بە شێوەیەکی نزیك کراوەیی لەسەر هێڵ دا، بەم شێوەیە درێژ دەبۆوە:.لە ناو رێژگەی (راین ) بەرەو رۆژهەڵات بە (ئایمرج– ویسل – دۆسل دورف – کۆلۆن – ریمیکن – بۆن – کوبلنز )دا تێدەپەڕی بۆ کەناری رۆژهەڵات، هەروەها لە (کولبرنج) درێژدەبووەوە بۆ باشووری رۆژهەڵات و لەسەر سنوری (مۆزل) تا (ترير) و لە سەر سنوری

کەناری ڕۆژهەڵات بە ( ئیستراز بورك ) تێپەڕدەبێت بۆ باشوور تاسەر سنوری سویسرا. هێڵی گشتی پێشاندەری ئەو خەباتە بەرزەن کەیەکە پەرتەوازە ئەڵمانیەکان تا ڕۆژە بێ هیواکانی مارسی ١٩٤٥ بەجێیانهێنا. هاوپەیمانەکان سەرکەوتوو نەبوون لە هەنگاوە خێراکانیان بەرەو (راین) و نەیانتوانی ڕێگەی ئەم روبارە ببرن، تەنها بە شەڕێکی سەخت وگران نەبێت. من باسی باری بەرەی ئەڵمانیم کرد لە ڕۆژی ١٠ ی مارس، چونکە لەو ڕۆژەدا بڕیاردرا کە مارشاڵ (ڕۆنشتد) بۆ دواجار خانەنشین بکرێت. لە ٩ ی مارس دا پروپاگەندەیەك بڵاوبۆوە کە مارشاڵ (ڕۆنشتد) خانەنشین دەکرێت و مارشاڵی هێزە ئاسمانیەکان (کیسرلنك) جێگەی دەگرێتەوە. هیتلەر بارەگایەکەی خۆی بۆ نزیك بارەگاکانی سەرکردایەتی ڕۆژئاوا گواستەوە، کاتێك (ئاردین) ڕووبەڕووی هێرش بووەوە، بەم جۆرە یەکەم پەیوەندی باوەڕپێکراو لە نێوان هیتلەر و (ڕۆنشتد) دروست بوو، هیتلەر دەیتوانی لەوکاتەدا دڵنیا بێت لەوەی کە ئایا ڕۆنشتد دەتوانێت بە دروستی بڕیار لەسەر هەڵوێستەکان بدات، ڕۆنشتد بە شێوەیەکی بێ باکانە هەڵوێستە ڕەخنە ئامێزەکانی بۆ هیتلەر دەدرکاند، بۆیەش پەیوەندیەکی باش لە نێوانیان دروست بوو، لەوکاتەدا جیاوازییەکی بنچینەیی لە نێوان بارەگای هێزە چەترداره ئەڵمانیەکان و سەرکردایەتی ڕۆژ ئاوا دروست بوو.

بەرهێرش کەوتنی رووسیای مەزن مەترسی دروست کرد، لەسەر سەرکردایەتی ڕۆژئاوا پێویست بوو کە یەکەو ئامێرە تۆپهاوێژەکانی بۆ بەرەی ڕۆژهەڵات بنێرێت، ئەنجامی ئەمەش ئەوەش بوو کە ڕۆنشتد داوای کرد گشت هێزەکان لە ڕۆژئاوا بۆ هێڵێکی بچووکتر پاشەکشە بکەن و وازیش لە هۆڵەندا بهێنن. ڕۆنشتد لە نامەیەکدا بۆ خودی هیتلەر داوای

لێکردبوو سەربەستی بکات لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شەڕ. سەرەتا هیچ وەڵامێکی نەدرایەوە، هەروەها ئەوەشمان لەبیرە کە پێشتر فەرمان بە ڕۆنشتد کرابوو هەموو شتەکان وەك خۆی لێ بگەڕێت و بەرگرییەکی توندیش لەگشت بستێکی خاکەکەیان بکات.

لە کۆتایی مانگی شوباتدا دڵەڕاوکێ زیادی کرد، ئەمەش کاتێك روویدا کە ڕۆنشتد لە ڕاپۆرتێکدا کە بۆ سەرکردایەتی گشتی سوپای ئەڵمانیای ناردو، تیایدا بە سوکی باسی دیواری ڕۆژئاوای کردبوو و، بە "تەڵەی مشك"ی وەسف کردبوو.

ئەو ڕاپۆرتە توندەی ڕۆنشتد دەربارەی دیواری ڕۆژئاوا هیتلەری تووڕەو پەرێشان کردو، ئەو وەسفەی ڕۆنشتدی بە ئیهانەو سوکی دانا، هەروەها هیتلەر لەمبارەیەوە گوتی:" دوژمن بەرامبەر ئەو بەربەست و قەڵابەندیانە دەلەرزێت". هاوکات لەگەڵ بوونی ئەو دڵەڕاوکێیانە، لە ٦ی مارت ویستفالی سەرۆکی دەستەی روکنی ڕۆنشتد ڕاپۆرتێکی سەبارەت بە بارودۆخ بۆ هیتلەر لە بەرلین نارد، تیایدا وەکو ڕۆنشتدی سەرکردە گشتیەکەی باسی بارودۆخەکەی کردبوو، ئەمەش بووە هۆی زیاتر تووڕەبوونی هیتلەر.

هیتلەر باش دەیزانی کە ڕۆنشتد کەسایەتیەکی ناسراوە لە دەرەوەی سنووری ئەڵمانیا، ئەمەش نهێنی نەبوو کە ئەو سەربازە لە دەروەی ئەڵمانیا لەلایەن زۆر کەسەوە جێی ڕێزو تەقدیرە، هەروەها دەمێکیشە ئەوەش روون و ئاشکرایە کە ڕۆنشتد لەلایەن دەستەی روکن و هێزەکانیشی جێگای ڕێزو خۆشەویستیە. بۆیە رەنگە هیتلەر لەو

بارودۆخە دژوارەدا لەوە بترسایە، کە رۆنشتد دەست بەسەر دەسەلات دابگرێت و سنوورێك بۆ ئەو هەموو کارانە دابنێت.

لە نیوەی دووەمی مانگی شوباتی ١٩٤٥ ئێزگەکانی هاوپەیمانان دیعایەکیان بلاو کردەوەو تیایدا رایانگەیاند بوو: " هاوپەیمانان بە خۆبەدەستەوەدانی ئەلمانیا رازی نابن، تەنها لەلایەن یەك کەسەوە نەبێت، کە ئەویش مارشاڵ رۆنشتدە". هەرچۆنێك بێت کەس باوەڕی بەم دیعایەیە نەکرد، بەلام هیتلەر گوێبیستی ئەم هەواڵە بوو، کاتێکیش رۆنشتد خۆی گوێی لەم دیعایەی هاوپەیمانان بوو، بە سەرۆکی دەستەی روکنەکەی گوت: تازە پلەو پایەکەم درێژەی نابێ!!.

ئەوەی رۆنشتد بناسێت بە تەواوی دەزانێت کە ئەو هەرگیز خیانەت لە سوێندەکەی ناکات، لەبەر ئەوەی رۆنشتد سوێندی خواردبوو کە وەلای بۆ هیتلەر هەبێت، بۆیە خیانەتی لێ نەدەکرد. بەلام دیکتاتۆر بە سروشتی خۆی متمانەی بە کەس نەدەکرد، بە تایبەتیش لەو کات و ساتە دژوارانەی ساڵی ١٩٤٥.

رۆنشتد دوای چەند رۆژێك لە بلاوکردنەوەی دیعایەکە بانگکرایەوە بۆ بەرلین، لە رۆژی ٨ی مارت مارشاڵ کایتل پێی راگەیاند کە هیتلەر بیر لە گۆڕانکاری کردن لە سەرکردایەتی رۆژئاوا دەکاتەوە، لە ٩ی مارتیش پەیوەندیەکی تەلەفۆنی دیکە کراو راگەیەنرا کە مارشاڵ کیسرلنگ سەرکردایەتی رۆژئاوا وەردەگرێت. لە ١٠ی مارت رۆنشتد خواحافیزی و ماڵئاوایی لە دەستەی روکنەکەی سەربازەکانی کرد، کە بە یەك ریز وەستابوون بۆ ماڵئاوایی لێکردنی، کە رۆنشتد سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، گشتیان هەستیان کرد: تازە هەموو شتێك تەواو بوو.."

هیتلەر فەرمانی بە رۆنشتد دا لە لایەکی بەرلین بیبینێت، گفتوگۆکەیان درێژەی نەکێشا، بەڵام بە رێزو ئیحتیرامەوە بوو، تیایدا هیتلەر سوپاسی رۆنشتدی کرد سەبارەت بە خزمەتەکانی، هەروەها میدالیای شمشێری سوارەی پێ بەخشی، هەروەها پێشی گوت کە ئەو ناچار بوو هێرشی ئەردین بکات، هەرچەندە خۆشی بێ ئومێد بوو لە سەرکەوتنی...

بۆ دواجار ئەو دوو پیاوە کە لە راستیدا هیچ رق و بوغزێکیان لە نێوان نەبوو لە یەکتر جیابوونەوە، دواتر رۆنشتد چووە بادتویلز لە باڤاریا و، لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی ئەڵمانیا خۆی بەدەستەوە داو، ئەویش بە دیل گیرا. بەڵام بەرخودانی هێزەکان بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو، هەروەها زۆر پێکهاتەش خۆی بەدەستەوە نەدا تاکو ٩ی مایسی ١٩٤٥، ئەم بەیەکدادانەی چەند هەفتەی دوایی ناتوانرێت بە شەڕ ناوی ببرێ، هەروەها هیچ سەرکردەیەکی ئەڵمانی بە مانای راست لەوێ نەمابووەوە، لەگەڵ ئەوەش هێزەکانی ئەڵمانی تا کۆتایی فەرمی شەڕ هەر بەردەوام بوون لە شەڕکردن.

**پڕ به دڵ سوپاسی مامۆستا خالید مەلا فائیز دەکەین کە دەقی عەرەبی ئەو کتێبەی پێ بەخشین.**

چاپخانەی ڕۆژ هەڵات